# ڕۆژنامەی ژیان

## ژمارە ٨-٢٥٩

سال ۲ ژمارە ۸۲

ژیان

دووەم بەرگ

ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح

لێکۆڵینەوەی: سدیق ساڵح

# ڕۆژنامەی ژیان

ژمارە ( ٨٢-٢٥٩ )

دووەم بەرگ

ئامادەکردنی

**ڕەفیق ساڵح**

لێکۆڵینەوەی

**سدیق ساڵح**

ناوی کتێب : ڕۆژنامەی ژیان (ژ٨٢-٢٥٩)
ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح
لێکۆڵینەوەی: سدیق ساڵح
بابەت: ڕۆژنامەوانی
چاپ: ئۆفسێتی (شڤان)
بەرگسازی : قادر میرخان
یەکەم چاپ/ دووەم بەرگ- ٢٠٠٣
تیراژ: (٦٠٠)
ژمارەی سپاردن: ( ٣٤٠ )ی وەزارەتی ڕۆشنبیریی ساڵی 2003 ی پێدراوە

سەرپەرشتی پرۆژەیچاپکردنی زنجیرە کتێبی شارەوانیی سلێمانی: پێشڕەو ئەحمەد

# پێشـــەکـی

وەك لە یەکەم بەرگی ئەم پرۆژەیەدا ئاماژەمان پێ داوە، لەچاپدانەوەی سەرجەمی ژمارەکانی ڕۆژنامەی "ژیان" کارێکی هەم گرنگ‌و، هەم پڕ کێشەو سەرئێشەو ناڕەحەتییە؛ بەڵام کە بیر ئەکەینەوە لە ئەنجامدا کەرەستەیەکی زانستی ئەخەینە بەردەستی ڕۆژنامەوان‌و مێژوونووس‌و زمانەوان‌و ئەدیب‌و لێکۆڵەرەوەی کورد بۆ ئیش لەسەرکردن‌و سوودلێوەرگرتن‌و، یادگارێکی ئەوپەڕی گرانبەهای وەچەی پێشووی ڕۆشنبیرانمان زیندووئەکەینەوەو لە فەوتانی هەتاهەتایی ڕزگاری ئەکەین‌و بە نەوەی نوێی ئەناسێنین، زیاتر بەعەشقەوە مشووری ئەخۆین‌و هەوڵی بە باشترین ڕواڵەت دەرهێنانی ئەدەین.

پێویستی ئەبینین خوێندەواری کورد لەو ڕاستییە ئاگادار بکەینەوە کە ئەو برگەو دێڕو وشەو بەشانەی ئێرەو ئەوێی هەندێ لە ژمارەکانی ئەم بەرگە کەوا بە کاڵی‌و ناشیرین یا سپێتی‌و سڕاوەیی دەرچوون‌و ناخوێنرێنەوە، گوناح‌و کەمتەرخەمیی ئێمەی تێدا نییەو، دوای هەوڵ‌و کۆششێکی بەردەوام هەر ئەوەندەمان بۆ چارەسەر کراوە. ئەو گرفتە لە دەسەڵاتی ئێمە بەدەر بوو، چونکە سەرباری ئەوەی کە هەر پەیداکردنی ژمارەکانی ڕۆژنامەکە خۆی کارێکی زەحمەت‌و گرانە، دانەی تەواو و پاکی زۆر بەزەحمەتتر چنگ ئەکەوێ. خاوێن‌و تۆخ‌و سپی کردنەوەیشیان، بەشێوەیەك کە بە ڕەنگ‌و ڕوویەکی تازەوە بخرێنەوە بەرچاو، بەبێ زیادەڕەوی، کات‌و ماندوویی‌و پشوویەکی درێژیان پێ ئەوێ. لەکاتێکدا چاپخانەکەی شارەوانیی سلێمانی خۆیشی کە ڕۆژنامەکەی پێ لەچاپ دراوە، بەهۆی زۆر جێگۆڕکێ‌پێکردن‌و کەم خزمەتی‌و فرەئەرکییەوە، شەکەت‌و ماندوو بووەو، حەرفەکانیشی کەم‌وزۆر ناقۆڵا و سواو و دابڕدابڕ بوون‌و نووسینەکانیان بەتەواوی‌و ڕێك‌وپێك دەرنەهێناوە.

ناشوکری نەبێ، هەلومەرجی سەختی ساڵەهای ساڵی داگیرکراوی‌ی وڵات‌و ژێردەستی‌ی میللەتەکەمان لەلایەکەوەو، بێ‌دەربەستی‌و کەم ئاگایی‌ی ڕۆشنبیری کوردیش بەگشتی کە هەر لەزووەوە خۆی خەریکی کاری جیددی نەکردووەو لە ئاستی کەلەپووری شارستانیماندا زۆر خەم ساردیی نواندووە لەلایەکی ترەوە، جگە لە نەبوونی ناوەندو بنکەیەکی وا لە کوردستان بۆ کۆکردنەوەو پاراستنی سامانی پەرش‌وبڵاوی ڕابردوومان؛ ئەمانە تێکڕا کارێکیان کردووە ئەو کەمە ناتەواوی‌و کەلێنە وەکوو خۆیان بمێننەوە.

بایەخی مێژوویی‌ی ئەم دووەم بەرگەی "ژیان"، بە بۆچوونی ئێمە، لەوەدایە کە ئۆرگانی دان پێدانراوی سەران‌و مونەووەران بووە لە کوردستانی جنووبیدا بۆ نواندن‌و جەختکردنەوەو بەدیهێنانی داواکاریە ڕەواکانی میللەتەکەمان لە چوارچێوەی خەباتێکی نوێی شارستانانەدا؛ دوا قۆناغی ڕۆژنامەوانی‌ی ئاشکراو سیاسی‌ی کوردیشە لە عیراقدا، چونکە حکوومەتی پاشایەتی کە لکاندنی ئەم بەشەی کوردستانی بەعیراقەوە بەیەکجاری بۆ مسۆگەر بوو، ئامادە نەبوو لانی کەمی ئەو مافانە بسەلمێنێ‌و، ئەو سەرهەڵدانە ئاشتیانەیەی خەڵکی کوردی بە شێوەیەکی نادیموکراتیانەو ناشارستانانە بە زەبری هێزی عەسکەری سەرکوت کرد. ئیتر لەدوای ڕاپەڕینی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ی بەردەرکی سەرای سلێمانی‌یەوە، دەورانێکی تازە لە ڕۆژنامەوانییەکی ناسیاسی‌ی گشتی دەستی پێ‌کردو، درێژایی‌ی حوکمی پاشایەتیی گرتەوە. بەوپێیە، ڕۆژنامەوانی‌ی کوردی کەوتە بەر سانسۆری توندی حکوومەت‌و، ئەو چەردە ئازادییەی پێشووی لێ سەنرایەوە. لەوڕووەوەیە کە ئەم قۆناغەی "ژیان" لاپەڕەیەکی هەرە ڕۆشنی مێژووی ڕۆژنامەوانی‌ی کوردییەو، ئەشێ بەگشتی بە ڕۆژنامەوانییەکی سەربەخۆی دەربڕی ئاواتەکانی ئەودەمەی خەڵکی کوردی دابنێین.

وا به هیممەتی بەندەو کاك سدیقی برامو، هاوکاریی دڵسۆزانەی برای ئازیزمان کاکە عەبدوڵڵا زەنگەنە کە کۆپیی دوو بەرگی هەووەڵی "ژیان"ی لە هەولێرەوە بۆ هێناینو، شەونخوونیو کاری بەردەوامی "ئەڤین"ی کچم کە هەموو ڕۆژنامەکەی سکانو پاك کردەوەو، کاك دانا فایەقو خاتوو ئەمیرە عەزیز کە ژمارەبەندییەکەیان ڕێك خستو تەواو کردو، سەلیقەی کاك هۆشمەند سالح کە کاتی لەچاپدان پێیاندا چووەوەو هێندەی کرا ناتەواویەکانی نەهێشتو، دڵسۆزیی کاك ڕێبوار فەرەجو کارمەندنی چاپخانەی "شڤان"، خۆشبەختانە ئەم دووەم بەرگە بەرهەم هات. هیوامانە جێی شیاوی خۆی لە کتێبخانەی کوردیدا بگرێ.

لێرەوە بە پێویستی ئەزانین سوپاسی ئەو خوشكو برا خۆشەویستانە بکەین کە هەمیشە هاندەرمانو دەستخۆشیمان لێ ئەکەنو بەویژدانەوە کارەکەمان ئەنرخێنن؛ بۆ مێژوو بە ڕەوای لەقەڵەم ئەدەین ناوی دوان لەو زاتانە بهێنین کە خەمخۆرانە بەدەنگمانەوە دێنو پێویستیەکانی ئەم پرۆژە گەورەیەمان بۆ دابین ئەکەنو لە هەوڵی گەشەپێدانو سەرخستنیدان، ئەوانیش بەڕێزان کاك نەوشیروان مستەفا ئەمینو دکتۆر کەمال فوئادن. لاڵکردنەوەو بەدواداچوونی بەردەوامیان، شوێنی ئەوپەڕی پێزانینو سوپاسی ئێمەو، مایەی درێژەپێدانی مەبەستەکەمانە.

دواجار سوپاسی سەرۆکایەتیی شارەوانیی سلێمانیو دەست پێشخەریی کاك پێشڕەو ئەحمەدی سەرنووسەری ڕۆژنامەی "سلێمانیی نوێ" ئەکەین کە لەچاپدانی ئەم دووەم بەرگەی گەورەیەی "ژیان"ی بڵاوکراوەی زووی شارەوانییان، وەك ئەرکێکی خۆیان، گرتە ئەستۆ.

ڕەفیق ساڵح

٢٠٠٣/١١/١١

# ژیان

(ژ ٨٢-٢٥٩)

سدیق ساڵح

## ١. ناساندنی گشتی:

### ١. ١. بەڕێوەبەرو دەستەی چاپخانە:

عەلی عیرفان، لە (تەشەکوراتو ڕجا)یەکی (ژ٨٢، ل٢)دا، نووسیویە: ((چونکە جەنابی ئەدیب ئەفەندیی مودیری مەطبەعەی ژیان تەعیین کراوە بە کاتبی مالییەی سلێمانی، لە بەر مەشغولییەت، ئیستیعفای کرد. لەسەر تەنسیب و ئەمری موتەصەڕیفی مەعالی هیمەم بەندە بۆ ئیفاکردنی ئەم وەظیفەیە تەنسیبو تەعیین فەرمووراوم. چونکە مەطبەعە واسیطەی تەرەقیی وەطەنەو غەزەتەیش زبانی حیسییاتو تەرجومانی ئامالی میللەتە مەعەل ئیفتیخار ئەم وەظیفەیەم قوبووڵو دەرعوهدە کرد. بۆ خاطری غەزەتەکەمان ڕۆژ بە ڕۆژ تەرەقییەك پێنیشان بداو بۆ ساحەی مەدەنییەت هەنگاو بهاوێ، ئیستیرحام لە هەموو مونەووەرانو ئەدیبان ئەکەم لە ناردنی مەقالەو شیعر غەزەتەکەمان بێبەش نەهێڵنەوە)).

واتە عەلی عیرفان لەو ژمارەیەوە کراوە بە بەڕێوەبەری چاپخانە، کە بەرپرسی ئیدارەخانەو نووسینی ڕۆژنامەی "ژیان"یش بووە. بەوەدا کە تا (ژ٢٥٩) کەسێکی تر بە ڕەسمی ئەو وەزیفەیەی نەدراوەتێ، بەقسەی کاك صەلاحی عەلی عیرفان، باوکی تا شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانی (١٩٣٠/٩/٦) لێپرسراوی "ژیان" بووەو، لەسەر هەڵویستی کوردانەی ڕۆژنامەکە دژی حکوومەت گیراوەو، ئەو ماوەیەیش چەند جارێك ناوی ئەو زاتەی وەك مودیری مەطبەعە تێدا هێنراوە:

١- م. نووری، بە موناسەبەتی تەعیینی عەلی عیرفان ئەفەندییەوە بۆ مەطبەعەی ژیان، ژ٨٥، ل١-٢.

٢- مودیری مەطبەعە عەلی عیرفان ئەفەندی ڕۆژی ٢٨/٧/١٥ بۆ کڕینی حرووفاتو بەعضێ ئالاتو ئەدەواتی مەطبەعە چوو بۆ بەغداد (ژ١٢٢، ل٣).

٣- ناوی لە سێهەم بەشی (لیستەی ئەسامیی ئەو ذاتانە کە بۆ تەخلیدی ذیکرای فەقیدی جەننەتمەکان سێر عەبدولموحسین بەگ ئیعانەیان داوە) دا، وەك مودیری مەطبەعە هاتووەو ٣ ڕووپیەی داوە (ژ٢٣٣، ل٥).

٤- "ژیان" لە (ژ٢٦٠) یەوە، بە ناوەڕۆك، سەرلەبەر بەتەواوی گۆڕاوەو، هیچ سیماو شەقڵێکی پێشتری پێوە نەماوە.

بەوپێیە، بێچەندوچۆن، عەلی عیرفان مودیری مەطبەعەی ژمارەکانی (٨٢-٢٥٩)ی "ژیان" بووە. هەرچی کارمەندانی چاپخانەکەیشە، هەر دوانیان ناسراونەتەوە:

١- شێخ طەیب: کوڕی شێخ عارفی شێخ ئەحمەد فائیزی بەرزنجییە؛ ساڵی ١٩٠٤ لەدایك بووەو، ١٩٧٥/٨/٢٠ کۆچی دوایی کردووە. لە ساڵی ١٩٢٠ـەوە، لە هەووەڵین کارمەندەکانی ئەو چاپخانەیەی سلێمانی بووەو، کەموزۆر تا سەرەتای ساڵانی سی لەسەر ئەو ئیشە ماوەتەوە[1]. سێ جار لە ژمارەکانی (٩٧، ل٣؛ ٩٩، ل٢؛ ١٨١: ل٤)دا وەك (مووەظەفی مەطبەعە)و، لە ژمارە (٢٣٣، ل٥)دا وەك (ماکینیست) ناوی هاتووە. واتە ئیش پێکەری ماکینەی چاپ (ماکینەچی) بووە.

٢- محەمەد ذهنی: جارێك لە ژمارە (٢٣٣، ل٥)دا وەك (مورەتتیب)ی چاپخانەو، جارێکی تر لە ژمارە (٢٤٤، ل٣)دا وەك مامۆستایەکی خۆبەخش بۆ دەرس وتنەوە لە قوتابخانەی زانستی، ناوی هەیە. واتە پیت ڕێکخەر

---

[1] ڕەفیق ساڵح، ڕۆژنامەکانی سەردەمی حوکمی شێخ مەحموود، لەسەرنووسینی سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٢١.

بووه. ناوبراو، ئەوەندەی بۆم ساخ بووبێتەوە، لە ڕۆژنامەی "ئومێدی ئیستیقلال" (١٩٢٣-١٩٢٤)ـەوە، کارمەندی چاپخانەکە بووە[٢].

جێی وتنە، دەزگای چاپی ڕۆژنامەکە لە (ژ٨٢-٩٤) بە چاپخانەو، لە (ژ٩٥-٢٤٠) بە مەطبەعەو، لە (ژ٢٤١-٢٥٩) لە مەتبەعەی بەلەدییەی سلێمانی ناوی براوە.

١. ٢. **شێوە:**

"ژیان"، ئەم دووەم دەورەیە، هەمان شێوەی پێشتری هەبوە. ناوو سەرلەوحەو کلێشەی یەکەم لاپەڕە، لە (ژ١٢) بەدواوەو، بەدرێژایی ئەم دەورەیە نەگۆڕاون. ئەوە نەبێ کە ڕۆژو مانگو ساڵی دەرچوونی هەر ژمارەیەك، لە (ژ١٣٣)ی ١ی تشرینی دووەمی ١٩٢٨ـەوە، لە بریی دەستەچەپ، خراوەتە بەشی دەستەڕاستی شریتی باریکی خوار سەرلەوحەکەو، (تأریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦)یش لەلای چەپی دانراوە. ناونیشانەکەی، کە لە (ژ٦٣)ی ٢٨ی نیسانی ١٩٢٧ـەوە، تا (ژ١٣٣) ((هەموو شتێك ئەنووسێ هەفتەی جارێك دەردەچێ غەزەتەیەك کوردی‌یە)) بووە، لە (ژ١٣٤)ی ٥ی تشرینی دووەمی ١٩٢٨ـەوە کراوە بە (( هەمووشتێك ئەنووسێ هەفتەی دوو جار دەردەچێ غەزەتەیەکی کوردی‌یە))و، تا (ژ٢٥٩) ئاوا هێڵراوەتەوە. هەر لاپەڕەیەکیشی، وەکوو پێشوو، بەردەوام بە دوو ستوونو بە پێوانەی (٢١,٥×٣٤سم) بووە.

١. ٣. **دەرچوون:**

هەووەڵ ژمارەی ئەم دەورە (٨٢) ١٩٩٩/٩/٢٠و ١٢ ڕۆژ دوای (ژ٨١)و، دوا ژمارەیشی (٢٥٩) ١٩٣٠/٩/٤ دەرچووە. هەر ژمارەیەکی "ژیان" لەم ماوەیەدا، بەگشتی، چوار لاپەڕە بووە؛ پێنج ژمارەی نەبێ کە لەبەر مەسەلەی تایبەتی ڕۆژ لاپەڕەکانیان بۆ ڕاپۆرتە هەواڵ زیاد کراوە:

ژ١١٥: ٦ل لەسەر مەبعووسە کوردەکانی نووسیوە.

ژ١٢٦: ٦ل تەرخان بووە بۆ کردنەوەی بینای تازەی سەرای سلێمانی.

ژ١٧١: ٦ل بۆ ڕێورەسمی بەڕێکردنی کاپتن "لاین"ی موفەتیشی ئیداری کە وەزیفەکەی لە سلێمانی تەواو بووە، دانراوە.

ژ٢٣٣: ٦ل تەمسیلو ئاهەنگی مەکتەبی کچانی سلێمانیی تێدا وردکراوەتەوە.

ژ٢٥٧: ١٠ل هاتنە سلێمانیی وەکیلی مەندووبی سامی‌ی بریتانیا و وەکیلی سەروەزیری عیراق و درێژەی گفتوگۆیانی لەگەڵ گەورەپیاوانی کورددا تێدا تۆمارکراوە.

لە کاتێکدا (٨١) ژمارەکەی هەووەڵ ڕێك لە ڕۆژانی پێنجشەممەدا دەرچوون، کەچی لەوەبەدوا وادەکانیان گۆڕاوە. ژمارەکانی (٨٢-١٣٣) پێبەپێ حەفتانە جارێك لەو ڕۆژانەدا دەرچوون: ٨٢-٩٩ سێشەممە، ١٠٠-١٢٣ پێنجشەممە، ١٢٤-١٢٥ یەکشەممە، ١٢٦-١٣٣ پێنجشەممە. لەوانە، (ژ٩٥) دوای دوو حەفتە دەرچووە، چونکە-وەك وتراوە-((بەواسیطەی بەعضی ئیشوکاری فەوقەلعادەی حکوومەتەوە مەطبەعەکەمان گیرابوو، نەمانتوانی غەزەتەکەمان دەربێنین))[٣]. ژمارەکانی (١٠٨، ١١٦) بەرودوا، لەبەر ڕێکەوتی جەژنەکانی ڕەمەزانو قوربان، خراونەتە حەفتەی دوایی[٤]. (ژ١٣٢)یش، لەبەر نەخۆشی‌ی کارمەندێکی چاپخانە، هەر لەوەبەتر دوو حەفتەی پێچووە[٥]. هۆی گۆڕینەکانی ترمان لێڕوون نییە.

---

[٢] هەمان سەرچاوە، ل٧-٨.

[٣] اعتذار، "ژیان"، ژ٩٥، ل٢.

[٤] اعتذار، "ژیان"، ژ١٠٧، ل٤و، ژ١١٥، ل٤.

[٥] اعتذار، "ژیان"، ژ١٣٢، ل٤.

ڕۆژنامەکە بڕیاردراوە لە ١ی تشرینی دووەمی ١٩٢٨ـەوە حەفتەی دووجار، دووشـەموان‌و پێنجشـەموان، بڵاوببێتەوە[٦]. ئەوکارە لەوڕۆژگارەدا ڕووداوێکی ڕۆشنبیریی گرنگ‌و هەنگاوێکی هۆشیارانەو ئازایانە بووە بەرەو چەسپاندنی نەریتی ڕۆژنامەوانی‌و دابینکردنی کەناڵێکی بەردەوامی زانیاری‌و هەواڵ بۆ خوێنـدەواری کورد. بۆیە ئەگەر پشتیوانی‌ی زیاتری حکوومەت‌و کڕیارانی ڕۆژنامەکەی هەبوایە، هیچ دوورنییە حەفتانە لە دوو جار زیاتر دەربچوایە. بەڵام هەر ژمارەکانی: ١٣٤-١٤٣، ١٤٦-١٤٧، ١٥١-١٥٢، ١٥٦-١٥٧، ١٦٣-١٧٠، ١٧٢-١٧٥، ١٧٧-١٧٨، ١٨٢-١٨٥، ١٨٧-١٨٨، ١٩٢-١٩٣، ١٩٥-١٩٦، ١٩٨-١٩٩، ٢٠٢-٢٠٥، ٢٠٧-٢٠٨، ٢١٢-٢١٣، ٢١٧-٢١٨، ٢٢١-٢٢٢، ٢٢٨-٢٢٩، ٢٣٩-٢٤٠، ٢٤٢-٢٤٣، ٢٤٥-٢٤٦، ٢٤٩-٢٥٢، ٢٥٤-٢٥٥، حەفتەی دووجار دەرچوون. ئەوانی‌تر، ژمارەکانی: ١٤٤-١٤٥، ١٤٨، ١٥٣-١٥٤، ١٥٧-١٥٩، ١٧١، ١٧٦، ١٧٩-١٨٠، ١٩٧، ٢٠٠، ٢٠٩، ٢١٤-٢١٥، ٢١٩، ٢٢٣-٢٢٤، ٢٣٣-٢٣٦، ٢٤١، ٢٤٤، ٢٤٧، ٢٥٦-٢٥٩ پێنجشەموان‌و، هی ١٤٩-١٥٠، ١٥٥-١٥٦، ١٦٠، ١٨١، ١٨٦، ١٨٩-١٩١، ١٩٤، ٢٠١، ٢١٦، ٢٢٠، ٢٢٥-٢٢٧، ٢٣٠، ٢٤٨، ٢٥١ دووشەموان یەك جار دەرچوون.

واتە ئەو ماوەی (٨٨) حەفتەیەی نێوان (١ی تشرینی دووەمی ١٩٢٨-٣١ ئابی ١٩٣٠) کە ئەبوو حەفتەی دوو کەڕەت دەربچێ، تـەنیا لـە (٣٤) حەفتـەیاندا دوو جـار لـە وادەی خۆیـاندا بڵاوبوونەتـەوە. پێـم وایـە، بێ‌داروباری‌و پڕکاری‌ی چاپخانەکەو، کێشەی دارایی کـە لـەو چـەندین تکـاو بانگـەوازە بڵاوکراوەیـەی داوای ناردنی ئابوونەدا ڕەنگی داوەتەوەو، تاڕادەیەکیش کەمی‌ی نووسەری بەشدار بە نووسین لە ڕۆژنامەکەدا، ئەشێ لە هۆیە دیارەکانی ئەو ناڕێکوپێك دەرچوونەی بووبن.

## ١. ٤. باری دارایی:

ئابوونەی ڕۆژنامەکە، سەرچاوەیەکی گرنگی دابینکردنی خەرجیی بووە؛ تا (ژ١٣٣) وەك خۆی ماوەتـەوە: بـۆ شەش مانگ سێ‌و ساڵێك شەش ڕووپیەو، بۆ دەرەوە حەوت ڕووپیەو نیو و، بۆ شـەش مـانگ کـەمتریش قوبـووڵ نەکراوە. بەڵام لە (ژ١٣٤)ەوە، کە بووە بە حەفتەی دوو جار، بۆ شەش مانگ پێنج‌و ساڵێك دە ڕووپیە دانـراوەو، بۆ دەرەوە کرێ‌ی پۆستەی سەرخراوە. دیسان بۆ شەش مانگ کەمتر نەنووسراوە.

ئەو (١٩) ((تکا))و ((تەشەکوراتێکی عەلەنی))و ((ڕجایەکی مەخصووص))و ((ڕجا لـە موشـتەریەکانمان))و ((بـۆ زانینـی هـەموو قاریئینی کیرام))و ((ئاخر ڕجا))و ((تکایـەکی تایبـەتی لـە موشـتەریەکانمان))ـەی کـە لـە ژمارەکـانی (٩٥، ل٤؛ ٩٧، ل٣؛ ٩٩، ل٢؛ ١٠٥، ل٣؛ ١١٤، ل٤؛ ١٢٨، ل٤؛ ١٣٣، ل٤؛ ١٣٤، ل٢؛ ١٣٦، ل٤؛ ١٤٣، ل٤؛ ١٤٤، ل٤؛ ١٧٣، ل٤؛ ١٨٠، ل٤؛ ١٨١، ل٤؛ ١٨٣، ل٣؛ ٢٢٠، ل٤؛ ٢٢١، ل٤؛ ٢٢٢، ل٤؛ ٢٢٦، ل٤؛ ٢٢٨، ل٤)دا بڵاوبوونەتەوە، بەڵگەن کە باری دارایی‌ی شلۆق‌و بە کەموکوڕی بووە. بۆیـە هـەم شێخ طـەیبی کارمـەندی چاپخانەی ناردووەتە کەرکوك‌و هەولێرو چەمچەماڵ‌و کۆیەو ڕەواندزو شەقلاوە بۆ پارەی ئابوونە کۆکردنەوەو، شاکیر موجریم ئەفەندیی لە بەغدا کردووە بە وەکیل بۆ وەرگرتنـی هـەقی بەشـداران‌و، هـەم جاروبـار بـە زمانێکی ڕەق نووسیویە: ((دائیرەکەمان بە زۆر غەزەتەی نەداوە بەسەر کەسا، لە بەرئەوە ئەوی ئارەزووی قوبووڵکردنـی‌ی نییە ئیعادەی بکاتـەوەو، ئەو قیسمە بەدلاتەی کە لـە خدمەتیانایـە بۆمـان بنێرن))و، هەڕەشـەی کـردووە کـە ((مەیدانی بەعضی٘ موعامەلە مەدەن‌و مەجبووڕمان مەکەن بە نەشری ئیسم‌و موراجەعەتی مەحکەمە)).

دوو بانگەواز، لەوانە، بەوردی ئەو مەسەلەیەیان ڕوون کردووەتەوە:

((بۆ زانینی هەموو قاریئینی کیرام: مەعلوومی هەموو قاریئین‌و موشتەریە کیرامەکانمانە کە لە کوردستانی جنووبیدا، سلێمانی کە عادەتەن وەکوو مەرکەزێکی عومومییەتی، تەنها ئەم غەزەتەیەی تیا ئینتیشار ئەکات‌و، چونکە ئەسباب‌و ئەدەواتی مەطبەعەکەمان نوقصان بوو لە هەفتـەی دەفعەیەك زیاتر قابیل نـەبوو غەزەتەکـەمان ئینتیشـار بکات. لەبەرئەوە مومکین نـەبوو هـەموو حەوادیثێـك‌و مـەعلووماتێك لـەوەقتی خۆیـدا دەرج بکـرێ.

---

[٦] بۆ زانینی هەموو قاریئینی کیرام، "ژیان"، ژ١٣٤، ل٢.

حکوومـەتی مەحەلییـەو بیلخاصـە سـەعادەتی سـەعادەتی موتەصـەڕیفی ئـەکرەمی دەرکـی ئـەم حالـەو ئـەم نوقصانییەتەی فەرموو، بۆ ئیستیکمالی هەموو نەواقیصاتێکی مەطبەعەکەمان لەگەڵ بەلەدییـەدا مەشوەرەتی فەرموو و، بە واسیطەی هیممەتی موشار ئیلەهی و بەلەدییـەوە بۆمـان ئیکمال کرا. لە یەکی ئەم مانگەوە (١ی تشرینی دووەمی ١٩٢٨) هەفتەی دوو کەڕەت دووشەموان دەفعەیـەك و پێنجشـەموان دەفعەیـەك غەزەتەکـەمان ئینتیشار ئەکات. وە طەبیعی لەمەودوا مەطبەعەکەمان مەصرەفێکی فەوقەلعادە زیاتر بەناوی خزمەتی میللەت و وەطەنەکەوە ئیختیار ئەکات. لەبەرئەوە ڕجا ئەکەین لە موشتەریەکانمان کە موعاوەنـەتی بفەرموون و لـە وەقت و میعادی خۆیدا بەدەلی ئابوونەی غەزەتەکە بـەناوی بەلەدییـەوە بۆمـان ڕەوانە بفەرموون، ڕجایش لەمونەوەرو عالم و فاضیلەکانی کوردستان ئەکەین کە لە خصووص ناردنی مەقالەی موفیدەوە موعاوەنەتمان بفەرموون))[7].

((تکایەکی تایبـەتی: هەموو ئەیزانین لـە موحیطی کوردستانا هـەر ئەم غەزەتـە کوردی‌یـە هەیـە. وە ئـەمیش چونکی موشتەریەکانی موشتەریەکانی موعاوەنـەتی ناکەن و حەقەکەی لـە میعادی خۆیدا تەسلیم ناکەن، نـەك قابیل نییە ئینتیظامێکی پێبدرێ، بەڵکوو ئەگەر هـەروا بمێنێتەوە ناژێ. سـالانەی غەزەتەکـە ئـەوەندە نییـە کـە ئەهەممییەتی بێ، حەقی چوار ساڵی موقابیلی حەقی ساڵێکی غەزەتەیەکی ترە. لەسەر هـەموو حەممییەتمەندێك و وەطەنپەروەرێك پێویستە بە جددی موعاوەنەتی بکات و بیژیێنێ. ئەنجا بۆ ئـەوەی غەزەتەکـەمان بژی و بتوانین ئینتیظامێکی پێبدەین، ڕجا لـە موشتـەریەکانی خاریج و داخـل ئەکـەین و بیلخاصـە لـە قیسـمی مـەئموورین و ئەوانەی کە هێشتا حەقی چوار ساڵیان لاماوەو مەبلەغێکی زۆر قـەرضدارن، ئیتر مـەیدانی نووسین و بـەعضی موعامەلە نەدەن و، نە ئەووەڵ و واسیطەدا بەناوی صندووقی بەلەدییـەی سلێمانی‌یەوە چـەند قـەرضدارن بۆمـان بنێرن و ڕجاکەمان تەرویج بفەرموون))[8].

سەرچاوەیەکی تری دارایی‌ی، بڵاوکردنەوەی (ئیعلان) بووە، کە تا (ژ٢١٠) هەمان نرخی پێشووی هەبووە، بۆ دێڕێك شەش ئانە وەرگیراوە. بەڵام لە (ژ٢١١)ی ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٢٩وە، نرخەکەی وای لێهاتووە: ((لە دێڕێکەوە هەتا شەش مەقگووعەن سێ ڕووپییەو، لە شەش زیاتر جگـە لـە سێ ڕووپییەکە بۆ دێڕە زیادەکانیش دێری شەش ئانە ئەسێنرێ)) ئیعلانەکان، بە ژمارەو پانتایی‌ی لاپەڕەوە، هی ئەم دائیرەو لایەنانە بوون: تاپۆ: ٢٢١دانە، ٦٦ل. موتەصـەڕیفی سلێمانی: ٧٣دانـە، ٣١ل. بەلەدییـەی سلێمانی: ٦٤دانـە، ١١ل. دائیرەی ئیجـرا: ٢٩دانـە، ٧ل. حاکمی مونفەرید: ٢٨دانـە، ٥ل. مودیـری پۆلیـس: ٢٥دانـە، ٤ل. ئامیری مەنطیقـەی شـەرقییە: ٢٢دانە، ٢,٥ل. مەئمووری گومرگ و مەکووس: ١٥دانە، ٢,٥ل. قاضی‌ی سلێمانی (مەحکەمەی شەرعی): ١٣دانە، ٢ل. بەیطەرەی بەغداو سلێمانی: ٩دانـە، ١,٥ل. مەحکەمـەی صولـح: ٩دانـە، ١,٥ل. دائیرەی صیحـە: ٧دانـە، ٠,٥ل. ئامیر فـەوجی ثـالیث:٧دانـە، ١ل. وەزارەت (موستەشـار)ی داخلییـە: ٥دانـە، ١,٢٥ل. شـیرکەتی نـەوتی خانەقین: ٥دانە، ١,٥ل. دیوانی مەحوی: ٥دانە، ٠,٢ل. مودیری موحاسەباتی عومومییە: ٤دانە، ٣ل. ئەشغالی عوموومی و سلێمانی: ٤دانە، ٠,٥ل. موحامی ڕەفیق تۆفیق: ٤دانە، ٠,٣ل. دوقتۆر ئەرنوکرتون: ٤دانـە، ٠,٥ل. هەیئـەتی تەفتیشییە: ٢دانە، ٠,٥ل. وەزارەتی عەدلییـە: ٢دانـە، ٠,٥ل. مودیرییـەتی عـامی نوفـووس: ٢دانـە، ٠,٣ل. ضـابطی ئیستیخبارات: ٢دانە، ٠,١ل. گەچی بێژراوە: ٢دانـە، ٠,١ل. چاپچی محـەمـەد ڕەشـید: ٢دانـە، ٠,١ل. قایمقامی هەڵەبجە: ٢دانـە، ٠,١ل. ئەوقاف: ٢دانـە، ٠,٢ل. ضابط ڕوکنی لیوی‌ی عیراق: ١دانـە، ٠,١ل. قەواعیدی صـەرف و نـەحوی کـوردی و ئیـدارەی تـەلغراف و تەلـەفۆنی سلێمانی و دائیرەی ئیجـرای ڕەوانـدز و سـکرتێری مەجلیسـی وزەراو سـکرتێری موعتەمـەدی سامی‌ی عـیراق و غەزەتـەی جمهوورییـەت و میللییـەت و شیرکەتی مەکینـەی سینگەرو ساکۆو قونسلۆسی ئێران و دائیرەی زەراعـەی عاصیمـەو حـەمامـی سـەرا، یـەکی ئیعلانێکیان هەیە. هاوکات، نرخی هەر دانەیەکی ڕۆژنامەکە، نەگۆڕاوەو یەك ئانە بووە.

---

[7] هەمان سەرچاوە.

[8] "ژیان"، ژ١٨٠، ل٤.

## ١. ٥. ڕێنووس:

تا ئەودەمە ڕێنووسی کوردی، هەمان ئەوەی زووی تەرزی نووسینی مەلاکانمان بووە، کە بەشێکی دەنگەو پیتەکانی پێ وێنە نەکراوەو، هەر بە سەلیقەو شارەزایی خوێندراوەتەوە. بەڵام کە تۆفیق وەهبی بەگ ٣٠ی مایسی ١٩٣٠ کراوەتە موتەسەڕیفی سلێمانی، "ژیان" بە کاریگەریی وەزیفەی ئەو زاتەو بە پێڕەوی داهێنراوەکانی ناو کتێبی (دەستووری زمانی کوردی)یەکەی کە ساڵی ١٩٢٨ یەکەم بەرگی لە بەغدا لێ بەچاپ گەیاندبوو، کەوتووەتە جێبەجێکردنی هەوڵو پێشنیارەکانی لە مەیدانی ڕێنووسی کوردیداو، لە ژ٢٤٠)ی ڕۆژی ١٩٣٠/٥/٢٢یەوە بابەتەکانی بەو ئیملایە داڕشتوەتەوە.

ئەو ژمارەیە، بەناونیشانی (ئیملای تازە)وە، نووسیویە: ((ئەمانەوێ ئیتر غەزەتەکەمان لەسەر ئیملا وە گرامێرە تازەکەی جەنابی تۆفیق وەهبی بەگ بنووسین. بەڵام لەبەرئەوەی لەچاپخانەکەمانا بەعزێ حرووفات نییە کە پێویستیەتی، ناتوانین بەتەواوی ڕێکی خەین. ئومێد ئەکەین بەرە بەرە بەتەواوی تەتبیقی بکەین)). (٧)ی سەروژێری وشەکان نەبێ کە لەبەر نەبوونی لە چاپخانەدا دانەنراوە، وەکی تر -کەمو زۆر- هاوشێوەی ئیملای ئێستا بووە. ئەم هەوڵە، بۆ کاتی خۆی، ڕووداوێکی زمانەوانیی گرنگ بووە.

لەبەرئەوەی بەکارهێنانی ئەو ڕێنووسە تازەیە، وەك یەکەم هەنگاو، لەوسەردەمەدا قورس بووە، هەر تا یەکەم ستوونی دووەم لاپەڕەی (ژ٢٥٢)ی ١٩٣٠/٧/٢١ درێژەی پێدراوەو، پاشتر چوونەتەوە سەر ڕێنووسە کۆنەکە. بەدووری نازانم لابردنی موتەسەڕیفو، بە ڕەسمی لە ١٩٣٠/٨/٢٢دا جوێبوونەوەی لە سلێمانی[9]، دەوری لەو دەست لێهەڵگرتنەی ڕێنووسەکەدا هەبووبێ.

## ١. ٦. زاراوەسازی:

"ژیان"و، ڕۆژنامەوانیی کوردی بەگشتی، نەخشی بەرچاوی لە هێنانەپێشو چەسپاندنو خستنەکاری کۆمەڵێك زاراوەی کوردیدا هەبوە، کە دواتر زمانەکەیان دەوڵەمەند کردووەو زیاتر گەشەیان پێداوە. بۆ مێژوو و دەست نیشانکردنی سەرەتای پەیدابوونی هەندێ لەو زاراوانە، بە پێویستم زانی ئەمانەیان بهێنمەوە:

*کۆمەڵ:

کەریم بەگی سەعید بەگی سکرتێری (زانستی کوردان)، بۆ یەکەمجار لە (تەشەکورنامە)یەکدا، لە (ژ١٦٦، ١١نیسان ١٩٢٩، ل٤)دا، لە بریی (جەمعییەت)، وەك (سکرتێری کۆمەڵی زانستی) بەکاری هێناوەو، ڕەنگە هەر خۆی دایهێنابێ. لە (ژ١٧٩، ١٣حزیران ١٩٢٩، ل ١-٢)دا، بۆ (عصبة) لە (عصبة الامم)دا بەکاربراوە. ئیتر دوایی، وەك (بەیانی تەشەکورو یەکدوو قصە)ی کەریم بەگی سەعید بەگ لە (ژ٢٠١، ٣٠ ایلول ١٩٢٩، ل٢)دا، ڕاست خراوەتە شوێنی (جەمعییەت). پاشتریش، لە (دواڕۆژی وڵاتمان بەچی باش ئەبێ: پێشکەوتنی ژنانمان، ژ٢٤٧، ٢٦حزیران ١٩٣٠، ل٣-٤)دا، بۆ (مجتمع) بەکارهێنراوە.

*بەشدار:

ڕەشید نەجیب، لە (منداڵ بەخێوکردنو بەرهەمهێنانن،٢، ژ١٣٥، ٢٨ تشرین ثانی ١٩٢٨، ل٢-٣)دا، بۆ (مشارك، هاوبەش، خاوەن بەش)ی داناوە.

*نووسیار:

هەر ڕەشید نەجیب لە (ژنهێنان، بناغەی ژیان،٣، ژ١٤٣، ٥کانون اول ١٩٢٨، ل٢)دا، بۆ (کاتب، محرر)ی بەکارهێناوە، کە دارشتنێکی لەچاو (نووسەر)ی لەوەبەدوادا ڕەوانو دروستترە.

*سرشت:

کە (الطبیعة)ی عەرەبی ئەگرێتەوە، لە (پاشماوەی بەیاناتەکەی مەعالی ئەمین زەکی بەگ/٤، ژ١٣١، ٤ تشرین اول ١٩٢٨، ل١-٢)دا وەك (سرشتی خراپ) بۆ (تەبیعەت)ی مرۆڤ بەکارهێنراوە.

---

[9] "الوقائع العراقیة" (جریدة)، بغداد، العدد٨٩١، ١٩٣٠/٨/٢٨.

*خواردەمەنی:

لە (تەشەکوری گەورەکانمان ئەکەین کە وەفاو ڕاستێتیی کوردیان ئیثبات کرد، ژ١٥٥، ١١ شباط ١٩٢٩، ل١-٢)دا، بۆ کەرەستەی جۆراوجۆری خواردن (مواد غذائية) دانراوە.

*بۆش:

بۆ واتای (خاڵی، بەتاڵ، بۆشایی) لە (ئەمڕۆ هەر زەراعەت ئێمە دەوڵەمەند ئەکات، ژ١٧٤، ١٣ مايس ١٩٢٩، ل١-٢)دا تەرخان کراوە.

*قوتابی، قوتابخانە:

قوتابی، پێشتر لە ("ژیان"، ژ٥٥، ٢٤ شباط ١٩٢٧، ل٣)دا بۆ (طەڵەبە)و شاگردی مەکتەب بەکارهێنراوە. هەرچی (قوتابخانە)یە، پاشتر لە (سینەما بۆ زانستی، ژ١٦٩، ٢٢ نيسان ١٩٢٩، ل١)دا پێبەپێ خراوەتە شوێنی مەکتەبو دەرسخانەو، ساڵانێکی دواتریش بەتەواوی جێگیر بوو.

*پارط:

لە (نائیبو واجیباتی، ژ٨٧، ٢٥ تشرين اول ١٩٢٧، ل٢)دا، مەبەست پێی دەستەو گرووپی پارلەمانییە. ئەم زاراوە ئینگلیزییە پاشان لە ١٩٤٦دا هەمزە عەبدوڵڵا بۆ یەکەمین جار لای کورد، لەباتیی (حزب، جەمعییەت) بۆ (پارتی دیموکراتی کورد)ی داناوە[١٠].

## ١. ٧. پاشکۆ:

"ژیان"، لەم دەورەیشدا، دوو پاشکۆی هەبوە کە (لاحیقە)ی پێوتراوە:

ژ١٦١: چوار لاپەڕەی بە هەمان پێوانەی ڕۆژنامەکە بووە، هیچ ناوێکی وەك (عەلاوە) یا (لاحیقە)ی سەرنەخراوە، بەڵام هەر بە پاشکۆ ئەژمێررێ. سێ لاپەڕەی تەرخان بووە بۆ دەقی کوردیی (قانوونی تەعدیلی قانوونی عوقووباتی بەغدادی بۆ ساڵی ١٩٢٤). هیچ مێژوویەکی پێوە نییە، بۆیە ئەبێ لەنێوان (١٨ی مارتی ١٩٢٩)ی ڕۆژی دەرچوونی (ژ١٦١)و (٢٨ی مارتی ١٩٢٩)ی ڕۆژی دەرچوونی (ژ١٦٢)دا، بڵاوبووبێتەوە.

ژ٢٥٧: دوو لاپەڕەی تەواوکەری درێژەی گفتوگۆی سەرانی کوردو نوێنەرانی حکوومەتی عێراقو ئینگلیز بووە لە سلێمانی، ناوی (لاحیقە)ی (ژ٢٥٧)ی لێدراوەو، بێ مێژووە. دیارە ئەبێ دوای (١٤ی ئاغستۆسی ٩٣٠)ی ڕۆژی دەرچوونی (ژ٢٥٧)و پێش (٢٨ی ئاغستۆسی ٩٣٠)ی ڕۆژی دەرچوونی (ژ٢٥٨)، بڵاوبووبێتەوە.

## ١. ٨. نووسەرانی ئەم بەرگە:

٢٣ کەسیان، دوای ساخکردنەوەی ناوی ڕەمزیی هەندێکیان، ناسراونەتەوە:

١- ئەحمەد موختار جاف: ١ شیعری هەیە.

٢- أ.ع: ڕاست ئەحمەدی عەزیز ئاغایە کە ئەوکاتە مەئمووری ئەوراقی لیوای سلێمانی بووە[١١]. ١ نووسینی هەیە. بەشداریی لە یەکەم دەورەی "ژیان"دا، زیاتر بووە.

٣- فائیق تۆفیق، تۆفیق: "پیرەمێرد"ی شاعیرە. ئەو "فائیق"ـەی، دوور نییە، بە خۆشەویستیی فایەق هۆشیاری کچەزایەوە بەکارهێنابێ. ٢ شیعری هەیە.

٤- ر.ن: هەر ڕەشید نەجیبە کە ئەوسا کاتبی موفەتیشی ئیداریی لیوای سلێمانی بووە[١٢]. ٣ شیعرو ٤ وتاری هەیە؛ وتارەکان، ٢یان دوو ئەڵقەییو ٢یشیان سێ ئەڵقەییە.

---

[١٠] پیرەوەریەکانی هەمزە عەبدوڵڵا کە مامۆستا عەبدوڕڕەقیب یووسفو بەندە ساڵی (١٩٩٨) ١٣,٥ سەعاتمان لەسەر شریتی کاسێتو بە کامێرای ڤیدیۆ لێ تۆمار کردووەو، بەدەستەوەیە ئامادەی بکەین بۆ چاپ.

[١١] "ژیان"، ژ١٣٠، ل٤.

[١٢] "ژیان"، ژ١٣٨، ل٤.

٥- سەلام: بەوەدا کە شێخ سەلامی شاعیر، لە کۆتاییی ساڵانی بیستەوە، لە ڕێگەی چەمچەماڵ-کەرکووک ئیشی بۆ دائیرەی ئەشغاڵ کردووە[١٣]، بێسێودوو ئەو زاتەیە. ١ پەخشانە وتاری هەیە.

٦- صالح: بێ دوودڵی هەر بە صالح قەفتانی ئەزانم، بەم بەڵگانە:

ئ. ئەو وتارەی ((بەواسیطەی "ژیان"ی خۆشەویستمانەوە، بۆ نەطەری مەرحەمەتی ئەولیای ئوموور)) کە بەناوی "صالح"ەوەیە، سەبارەت بە کێشەی تووتنی سلێمانییە. صالح قەفتان، خۆیو کەسی تری بنەماڵەکەی ڕاست سەردەمێك توجاری تووتن بوون[١٤]. ئەگەر ئاگاداری وردەکاریی کێشەکە نەبوایە، لەسەری نەئەنووسی.

ب. نووسەرانی ئەو زەمانە، هەر ئەو "صالح" ناوە وتارنووسەیان تێدایە کە بایەخی بە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکانی خۆمانو بێگانەیش دابێ. هەرچی صالح زەکی ساحێبقڕانە، ئەوکاتە قایمقامو لە دەرەوەی سلێمانی بووە، بۆیە هیچ ڕێی تێناچێ پەرژابێتی لە بابەتێکی وەك تووتن وردببێتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، ناوبراو لەدوای وەستانی "دیاریی کوردستان"ەوە، چالاکییەکی ڕۆشنبیریی ئەوتۆی نەما. بۆیە ئەو صالحە، ئەم نییە[١٥].

کاك کەمال ڕەئووف محەمەد، بەهەڵە پێیوایە صالح قەفتان یەکەم وتاری لە گۆڤاری "ڕووناکی-١٩٣٦"ی هەولێردا بڵاوکردووەتەوە[١٦]. لەکاتێکدا ئەوەتا حەوت ساڵێك پێشتر ئەو یەکەم وتارەی لە (ژ١٥٣)ی ١٩٢٩/١/٣١ی "ژیان"دا بڵاوبووەتەوە.

٧- ئەثیری: عەبدولخالق ئەثیریی شاعیرە. ١ شیعری هەیە.

٨- عەبدوڕڕەحمان عەزیز: قوتابیی مەکتەب بووەو، دواتر وەك نووسەر نەناسراوە.

٩- ع. عەزیز: عەبدوڵڵا عەزیزی مامۆستای خەڵکی هەولێرە. دوو وتاری هەیە، ١یان سێ ئەڵقەییو ئەویتر ٤ ئەڵقەیییە.

١٠- ع. واحید، ع. و. نووری: عەبدولواحید نووریی نووسەرە. ٢ وتاری هەیە، یەکیان وەرگێڕانە.

١١- عەبدولوەهاب کەرکووکی: وەکوو نووسەر نەناسراوە. ١ وتاری هەیە.

١٢- عەلی ئەحمەد، عەبدوڕڕەحمان حاجی عەلی: قوتابیی زانستی بوون. ١ وتاریان هەیە.

١٣- عەلی عارف: عەلی عارف ئاغای شاعیرە. ١ شیعری هەیە.

١٤- ف. بێ باك، ف. بێکەس: فایەق بێکەسی شاعیرە. وەك دەرئەکەوێ، سەرەتای شیعر نووسینی، ناسناوی (بێباك)ی هەبوە. ٣ شیعری هەیە.

١٥- ف. عەلییە: وەك کاك کەمال ڕەئووف محەمەد ساخی کردووەتەوە، فاتمە محێدینە[١٧]. مادامیش ئەو تاکە وتارەی لەم دەورەیەی "ژیان"دا، بەناوی موعەللیمەوە لەبارەی قوتابخانەی کچانی سلێمانییەوە نووسیوە، هەر ئەبێ ئەو خانمە بێ.

١٦- فائیق زێوەر: بەختیار زێوەری شاعیرە. ٢ شیعری هەیە.

---

[١٣] دیوانی سەلام، چاپخانەی تەمەدون-بەغدا، ١٩٥٨، ل١٠٣-١٠٤.

[١٤] تۆماری ماوەی نێوان (٣١ی جولای ١٩١٩-٦ی مەی ١٩٢٠)ی کاتب عەدلی سلێمانی، ل٤٦. ئەم تۆمارە لە (ئەرشیڤی نەتەوەییی کوردستان) پارێزراوە.

[١٥] ڕەفیق سالح، دیاری کوردستان (١٩٢٥-١٩٢٦)، لێکۆڵینەوەی نەوشیروان مستەفا ئەمینو سدیق سالح، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٧١-٧٢.

[١٦] کەمال ڕەئووف محەمەد، صالح قەفتانو یەکەم گۆڤاری سلێمانی/ ٢، "کاروان" (گۆڤار)، هەولێر، ژ٧٩، ئەیلوولی ١٩٨٩، ل١٠٧-١١٥.

[١٧] کەمال ڕەئووف محەمەد، ئەڵقەیێکی مێژوویی ون: یێکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانیی/٢، "کوردستانی نوێ" (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژ١٣١٣، ١٩٩٦/٦/١٩.

١٧- محەمەد ئاغای حاجی حسێن ئاغا، عەطار محەمەد: محەمەد ئاغای حاجی حسێن ئاغای ناسراوێکی بنەماڵەی ئاغاتەهایە. پاشتر وەك نووسەر نەناسراوە. ٢ وتاری هەیە.

١٨- محەمەد کەریم ئاغا، فەرەج تۆفیق: قوتابیی زانستی بوون. ١ وتاریان هەیە.

١٩- کوردی: ناسناوی مستەفا صائیبە. دوو وتاری هەیە، ١یان چوار ئەڵقەییی و ئەویتر سێ ئەڵقەییە.

٢٠- م.ج: مەحموود جەودەتی فەڕەنسیزانە. دواتریش بەو ناوە ڕەمزییەوە نووسینی بڵاوکردووەتەوە[١٨]. ١ شیعری وەرگێڕدراوی هەیە.

٢١- م. نووری: شێخ نووریی شێخ ساڵحی شاعیرە. ١ شیعری هەیە.

ئەو نووسەرانە، عەبدوڵلا عەزیز نەبێ، ئەوانیتر خەڵکی سلێمانین و، تێکڕا، ١٥ شیعرو ١٧ وتاریان لەو کەموزۆر ٣ ساڵەی دەورەکەدا هەیە. لەکاتێکدا لە ساڵێك و حەوت مانگی یەکەم دەورەدا، ٢٩ نووسەر بە ٢١ شیعرو ٥٧ وتارو نووسین، کە ٨یان دوو ئەڵقەییی و ١یان چوار ئەڵقەییی و ١یان پێنج ئەڵقەییی و ١یشیان شەش ئەڵقەیی بووە، بەشدار بوون.

جگە لەوە، ٩ نووسین بە ناوەکانی (پیرۆت، حەقبێژی قصەڕەق، ع. ك. باخانی، کوردێك، کوردێکی حەقیقەتپەرست، لاوێك، لاوێکی کورد)ەوە هەیەو، نەناسراونەتەوە. (٨٧) وتاری تریش، بەبێ ناو بڵاوکراونەتەوە. وەك دیارە، بەشداریی نووسەران لەم قۆناغەدا کەمتر بووەو، بەشی هەرە زۆری وتارەکان بێ ناون، کە هیچ بەدووری نازانم "عەلی عیرفان"ی لێپرسراوی "ژیان" زۆربەیانی نووسیبێ. سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە ئەو زاتە تەنیا یەك ڕاپۆرتە هەواڵی بەناوی ئاشکرای خۆیەوە تێدا هەیە[١٩].

## ٢. ناوەڕۆك:

### ٢. ١. بە ژمارە:

لاپەڕەکانی "ژیان"، لەم دەورەیەدا، کە سەرجەم ٧٢٢ن؛ دوای وردکردنەوە، کەموزۆر، بەم ژمارانە دابەش کراون بەسەر ئەم بابەتانەی لای خوارەوەدا:

وتارو شیعری؛ نووسەر دیار: ٢٤ل، واتە ٣,٤٥٪.

نووسەر نادیار: ١١٠ل، واتە ١٥,٤٪.

نووسەر بەناوی ڕەمزییەوە: ١١ل، واتە ١,٦٥٪.

هەمە جۆر: ١٢ل، واتە ١,٧٥٪.

هەواڵ و ڕاپۆرتەهەواڵی؛ دەرەوەی عیراق: ١٧٥ل، واتە ٢٤٪.

ناوخۆی عیراق (بەغدا): ٨٠ل، واتە ١١٪.

ناوشار (سلێمانی): ١٩٧ل، واتە ٢٧٪.

ئیعلان: ١١٣ل، واتە ١٥,٧٥٪.

شیاوی وتنە، ژمارەکانی (٨٣، ١١١، ١١٥، ١١٨، ١٢٩، ١٣١، ١٣٢، ١٥٢، ١٥٤، ١٦٠، ١٦١، ١٦٥، ١٧١، ١٧٢، ١٨١، ١٨٢، ١٩١، ١٩٢، ١٩٣، ١٩٨، ٢٠٣، ٢٠٥، ٢١٠، ٢١١، ٢١٢، ٢١٣، ٢١٥، ٢١٧، ٢١٩، ٢٢٠، ٢٢١، ٢٤٨) هیچ وتار یا شیعرێکیان تێدا نییە.

### ٢. ٢. بە بابەت:

#### ٢. ٢. ١. خوێندن و مەعاریف:

---

[١٨] بڕوانە: مامەیارە، "دیاری لاوان" (گۆڤار)، بەغدا، ١٩٣٤، ل٢٥-٣٣.

[١٩] هەڵەبجە فەرقێکی زۆر کردووە، "ژیان"، ژ٢٤٤، ل٢.

کورد، بەدرێژایی‌ی حوکمی پاشایەتی، هەرێمەکەی لە خوێندن‌و مەعاریفدا دواخراوە؛ نە بەپێ‌ی پێویست قوتابخانە، بە هەموو ئاستەکانیەوە، لە کوردستان کراوەتەوەو مامۆستا جیاجیای بۆ پێگەیەنراوەو، نە ڕێدراوە کوردی لە تێکڕای قۆناغەکاندا ببێتە زمانی خوێندن‌و، بە لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندی‌ی کوردی، بەڕێوەبەرایەتییەکی مەعاریفی سەربەخۆ قوتابخانەی شارەکانی بەڕێوەبەرێ.

"ژیان"، بە زنجیرەیەك وتاری پڕ ناوەڕۆك، گەوهەری ئەم مەسەلەیەی خستووەتە ڕوو و، ناوبەناو جەختی لەسەر چارەسەرکردنی کردووەتەوە. لە (تەربییەو تەعلیم بەنەظەر ڕۆحی میللەتەوە تەخالوف ئەکات)[20]دا، جۆرێ پەروەردەو خوێندنی بەپێویست زانیوە کە لەگەڵ گیان‌و خەسڵەتی میللەتدا جووت بێتەوە: (( لەپێش هەمووشتێکدا لازمە ڕۆحێکی تەوافوق لەبەینی ئوصووڵی تەربییەو قابلییەتی قوبووڵکردنی ئەو تەربییەیە لەطەرەف قەومەکەوە بدۆزرێتەوە، ئەنجا تەطبیق بکرێ، لە حەقیقەتی حاڵیشدا مەسئەلە بەم نەوعەیە)). (( ڕجا لە مورەبییەکانمان ئەکەین لەپێش هەمووشتێکا لازمە تەربییەیەك کە تەطابوق لەگەڵ ڕۆح‌و مەزایای میللەتەکەمان بکات تەطبیقی بکەن، چونکە وەکوو وتمان ثەمەری تەربییەیەك کە موخالیفی ڕۆح بێ ثەمەرەیەکی موفیدەی لێ ئیستیحصاڵ ناکرێ، بەڵکە مەضەڕڕەت تەولید ئەکات)).

لە (خەطابەکی تەعلیمی)[21]دا، ئاوا درێژەی بەوخاڵە داوە: (( بۆ منالێك کە لە ئەووەڵ دەورەی تەعلیمیا بێ، لازمە لەپێش هەمووشتێکا دیقەت لە جەلبی ڕەغبەت‌و یا ئیجادی سەوق‌و خواهیش بکرێ بەرامبەر بە عیلم. ذاتەن ئێستا بەتەواوی مەضەڕڕەت‌و بێثەمەرەیەتی‌ی تەعلیم‌و تەحصیلێك کە بە جەبر خرابێتە مێشکەوە دەرکەوتووە.. . پێش ئەوەی کە مینهاج تەنظیم ئەکەن، لازمە ئارەزوو، شەوق‌و ذەوقی منالەکانی موحیطەکە تەحلیل‌و بەوپێ‌یە پرۆغرامەکە ڕێك بخەن.. . ئوستادی شەهیر ساطع حوصەری بۆ تاریخی صنفی دووەمی ئیبتیدائی بەعضی ئەعاظیمی مەشهووری عەرەبی حیکایەواری قوبووڵ‌و داخڵی پرۆغرامی کردووە. فەقەط طەبیعی ئەمەیش مەعلوومە کە صرف بۆ منالەکانی عەرەبی کردووە.. . مەعەل ئەسەف مورەبییەکانی میللەتی کورد هێشتا ئەمەیان دەرك نەکردووە، ئێستاش لە صنفی دووەمی ئیبتیدائیدا عەینی حیکایەتێك ئەخوێنن بە منالەکانمان کە بۆ منالە عەرەبەکان داخڵی مینهاج کراوەو هەر ئەوان ئیستیفادەی لێ‌ئەکەن)).

بەوشێوەیە، بەرنامەیەکی خوێندنی خواستووە کە پەیوەندی‌ی بە کورد خۆیەوە هەبێ، تا کوردانە قوتابی‌ی کوردی لە سەر پەروەردەو فێر بکرێ: (( ڕجا لە مورەبییەکانمان ئەکەین لێکی بدەنەوەو بزانن لە مەکتەبەکانی سلێمانیدا منالێك لە حیکایەی داراو یاخود ئەسکەندەر، یا عەمرو بن عاص زیاتر مەسروور ئەبێ؟ وە یا لە حیکایەی پاشاکانی بابان‌و یا بەدرخانەکان‌و یا کەریم خانی زەند)). (( ئەنجا ئومێدمان وایە لە موعەللیمەکانمان‌و لە ئەنجومەنی مەعاریف سەعی بکەن بۆ تەئریخی ئەم صنفە کتێبێك کە بەحثی مەناقیبی عیلم، موحارەباتی پیاوە مەشهوورەکانی خۆمان، وەکوو بابان، بەدرخانی، شێخ مەعرووفی نۆدێیی – ئەو بەحری علوومە، حەمە ئاغای کۆیە – ئەو حاتەمی طایی‌یە بکات تەئلیفی بکەن‌و لەم صنفەدا تەدریس بکرێ‌و منالەکانمان ذەوقی لێ‌وەربگرن‌و خواهیشێکیان ببێ کە لە صنفەکانی ترا ئیستیفادە لە دەرسی موهیمی تەئریخ بکەن)).

هەر لەوڕووە، بەکارهێنانی زمانی کوردیی لە خوێندندا، بە مافێکی ئاسایی‌و بێ‌ئەملاوئەولا و ناچاری داناوە. لە (ئەسبابی دواکەوتنمان)[22]دا، نووسراوە: (( وا ئەزانم، کە لە ئومووری موتەعارەفەدا ئەنفەعییەت‌و چاکترین تەدریس وە تەدەرروس بۆ قەومێك ئەمەیە بە زمانی مادەرزادی خۆی بێ.. . ئەصڵی چاکێتی‌ی تەدریسێك کە بە

---

[20] "ژیان"، ژ٨٩، ل١.

[21] "ژیان"، ژ٩٠، ل١-٢.

[22] "ژیان"، ژ٩١، ل١-٢.

لیسانی مادەرزاد بکرێ، هیچ موتەخەصیصێکی عیلمو تەربییەو تەدریس ئینکاری ناکاتو هیچ میللەتێك بە لیسانێکی کە تەرەقیی نەکردووەو نایکات)).

"ژیان"، بە پەژارەوە لای لە بڵاویی دەردی نەخوێندەواری کردووەتەوە. لە (هیچ نەبێ لازمە نەسلی ئاتیمان خوێندەوار بێ!)[٢٣]دا، وا لێی دوواوە: (( ئێمە لەم عەصرەدا لە قصەی زل زیاتر هیچی تر نازانین، سەعی ناکەین، لە غەیری شارەکانمان نەبێ مەکتەبمان نییە. قەطیعییەن لە دێهات لە عەشائیرەکانمانا تەصادوفی فەردێکی خوێندەوار ناکرێو، بەتەواوی حیساب بکرێ ئەمڕۆ لە کوردستانا لە هەزاری یەکێك خوێندەوارە، باقیەکەی جاهیلو حەتتا نازانێ شکڵی دنیا چۆنە! عەجەبا میللەتێکی وا هیچ حەقی حەیاتی ئەبێ. غەیری ئەمەیش کە بەم سەبەبەوە حوڕڕییەتمان مەحفووظ نییە، بوویشە بە سەبەبی ضەرەرو زیانێکی زۆرمان)). (( هەرچەندە فکری زۆر کەس وایە حکوومەت موعاوەنەت ناکات مەکتەبمان بۆ ناکاتەوە. بەلای منەوە ئەم فکرە موحیق نییە، چونکە میللەتێکی عالمو وریا حکوومەت مەجبوورە هەموو حوقووقێکی بداتێو هەموو مالەزیمەیەکی بۆ ئیکمال بکات. ئەمڕۆ لەم هەموو لیوا جەسیمەی ئێمەدا چوار پێنج مەکتەب هەیە. ئەویش هێشتا ئەوەندە طەڵەبەیان تیا نییە کە ڕوومان بێ داوای مەکتەبی تر بکەین. هەڵەبجە کە قەضایەکی جەسیمە تەنیا مەکتەبێکی تیادایە، کەچی ئەوەندە طەڵەبەی تیا نییە کە هەموو ساڵێك صنفێکی لێ زیاد بکرێ. . . مەکتەبی پێنجوێنو قەرەداغو چەمچەماڵ بەتەواوی لە دەرەجەی نەبوونان)). (( ئەمڕۆ ئیجاب ئەکات هیچ نەبێ بە منداڵەکانمان تەدریساتی ئیبتیدائییان پێ ئیکمال بکەین، منداڵەکانمان جاهیلو عاطیل نەهێڵینەوە. لازمە بە نەوعێك سەعی بکەین بۆ خوێندن کە نەتیجە حکوومەت مەجبوور بێ، نەوەکوو لە قەضاو ناحیەکانا، بەڵکە لە دێهاتە گەورەکانیشمان مەکتەبمان بۆ بکاتەوە)). (( ئەگەر داوای حوقووق ئەکەینو ئەمانەوێ حوڕ بژین، ئەبێ شەوو ڕۆژ سەعی بکەینو هەموو منداڵێکمان لە تەحصیلی عیلمو مەعاریف بەهرەمەند بکەین. ئەبێ بە نەوعێکمان لێ بێ کە کەسبی ئیحقاق بکەین ئەوسا طەڵەبی حوقووق بکەین)).

لە (مەعاریفو قازانجی)[٢٤]دا، مەبەستی خوێندنی لە وڵاتانی شارستانیدا بۆ بەراوردو بەنموونە هێناوەتەوە: (( ئەساسەن خوێندەواری، ئیستیفادەکردن لە مەعاریفو تەحصیلی مەکاتیب، لە مەمالیکی موتەمەدینەدا- وەکوو لێرە تێیگەیشتووین- صرف بۆ مەئمووریيەت نییە. خوێندەواریو تەحصیلی مەکاتیب بۆ ئەوەیە شەخصێك کە هاتە ساحەی ژیانەوە، بۆ خۆیو بۆ هەمجنسی ببێ بە عوضوێکی نافیع، کە ئەمەیش بە وەرگرتنی تەربییەوە پەیدا ئەبێت. شەخصێك کە تەربییەی وەرگرت، لە هەموو حەرەکاتێکدا، لە هەموو صەفەحاتی ژیانیدا، لە کەسابەت بۆ نان پەیدا کردنیدا دائیما مەنافیعی عومومییە دەهێنێتە پێش چاویو لە مەنافیعی عومومییەدا مەنافیعی شەخصیی خۆی تەعقیبو طەڵەب ئەکات)).

لە (بۆچی دائیما بەرەو پاش ئەڕۆین)[٢٥]دا، هانی خەڵکی داوە بە منداڵیان بخوێنن، بەداخەوە باسی نموونەی پێنجوێنی کردووە کە (١٩٢٧) قوتابخانەی تێدا کراوەتەوەو، لەبەرئەوەی کەس منداڵی خۆی بۆ نەناردووە، داخراوە: (( مەعلوومە میللەتێك بیەوێ تەرەقی بکات، لەم عەصرەدا نائیلی سەعادەت ببێ، ئەبێ لە تاریکیی جەهل خۆی ڕزگار بکات، بێتە ناو ڕووناکیی نووری مەعاریفەوە. میللەتێك کە ئەفرادەکەی هەموویو بە ئەکثەرییەت جاهیل بوو و لە نووری مەعریفەت موستەفید نەبووبێ، نەك تەرەقی ناکات، بەڵکوو لەم زەمانەدا حەقی ژیانی نابێ)). (( ئەبێ خۆمان بە ئارەزوو و ذەوقێکی جددییەوە هەوڵ بدەین بۆ مەعاریفو کردنەوەی مەکتەب، وە ئیللا بەتەمابین بکرێین بە عالم، کەس مەجبووری نییە)). (( لازمە عومومی دێهاتەکانیشمان واز لە فکرە پێشووەکەیان بهێنن، هیچ نەبێ بە منداڵەکانیان تەحصیلی ئیبتیدائی پێکردنیان بە شەرط بزانن)).

---

[٢٣] "ژیان"، ژ١٠٦، ل١-٢.

[٢٤] "ژیان"، ژ١٢٢، ل١-٢.

[٢٥] "ژیان"، ژ١٤٤، ل١-٢.

له (ئیتر بەسە، ئەبێ ڕەغبەت بدەینە سەر مەعاریف)[٢٦]دا، بە خۆشیحاڵییەوە ئاماژە بە نیازی مەعاریف بۆ قوتابخانەکردنەوە لە ناحیەکانی سووورداش‌و بازیان... کراوەو، دیسان وتراوە: (( هەموو ئەیزانین کە ئەمڕۆ ئێمە میللەتێکی زۆر ئیبتیدائین‌و هێشتا لە مەدەنییەتی حاضیرە ئیستیفادەمان نەکردووەو، ئەبێ بیشزانین کە ئەوەی ئێمە پێش بخات‌و بمانخاتە ساحەی مەدەنییەتەوە هەر مەعاریفە)).

"ژیان"، چووەتە سەر وردەکاریەکانی خوێندن‌و، وەرزشی لە (وەنیە هەر شتێکمان نوقصان بێ)[٢٧]دا وەك وانەیەکی بەبایەخ بۆ بنیاتنانی لەشی ساغ‌و دواتر عەقڵی ساغی منالان جەخت کردووەتەوە: (( ئوستادی فەننی تەربییەو تەدریس بۆ منالەکانی مەکتەب کەشافە، گەڕانیان تەرتیب‌و ئیجاد کردووەو، هەر بۆ ئەوەی کە دەماغی منالەکان مانگوویی‌ی بحەسێتەوەو کە کول بوو دەمەزەرد بکرێتەوە)). (( مەعلووم بووە منالێك کە ئەگەر وجوودیشی بەقووەت بێ، دەماغی قابلییەتی قوبوولکردنی هەموو دەرسێکیشی ئەبێ)). (( لە ئەوروپاداو لەناو هەموو میللەتێکی موتەمەدینەدا ئەم ئوصوولی تەربییەی منالە کە لەپێش هەمووشتێك لەخوصووص تەربییەی وجوودیەوە بە ڕیاضەت-جمناستیق‌و ئەنواعی سپۆرەوە کە ئەبێ بە سەبەبی تەقوییەی وجوودو دەماغی منالّ، ئیهتیمامی پێ ئەکرێ)).

هاوکات، لەوچوار وتاردا پێویستی‌و ناچاریی خوێندنی کچانی ڕوون‌و دووپات کردووەتەوە. لە (مەکتەبی کچان‌و کچەکانمان)[٢٨]دا، لە باسی تاقە قوتابخانەی کچانی ناوشاردا، نووسیویە: (( ئەم مەکتەبە لە ظەرفی ئەم سێ ساڵەدا حەتتا فەوقەل تەصەوور تەرەقیی کردو مەوجوودییەتێکی بەقیمەتی پیشانی میللەت داو، بەم سەبەبەوە میللەتیش، بە خواهیش‌و مەسرووریيەتەوە هەموو کچەکانیان ناردە ناوی‌و ئەمڕۆ مەوجوودێکی زۆری هەیە. بە نەوعێك کە موحەقەق هەتا بەینێك وا بمێنێتەوە، بە واسیطەی ئەم کچانەمانەوە کە تەشکیلی عائیلەیان کرد نەسلی ئاتیمان مەجوودییەتێك پیشان ئەدات‌و عوضوێکی فەعال ئەبێ بۆ وەطەنەکەیان)). (( لازمە ژنەکانمان-دایکی منالەکانمان لە پیاوەکانمان چاکتر صاحێب عەقڵ‌و ئەخلاق بن‌و عادەتەن مورەببییەیەکی وابن کە بتوانن موقابیل بە تەجەددودات‌و تەربییەی حاضیرە منالەکانیان پێبگەیەنن. لەبەرئەوە لازمە کچەکانمان بنێرینە مەکتەب‌و لەسەر تەربییەی حاضیرە پێبگەیەنرێن، کە تەشکیلی عائیلەیان کرد منالەکانیان چاك گەورە بکەن کە بۆ وەطەن‌و میللەتەکەیان عوضوێکی فەعال بن)).

لە (مەکتەبی کچان‌و صنفی پێنجەم)[٢٩]و (مەکتەبی کچان)[٣٠]و بەدواداچوونێکی هەیئەتی تەوریسییەی مەکتەبی کچاندا[٣١]، وەك وتراوە: (( میللەتێك کوڕو کچی وەکوویەك مونەووەرو تەحصیل دیدە نەبن، تەعالی‌و تەرەقیی ئەو میللەتە موشکیلە. میللەتێك کە طەبەقەی نیسائییەی جاهیل بێ، وەکوو ئینسانێکی شەل‌و سەقەط دەرەنگ ئەگاتە مەنزڵی مەقصوود))؛ لەپاڵ ئەوەدا، بێ جێگایی‌ی بینای قوتابخانەکە نیشان دراوە کە لە کەمتەرخەمی‌ی حکوومەت بەدەر نییە.

### ٢.٢.٢. مەبعووثە کوردەکان‌و پەرلەمان:

"ژیان" هیوایەکی زۆری لەسەر مەبعووثەکانی کورد هەڵچنیوەو، لێی چاوەڕان کردوون پێکەوە کارێك بکەن، هەم ماف‌و داواکانی خەڵکی کورد بەجێبهێنن‌و، هەم وڵاتەکە بەرەو ئاوەدانکردنەوەو پێشخستن بەرن. بۆیە لەبەر بایەخ‌و جۆریی مەبعووث، ١٥ وتارو دەقی ڕاپۆرتێکی ئەمین زەکی بەگی مەبعووثی سلێمانیی بە حەوت ئەڵقە بڵاوکردووەتەوە. ئەو وتارانە، لەلایەکەوە خەڵکیان لێپرسراو کردووە کە، بەپێی چەند مەرجێکی

---

[٢٦] "ژیان"، ژ١٦٩، ل١-٢.

[٢٧] "ژیان"، ژ١٠٨، ل١-٢.

[٢٨] "ژیان"، ژ١٤٨، ل١-٢.

[٢٩] "ژیان"، ژ١٨٩، ل١-٢.

[٣٠] "ژیان"، ژ٢٠٢، ل١-٢.

[٣١] "ژیان"، ژ٢٠٤، ل١-٢.

پێویست، پیاوی زاناو ئازاو هۆشیارو چالاك بە مەبعووثی خۆیان هەڵبژێرن و، لەلایەکی ترەوە کۆمەڵێك بەرپرسی و ئەرکیان خستووەتە ئەستۆی مەبعووثەکانی کورد تا لەبەردەم میللەتەکەیاندا ڕووسوور دەربچن. تەنانەت، لەبەر سستی و کەمتەرخەمی و بێهۆشی، ڕەخنەی توندو گورچکبڕیشی تێدا لێگرتوون و، چاوپۆشیی لە کەموکورتیەکانیان نەگرتووە.

محەمەدی حاجی حسێن ئاغای تەهازادە، لە (بۆ ئیدارەخانەی خۆشەویستی غەزەتەی "ژیان")[32]دا، ڕووی لە خەڵك کردووەو وتوویە: (( ڕجا لە مونتەخیبەکان ئەکەین و ئۆباڵی ئەم میللەتە مەظلوومەیان بەئەستۆ بێ، کەسانێ ئینتیخاب بکەن کە بتوانێ حوقووقی میللەت و وەطەن موحافەظە بکات و ئێمەیش بخاتە ڕیزەی دراوسێکانمانەوە. صاحێب عەشیرەت، پارەدارو مەئموور مەطلووب نییە، تەحصیل دیدەیەکی دیپلۆماتلی، یەعنی مەئذوونی حوقووق کە واقیفی ئوموووری خاریج و داخیل و بە لیسانی عەرەبیش موتەکەللیم و موجەڕڕەبول ئەطوار بێت، ئینتیخاب بکەن کە لە سیاسەتی دنیاو حکوومەتەکە خەبەردار بێت)). (( وەکیلیك عالم نەبێ و ئیقتیداری هەموو مودافەعەو تێکۆشینی نەبێ، ناتوانێ میللەت بە تەواوی تەمثیل بکات، مودافەعەی بکات و نەواقیصاتی ئیکمال بکات)).

لە ( بە مومناسەبەتی ئینتیخاباتی تازەی مەبعووثانەوە، چەند قصەیەکی ڕەق، ئەمما خۆش)دا، کە مەبەست دووەم خولی ئەو هەڵبژاردنەیە (١٩/٥/١٩٢٨-١/٧/١٩٣٠)[33]، ئاوا خەڵك وریا کراوەتەوە کە کەسانی شیاو هەڵبژێرن: (( ئەی میللەت، ئەی برادەرینە قصەی ڕاستتان عەرض بکەم ئەم هەموو فیداکارییە، ئەم کیثرەتی ئیشتیاقە، ئەم کۆمەڵە لاف و گەزافە موحەققەق بزانن هەر بۆ مەعاشە مەبذوولەکەیە، هەر بۆ پڕکردنی گیرفانە لە مەسکووکاتی موتەنەوویعە... لەناو خۆتانا ئینسانی فیداکار، وەطەنپەروەر، موستەعید هەیە. زۆر چاك چاو بگێڕە، زەریف وردبەرەوە، لەڕووا دامەمێنە، خزم و ئاشنا تەماشا مەکە. ئەوی بەکەڵکت دێت، ئەوی دەرمانی دەردت ئەکات، ئەوی ئیعتیمادت بە عیلم و سەوییەی هەیە، ئەوی قیمەتی لای تۆ مەعلووم و موجەڕڕەبە، حاصڵی ئەوی حەیات و مەماتی ئەوێی، سەعادەت و فەلاکەتی لەگەڵ تۆدا موشتەرەکە، ئەوە هەڵبژێرە، پرۆغرامی داوا لێبکە، پشت بە یەکێك مەبەستەکە ئاگرت تێبەربداو خۆی لەدوورەوە سەیرت بکات)).

حەقبێژی قصەرەق، لە (قصەی ڕەق وەلەو ڕەقیش بێ، نابێ کەس پێی ناخۆش بێ)[34]دا، هەر دەوڵەمەندیی و پارەداری یا خوێندەواریی بە تاکە مەرجی مەبعووسی دانەناوە، بەڵکە پێی وابووە: ((یەکێ لە هەموو خوصووصێکەوە خۆی لایق نەبینێ و نەزانێ لەم وەظیفەیەدا مەحجووب نابێ، نابێ و حەیفە تەشەبوث بەم وەظیفەیە بکات و ئۆباڵی میللەتێك بخاتە ئەستۆی خۆی و ئیعتیباری خۆی لای میللەتەکە مەحوو بکاتەوە... مەبعووث ئەبێ میللەتپەروەر بێ، صاحێب ئەخلاق و ویجدان و ڕەحم بێ، عالم و زبانزان بێ، مەوقیعی ئیجتیماعیی لای میللەتەکەی ببێ، مەنفەعەتپەرست نەبێ، لە ئیحتیاجاتی میللەت چاونەپۆشێ، بەثەبات بێ، ڕۆحی خۆی فیدای مەنفەعەتی میللەت بکات و بتوانێ موجادەلە لەگەڵ ئەو پیاوە تەحصیل دیدانە بکات کە لەو مەجلیسەدا موجادەلەو سەعی بۆ وەطەنی خۆیان ئەکەن، چونکە هەموو ئەیزانین لەومەجلیسەدا حەیات و مەمات بەش ئەکرێ، هەر میللەتێك مەبعووثی ببێ، بەرحەیات ئەبێ. عەکسی چاك بێ، مردن بەشیەتی)). (( ئەمرۆ وەظیفە نییە کە لە وەظیفەی مەبعووثی موهیمتر بێ. وەکوو وەظیفەی تر نییە هەر موقابیل بە شەخصێك مەحجووب بێ. مەحجووبیی مەبعووثی، موقابیل بە میللەتێکە. مەبعووث، موقتەدیرو زبانزان و عالم و صاحێب ویجدان و بەحەمییەت بێ، میللەتێك بەرز ئەکاتەوەو وڵاتێك مەعموور و ئاوەدان ئەکات. خوانەکردە عەکسی ئەمە بێ، میللەتێك دوا ئەخات و وڵاتێك وێران ئەکات و، خۆشی ڕەزیل و بێحورمەت ئەبێ)).

---

[32] "ژیان"، ژ١٠١، ل٢.

[33] "ژیان"، ژ١٠٤، ل١-٢.

[34] عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط٥، ج١٠، بيروت، ١٩٧٨، ص٢٩٩.

لە (نائیبو واجیباتی)[٣٥]دا، بەم شێوەیە ئەركو داواكاری ڕووبەڕووی مەبعووثانی كورد كراوەتەوە: (( ئەبێ بزانین هەموو قەوانینو نیظاماتی حكوومەت تا ئێوە تەصدیقی نەكەن، ناكرێ. وە لەم خوصووصەوە مەسئوول، ئەم مەجلیسەی ئێوەیە... كوللی مەندووبێك لەطەرەف ٢٥ هەزار كەسەوە تەوكیل كراوەو، حوقووقی ئەم ٢٥ هەزار كەسە تەودیعی ئۆباڵی ئەو كراوە... ئەبێ بزانن كە دائیما هەریەكێك لە ئێوە پەنجا هەزار چاو چاوەڕوانی خدمەتو فەعالییەتی ئەكات)). (( ئەمە ٣ دەورەی ئیجتیماعییەی موهیممی نیابییەیان تێپەڕان، كەچی هێشتا میللەت لە ئێوە بەتەواوی سەعییەكو فەعالییەتێكی نەدی)).

كار بەوە گەیشتووە كە "ژیان" لەبەر شڕیی حاڵی كوردو دواكەوتوویی وڵات، بە زمانێكی پڕ لە سۆزو پاڕانەوە دەستەودوائێنی مەبعووثەكانی ببێ. لە (لەمەودوا ئومێدی قەویمان بە مەبعووثەكانمانە)[٣٦]دا، وتراوە: (( ئەمجا ڕجاو ئیستیرحامیان لێ ئەكەین كە ئیتر ئەبێ بۆ تەرەقیو تەعالیی میللەتەكە لە دەرەجەی ئیمكاندا سەعیو جەهد بفەرموون. لەخوصووص مەعاریف، تیجارەت، صیحەت، ڕێگا، وەسائیطی نەقلییە، زەراعەت، صەنایعو گەلێ ئەسبابی تەرەقیی ترەوە مەحروومین، بۆ ئیستیكمالی ئەم نەواقیصانە یەگانە ئەمەلمان ئیتر بەمانە، لە هەموو خوصووصاتێكمانەوە ئەمان مەسئوولن)).

لە (بۆ وەكیلە موحتەرەمەكان)[٣٧]یشدا، گەرمتر وتراوە: (( ئەی وەكیلانی میللەت! ئەی ئەو ذاتانەی كە موقەددەراتی میللەتێكیان تەودیع كراوە! ئەی ئەوانەی كە ئەم وەظیفە موقەددەسە، موهیممە، حەیاتییەیان قوبووڵ كردووە! ئەی ئەو شەخصانەی میللەت موقابیل بە هەموو چاكەیەكیان تەقدیرو خراپەیەكیان مەسئوولیان ئەكات!... لە دەورەكانی كەدا ئەوی ئیشێكی كردبێ و حیسابێكی دابێ بە میللەتەكەی خۆی، هەر مەعالی ئەمین زەكی بەگ وەكیلی موحتەرەممان بوو.

بەڵام تووخودا! ئێوە هیچ بە عومووممی زانیوتانەو لێكتان داوەتەوە كە چە وەظیفەیەكی موقەددەسو حەیاتیتان تەودیع كراوەو كردووتانەتە ئەستۆی خۆتان؟ عەجەبا نازانن وەطەنەكەتان لە چە حاڵێكایە، غەیری حوقووق لە هەموو ئاثارێكی عیمرانو تەرەقی لە مەعاریف، صەنایع، تیجارەت، زەراعەت، ئیقتیصادییاتدا چەند مەحروومە؟ وە ئەگەر هەروا بمێنێتەوە، چەند مەحكوومی مردنە. وە نازانن بۆ ئەوەی بژی، تەرەقی بكات، حوقووقی چنگ كەوێ، هیواو ئومێدی هەر بە ئێوەیە؟ ئێوە ئەبێ بزانن كە ئینتیخابكردەی میللەتێكی یەك ملیۆن نوفووسینو لەدواتانەوە پشتیوانێكی موهیمو بەقووەتی وەكوو ئەم میللەتە هەیە... موقابیل بەم وەظیفە موهیممەیەتانو لەحاڵێكا كە ئەزانن میللەتەكەتان ئەمەندە دواكەوتووەو ئەبێ فەوقەل حەد سەعیی بۆ بكرێت، كەچی مەعەل ئەسەف هەتاكوو ئێستا نە لە مەجلیسداو نە لە خاریجەوە بە نەشرییاتو تەشەبوثات كەس خدمەتێكی لە ئێوە نەدیو فەعالییەتێكتان نەنواندو تەئمینی یەكێ لە مەقاصیدانی میللەتان نەكرد)). (( ئیستیرحام ئەكەین ئەم مەعرووضاتەمان بە شتێكی خراپ تەلەقی نەكەنو بزانن میللەت ئیتر بەبەریەوە نەماوەو لەتاوانا هاوار ئەكاتو لە ئێوە زیاتر كەسێكی كە شك نابات. ئیتر ئەبێ لەنەظەر میللەتەكەدا خۆتان ڕووسوور بكەنو، با دائیما میللەت بە موقەددەسی ناوتان بباتو ئیسمتان بە شەرەفەوەو بە زەڕكەفتی ئاڵتوون بنووسرێ. ئەبێ ئەمجارە بە قەطعی بەئیتیفاقو یەكزبانییەوە بۆ ئەم میللەتە مەظلوومەتان سەعیو هیممەت بفەرموون... بۆ ئەوەی لەگەڵ میللەتی عەرەبو حكوومەتی عیراق وەكوو برا بژین، بەقەد ئیمكان بۆ ئیكمالی نەواقیصاتمانو بۆ تەئمینی ئەسبابی تەرەقیمان هەوڵ بفەرموون)).

"ژیان"، كە گەیشتووەتە تینیو، لە سستیو بێدەنگیی مەبعووثە كوردەكان بێزار بووە، هاتووەتە دەنگو بەتوندی ڕەخنەی لێگرتوون. لە (نائیبو واجیباتی)دا، مەبعووثەكانی كوردی لەگەڵ هی لیواكانی باشووردا، كە

---

[٣٥] "ژیان"، ژ٨٧، ل١-٢.

[٣٦] "ژیان"، ژ١١٥، ل١-٢.

[٣٧] "ژیان"، ژ١٦٤، ل١-٢.

لە پێویستی خەڵکی ناوچەکانیان کۆڵیونەتەوەو حکوومەتیان ناچارکردووە جێبەجێی بکات، بەراورد کردووەو، پێی وتوون: (( کەچی هێشتا زۆر لە ئێوە ئەمەندە مەراقی نەکردووە لە داخلی مەنطیقەی ئینتیخابیەکەی خۆیا گەشتوگوزارێ بکات، ئیحتیاجاتو ضەروورەتی میللەتەکە تەدقیقو بۆ ئیکمالی نەواقیص تەشەبوثیك بکات)). نموونەی بۆ بێئاگاییان هێناوەتەوە: (( وەقتێ بێ لێکدانەوە کە دەستی تەصویتیان بۆ قانوونی (ڕەسمی فەواکیەو ئەثمار) هەڵبڕی، ئەبوایە بتانزانیایە کە فەرمانی ئیفلاسیو مەحووبوونەوەی میللەتێك ئیمضا ئەکەن)). ئەمجا داوای لێکردوون: (( هەمووتان دائیما موتتەفیق عەینی وەکوو ڕۆحێك، جیسمێك حەرەکەت بکەن. ئەم نوقصانانەو ئیحتیاجاتی میللەتەکەی ئەیبینن ئیرشادو تەوصییەی حکوومەتی بکەنو، ئەگەر وا بەونەوعە ئیتیفاقو شارەزای مەناطیقی یەکتری بن، ئەتوانن دایما لە مەجلیسا کیتلەو پارطیکی موهیمو بەقووەت تەشکیلو ئیحتیاجاتی میللەتەکە بە ئەکثەرییەت بە حکوومەتی ئیکمال بکەن. وە میللەتەکە لە ضەرەرو زیان موحافەظەو ویقایە بفەرموون. ئەوسا میللەت بە کەماڵی جیددییەتەوە فەخرتان پێوە ئەکاتو بە موقەددەستان ئەزانێ)).

لە (خیطابێکە موقابیل بە هەموو کورد)[38]دا، توندتر سەرکۆنەی مەبعووثەکانی کوردی کردووە: (( ئنجا کەوابوو بۆ ئەم جێگایە پیاوی فەعالو موقتەدیر، وەطەنپەروەرو میللەت خۆشەویست بەعەمەل دێ. ئەمڕۆ لیواکانی کورد دواکەوتووی هەموو عیراقە، ئەمیش بە واسیطەی مەبعووثەکانمانەوە بوو، چونکە ئەو مەبعووثانەی کە لە ئەووەڵ دەورەدا ئینتیخابمان کردن، هەمووی نا، فەقەط بە ئەکثەرییەت هیچ ئەوصافێکی مەبعووثیان تیا نەبوو، پیاوی ئەو مەجلیسە نەبوون. هەریەکەیان بۆ مەنفەعەتی خوصووصیی خۆیان مەنفەعەتی عموومی میللەتەکەیان واز لێهێنابوو. بۆ خاطری خۆیان گەورە بن، هەریەکە ئینتیسابی کردبوو بە یەکێ لە وەزیرەکانو پیاوە بەدەستەکانی ترەوە. عادەتەن وەکوو مادوونێکی ئەوان تابیعی هەموو ئەفکارو ئەوامیریان بوون. هەتا نەتیجە وا دوایان خستینو لە هەموو ئەسبابێکی تەرەقی مەحروومیان کردین... لازمە عەقڵمان بێتەوە سەر، هەموو ئەهالیی لیوایەك بە جیددی تێبکۆشین کە بۆ ئەم جێگایە پیاوی باش، فەعال، موقتەدیر، میللییەتپەروەرو وەطەن خۆشەویست ئینتیخاب بکەین... ئیتر خۆتانو غیرەتتان، (حب الواطن من الایمان) ئەبێ بە دڵو بەگیان بۆ وەطەنەکەمان هەوڵ بدەین)).

بەڵام لەناو ئەوانەدا، ئەمین زەکی بەگی وەك نائیبێکی چالاكو ئیشکەرو دڵسۆزی میللەتو نیشتمان ناساندووەو، ستایشی هەوڵەکانیی کردووە[39]. لە (خولاصەی دوو تەقریری مەبعووث ئەمین زەکی بەگ)[40]دا، ڕووی ڕاستی کەموکوڕیەکانی خوێندنو مەعاریف لە کوردستان خراوەتە بەردەم مەجلیسی مەبعووثان. ئەو زاتە، بە کۆمەڵێك ئامارو بەڵگەی دروستەوە، داوای کردووە لیژنەیەکی زانستی بۆ دانانو وەرگێڕانی کتێبی خوێندن بە کوردی پێك بهێنرێو، بەڕێوەبەرێتییەکی مەعاریفی سەربەخۆ بۆ شارە کوردیەکان دروست بکرێو، موفەتیشی کورد بۆ ناوچە کوردنشینەکان دابمەزرێنرێ.

"ژیان"، لە چەند ژمارەیەکی تریدا، چالاکیو کۆششی مەبعووثە کوردەکانی بۆ ئاگادارکردنەوەی خوێندەوارانو خەڵك، بڵاوکردووەتەوە؛ لەوانە، (تەقریری مەبعووثە کوردەکان بۆ وەزارەتی مەعاریف)[41] کە داوای ژمارەیەك لە مەبعووثی کوردە لە وەزارەتی مەعاریف بۆ چاککردنو پێش خستنی خوێندن لە کوردستان. ئەوانە داوایان کردووە قوتابخانەی سانەویو هی کچانو خانەی مامۆستایان (دار المعلمین) بکرێتەوەو، لیژنە بۆ دانانو وەرگێڕانی کتێبی خوێندن دابنرێو، دائیرەیەکی مەعاریف لە ناوچەکەدا دابمەزرێنرێ.

---

[38] "ژیان"، ژ١٠٣، ل١.

[39] بڕوانە: طەڵەبی عەفوو، "ژیان"، ژ٩٦، ل٢؛ مەعالی ئەمین زکی بەگ، "ژیان"، ژ١٢٦، ل١-٢.

[40] "ژیان"، ژ١١٨، ل١-٢.

[41] "ژیان"، ژ١١٨، ل٢-٣.

[42] "ژیان"، ژ١٢٨، ل١-٢و، ژ١٢٩، ل١-٢و، ژ١٣٠، ل١-٢و، ژ١٣١، ل١-٢و، ژ١٣٢، ل١-٢و، ژ١٣٤، ل٢-٣و، ژ١٣٧، ل٢-٣.

له (پیاوی عالی و میللییەتپەروەر دائیما لەنەظەر میللەتی ڕووسووره)[٤٢]دا كه به حەوت ئەڵقه وردكراوەتەوه، ڕاپۆرتێكی تری ئەمین زەكی بەگ له دانیشتنی ڕۆژی ١٩٢٨/٨/٣٠ی پەرلەماندا سەبارەت به ناتەواویەكانی مەعاریفی سلێمانی و هەندێ لیوای تر و ڕێگەچارەیان خراوەتە ڕوو. ئەو ڕاپۆرتە، به بەراورد و بەڵگەی حاشاهەڵنەگرەوه، ئەوەی تێدا سەلمێنراوه كه حكوومەت به یەك چاو نەیڕوانیوەته مەعاریفی هەموو لیواكانی عیراق و، شاره كوردنشینەكان بەگشتی غەدرێكی گەورەیان لەڕووی ژمارەی قوتابخانه و قۆناغەكانی خوێندن و مامۆستا و بودجەی تەرخانكراو و كتێب و كەرەسته و ئامرازی تری پێویستەوه، لێ كراوه. ئەو نابەرامبەرییەیشی، به مایەی كێشەی گەورەتر زانیوه و، بەدووربینییەوه نووسیویه: (( فەقەط لەعەینی وەقتیشا مەمكین نابێ سكووت بكەم لەخوصووص ئەم فەرقه فاحیشەوه كه ئێستا مەوجووده له بەینی مەعاریفیان، چونكه ئیعتیقادم وایه كه ئەمه بۆ موستەقبەل ئەبێ به خەطەرێكی موهیم و غەدرێكی صەریحه بۆ ئەهالی بەعضی لیواكان... ئەم فەرقه زۆره له موستەقبەلا شكلێكی وا پەیدا ئەكات كه ببێ به سووئی تەفاهوم لەبەینی ئەفرادی میللەتەكەدا و، مەعاذەڵلا بەطەبیعەت له جیهەتێكەوه ئەبێ به سەبەبی عەدەم مووەفەقییەت و، له جیهەتێكی ترەوه له دواییدا ئەبێ به سەبەبی تەفەووقی قیسمێكی كەمی میللەتەكه بەسەر قیسمه زۆرەكەی تریا)).

له (ویستنێكی مەشرووع)[٤٣]دا، ڕاپۆرتێكی زۆر گرنگ و مێژوویی مەبعووثه كوردەكان بۆ سەرۆك وەزیرانی عیراق و مەندووبی سامی بڵاوكراوەتەوه. لەوێدا، داواكراوه: لیوایەكی تازه بەناوی (دهۆك)ەوه له قەزا كوردیەكانی لیوای مووسڵ پێك بهێنرێ و، بەڕێوەبەرێتییەكی مەعاریفی كوردی دابمەزرێ و، ئیدارەی لیواكانی سلێمانی و كەركووك و هەولێر و دهۆك یەك بخرێ و موفەتیشێكی گشتیی بۆ دابنرێ و، بودجەی تایبەتیش بۆ ناوچەكه ببڕێتەوه. ئەگەر حكوومەتی عیراق، كاتی خۆی، به عەقڵێكی كراوه و دووربینانه ئەم داوا ڕەوایانەی پەسندو جێبەجێ بكردایه، ڕەنگ بوو ئەم وڵاته ئەو كارەسات و نەهامەتیانەی بەخۆوه نەدیایه كه دواتر تووشی هاتن.

لەسەر ئەو ڕاپۆرته، سەرۆكی شارەوانیی سلێمانی و سكرتێری كۆمەڵی زانستی و چەند گەورەپیاوێك و توجارەكانی شار به نامه و برووسكه پشتگیری و سوپاسی مەبعووثەكانیان كردووه. "ژیان"، له (ئەم ئیمتیازه به كوردەكان بەخشراوه تەطبیقی مەجبوورییه)[٤٤]دا، لەوبارەیەوه نووسیویه: (( ئیستیرحام ئەكەین وەكیلەكانمان بۆ ئەوەی ئارەزووی عموومی ئەم میللەته تەئمین بكرێ، ئەبێ بۆ ئەم مەسئەلەیه بەجیددی سەعی بكەن و لێی ساردنەبنەوه و، بەعەجەلەو به قەطعی ئەم ئیمتیازه له هەموو مەنطیقەی كوردستان تەطبیق بكەن و، ڕجایش له حكوومەت و ئەولیای ئوموور ئەكەین بۆ ئەوەی ئەم وەحدەته هەر باقی بێ، ئیستیرحامنامەی ئەم میللەته و وەكیلەكانمان تەرویج بفەرموون كه نەتیجه حكوومەتێكی گەورەو موتەرەقی و بەناوی عیراقەوەی لێوه بێته وجوود)).

چالاكییەكی تری جەمال بەگی بابانی مەبعووثی هەولێر، له (مەعاریف له ئەلوییەی شیمالییەدا)[٤٥]دا، له مەجلیسی مەبعووثاندا سەبارەت به مەعاریفی كوردەواری بەسەركراوەتەوه؛ لەوڕووەوه كه وەزارەتی مەعاریف بەڵێنەكانی خۆیی بۆ چاككردنی خوێندنی ناوچەكه بەجێ نەهێناوه و، ناوبراو ڕەخنەی له حكوومەت گرتووه كه ((بەرامبەر به ئەولادی شیمال موقەصیرەو موقەصیرێكی تەواویشه)).

"ژیان"، سەروبەر، بایەخێكی تەواوی به دەورو چالاكیی مەبعووثەكانی كورد داوه و، هەواڵ و زانیاریی پێویستی بۆ ئاگاداربوون لەسەر بڵاوكردوونەتەوه و، به ڕەخنه و ڕێنوێنی و دەستەوداوێن بوون هانی داون كاری

---

[٤٣] "ژیان"، ژ١٦٦، ل١-٣.
[٤٤] "ژیان"، ژ١٦٧، ل١-٢.
[٤٥] "ژیان"، ژ١٨٠، ل١-٢.

سوودبەخش و چاك بۆ گەل و وڵاتیان بکەن. بە دووری نازانم، هەڵویستی "ژیان" كاریكی باشی كردبیّتە سەریان و، جووڵاندبنی بۆ هەوڵی مەردانە.

**٢.٢.٣. كۆمەڵایەتی:** گرنگی چەند چەمك و "ژیان"، بە ١٤ وتار، كەوتووەتە بەرچاوخستن و شیكردنەوە و جەختكردنەوەی گرنگیی چەند چەمك و كردەوە و لایەنێكی كۆمەڵایەتی كە بە قازانجی بنیاتنانی كۆمەڵگایەكی دروست و پێشكەوتوو ئەشكێنەوە. جگە لەوە، ٥ وتاری بۆ كێشەی ئافرەت جێكردووەتەوە. بەم شێوەیە:

**٢.٢.٣.١. ئافرەت:** "ژیان"، هەر لە یەكەم دەورەوە، مەسەلەی ئافرەتی كردووە بە بابەتێكی گرنگی خۆی. مستەفا صائیب، لە وتاری چوار ئەڵقەیی تەواونەكراوی (ئافرەت)[٤٦]دا، بە بیرێكی شارستانی و پێشكەوتوو و مرۆدۆستانەوە ئافرەتی هەڵسەنگاندووە و، فەرامۆشكردنی ئەو نیوەیەی كۆمەڵگای، بە هۆیەكی دواكەوتن و نیشانەی ستەمكاری لەقەڵەم داوە. لەلایەكەوە جیاوازیی نێوان ئەم دوو رەگەزەی رەت كردووەتەوە و هەردوولای بە خاوەنی هەمان ماف داناوە: (( ئافرەت جگە لەوەی كە ژنەو ئافرەتە، هیچ فەرقێكی تری نییە لەگەڵ پیاوا. وە پیاویش جگە لەوەی كە پیاوە هیچ فەرقێكی تری نییە لەگەڵ ژنا. پیاو بۆچی خەڵق كراوە، ئافرەتیش بۆ ئەوە ئافەریدەكراوە... ئەگەر ئافرەتیش تائیستا، عەقڵەن و بەدەنەن، لە فەعالییەت و ئیشدا بوایە، فەرقێكی وای نەئەما لەگەڵ پیاوا)). (( چە پیاوێك هەیە كە چاوی كوێر نەبێ و زەرڕەیەك عەقلی ببێ، تێنەگات كە ئافرەتیش وەكوو خوا ئافەریدەی كردووە بۆ جووتیی ئەو، بۆ رەفیق و خۆشەویستیی ئەو، بۆ عەبدو نۆكەرو چێشكەریی ئەوی خەڵق نەكردووە و، ئەویش وەكوو پیاو عەقڵ و چاوو زبان و هۆش و شوعووری هەیە)). (( چونكە بە واسیطەی ئەوەی كە ئافرەت لە ماڵدا حەبس ئەكەن و تەنها بۆ (چێشت لێنان و نوێن داخستن!) ئەیهێنن، قیسمێكی زۆر لەم مەخلووقاتە، لەم میللەتە مەحكوومی مردن و سستی و ئیش نەكردن ئەكەن... شێت كە حەبس كرا، هار ئەبێ. لە بەرئەوە ئافرەت لەم فێڵ و مەكرانەدا مەعذوورە)).

لەلایەكی ترەوە پێخوێندن و ئیشكردنی ئافرەتی بە كارێكی ناچاری زانیوە: (( وەكوو چۆن پیاو خوێندن و تەربییەی لازمە، ئافرەتیش بە ئەمری خوایش ئەبێ بخوێنێ و پێبگات... لە بەرئەوە هەروەكوو خوایش فەرمووێتی، ئەبێ لەگەڵ پیاوا ئافرەتیشمان پێبگەیەنین و فێری صەنعەت و مەعریفەتیان بكەین)). (( كچێك بۆ ئەوەی لە حەیاتدا مووەفەق بێت و پێ بگات، كە شووی كرد لەگەڵ مێردەكەیا خۆش ڕابوێرێ و ماڵەكەی بە رێكوپێكی ئیدارە بكاو، كە منالی بوو بە وێڵ و ئوصووڵ بەخێوی بكات و بیانكات بە ئینسان، ئەبێ نەختێ عەقڵ و مەعریفەتی ببێت كە ئەویش هەر بە مەكتەبەوە ئەبێ)). (( خوا بۆیە ئافرەتی خەڵق كردووە كە وەكوو پیاو ئیش بكات، بجووڵێتەوە، فێری عەقڵ و مەعریفەت و هونەر ببێ، ئیدارەی ماڵ و منال بكات. وە لحاصڵ وەكوو مەخلووقێكی تەواو و كامڵ بژی و بمرێ و ڕابوێرێ. بۆیە ئافەریدە نەكراوە ببێ بە ئالەتی بەردەستی پیاو، ببێ بە چێشتكەرو گسكدەری پیاو، بێ عەقڵ و مەعریفەت بمێنێتەوە و لەذەت و خۆشی لە دنیاو حەیات نەبینێ)). (( ئافرەتێك بۆ ئەوەی بزانێ چۆن ئەژی و چیی ئەوێ لە حەیات، ئەبێ فێری تەربییەو تەعلیم ببێ... هەرچی دینێك هەیە، هەرچی قەوانینێكی مەدەنییە هەیە، هەموو بۆ ژن و پیاو هاتووە و كراوە، عەقڵ و فكر وەكوو بە پیاو دراوە، دراویشە بە ئافرەت بۆ ئەوەی كە وەكوو ئینسان لە دونیادا بژین و ڕابوێرن)).

لە (لێرەدا هیچ ڕیعایەتی ئوصووڵی ژنهێنان ناكرێ)[٤٧]دا، رەخنە لە نەریتی كۆنی ژنهێنان و جۆرەكانی گیراوە و، بۆ پێكەوەنانی خێزانێكی بەختیار، دوویات كراوەتەوە كە (( لازمە لە ژنهێنانا ئەووەڵ دەفعە تەماشای هاوكوفی بكرێ... ئەبێ كچ و كوڕەكە ئەخلاقیان، سەوییەیان، عیلمیان، ثەروەتیان، لە هەموو زیاتر عومریان

---

[٤٦] "ژیان"، ژ٩٣، ل٢و، ژ٩٤، ل١-٢و، ژ٩٦، ل١-٢و، ژ٩٧، ل٢.

[٤٧] "ژیان"، ژ١٢١، ل١-٢.

وەك یەك بێ. ئەگەر ئەم موناسەبەتە مەوجوود نەبێ، موحەققە هەتاكوو سەر بەیەكەوە نابن و هیچ قووەتێ بەیەكیانەوە نانووسێنێ)).

لە (مەكتەبی كچان و صنفی پێنجەم)[48]دا، فێربوون و پێ‌خوێندنی كچان هێنراوەتەوە بەر باس و، بەم بایەخەوە قسەی لێكراوە: (( ئەمڕۆ لە هەموو كەسەوە مەعلووم بووە بۆ ئەوەی بەشەر بەتەواوی بەرزو بڵندبێتەوە، پێویستە قیسمی ژنیش وەكوو پیاو هەوڵ و تەقەلا بداتو، نابێ وەكوو پێشوو هەر لەماڵەوە بێ‌ئیش، بێ‌كار دانیشێ و عاطل بمێنێتەوە. بۆ ئەوەی ژنیش بێتە مەوقیعی ئیجتیماعییەوەو لە بەری تێكۆشانی خۆی و میللەتەكەی موستەفید بێ، ئەبێ ئەویش وەكوو پیاو لە منالییەوە بخوێنێ و لە عیلم و مەعریفەت و صەنایعدا مەعلووماتدار بێ)). (( ئەو میللەتانەی كە ئەمڕۆ بەرزو بڵند بوونەوەو تەكامولیان كردووە، دەمێكە ئەم ئوصووڵە تەعقیب ئەكەن. نەتیجە ئەمڕۆ لە هەموو ئەوروپا، ئەمریقاو لە قیسمێكی میللەتە موتەمەددینەكانی شەرقدا ژن و پیاو وەكوو یەك تەحصیل ئەكەن و، بۆ ڕابواردنی حەیاتی ئیجتیماعییەیان موجادەلە ئەكەن)).

لە (ئیتر ئەبێ بە ئافرەتەكانیشمان بخوێنین)[49]دا، دیسان خوێندن وەكوو پێویستییەكی گیان و ژیان ڕوون كراوەتەوە: (( هەتاكوو ئێستە ئەهالییەكەمان وا حاڵی بووبوون كە خوا قابلییەتی نەداوە بە ئافرەت و، بۆ ئەوە خەڵق نەكراوە كە پێی بخوێنرێ، تەنەوور بكات، عالیم بێ، ئیستیفادەی لێ‌بكرێ. لەبەرئەوە ئافرەتەكانمان كە نیوەی مەوجوودییەتەكەمان تەشكیل ئەكەن، هەروا نەخوێندەوار، بێ‌تەحسیل و بێ‌مەزایا ماونەوەو، بەسەر پیاوەكانمانەوە بوون بە بارێكی گران. وە غەیری ئەمەیش ئەولادەكانمان كە لەماڵەوە زۆرتر دایكیان تەربییەو چاودێرییان ئەكات، لە بەر جەهالەتی دایكەكانیان خراپ گەورەو تەربییە ئەكرێن و، ئەخلاقێكی باشی عائیلەوی وەرناگرن كە موعەللیمەكانیان بتوانن لە مەكتەبا لەسەر ئەو بناغە باشە چاكتر پێیان بگەیێنن)). (( ئافرەتیش مادام بە بەشەر حیساب ئەكرێ تەشەكولاتی بەدەنییەی وەكوو پیاوە، ئەگەر پێی بخوێنرێ و تەربییە بكرێ قابیلە هەموو شتێك فێرببێ، فەعال بێ و خدمەتی وەتەن و میللەتەكەی بكا)). ((ئینجا مادام ئێمە لەم عەسرەدا هێشتا لە دەورەیەكی ئیبتیدائیداین و مادام زانیومانە كە هەموو سەعادەتێك بە خوێندن و بە بڵاوكردنەوەی عیلم و عیرفانەوە پێك دێت، پێویستە هەوڵ بدەین و، بۆ ئەوەی پێش كەوین پێویستە قیسمی ئافرەتیشمان عاتیل نەهێڵینەوەو، بەعوموومی وەكوو كوڕەكانمان بە كچەكانیشمان بخوێنین و، ئەم قیسمە زۆرەیشمان بۆ یارمەتیی پیاوەكانمان بهێنینە مەیدانەوە)).

لە (دواڕۆژی وڵاتمان بە چی باش ئەبێ: پێشكەوتنی ژنانمان)[50]دا، دواڕۆژی ئاسوودەو پێشكەوتووی وڵات بە بەشداری و هاتنە مەیدانی ژنانەوە بەستراوەتەوە: (( وتوویانە كە ژنە لە هەمووشتێك زیاتر دەبێتە سەبەب بۆ پێشكەوتنی قەوم. وە پێشكەوتنی وڵات بەهۆی تەرەقیكردنی ئەوانەوە دەبێ، چونكە ئەوان مەركەزی ئیشن و ئەوان پیاوانی موستەقبەل دەخەنەوەو تەربییەی ئەدەن)). ((ژنی فەقیر كەوا لەلای ئێمە ڕۆژ هەتا ئێوارە لەناو چواردیواریماڵەكەیدا دانیشتووەو ئاگاهداری دنیا نییەو، هەمووشتێك نازانێت غەیری ئیشی ماڵەكەی نەبێت كە ئەویش چێشت لێنان و جل شتن و گەسكدانێكی عادییە كە لەبەر بێ‌عیلمی و نەزانینی خۆی ئەویش بەتەواوی جێبەجێ ناكا)). (( بەخوا ئەمە حەقی ژن نییە. ژنیش هەروەكوو پیاو حەقی خوێندن و حەقی كاسبیكردنی هەیەو حەقی ڕەئیی هەیە لەناو كۆمەڵ (موجتەمەع)دا، بەڵام لە دائیرەی ئەدەب و ئوسووڵدا)). (( ئەی ژنە موحتەرەمەكانی كوردەواری، وەتەن! چاوەڕوانی ئێوەیە كە خوێندەوار بن و منداڵەكانتان بە تەربییەیەكی عەسری و باش پێیان بگەیێنن، چونكە ئەوانن ئەبنە پیاوی پاشەڕۆژی وڵات و میللەت)).

---

[48] "ژیان"، ژ۱۸۹، ل۱-۲.

[49] "ژیان"، ژ۲٤٤، ل۱-۲.

[50] "ژیان"، ژ۲٤۷، ل۳-٤.

### ٢ . ٢ . ٣ . ٢ . هاندانی پارەداران بۆ چاکەکردن و کۆمپانیاکردنەوە:

لە (پیاوی گەورە کێیە؟)[٥١]دا، هانی دەوڵەمەندانی کورد دراوە کاری چاکە بکەن بۆ خێری خەڵك، تا وەك یادگاری نەمر لەدوای خۆیان بۆیان بمێنێتەوە: (( پیاو لازمە تەئریخ گەورەی بکات.. ئەوی پیاو گەورە بکا ئەفعال و ئاثاری خەیرییەو موفیدەیە کە بۆ میللەتەکەی و یا بۆ بەشەرییەت کردوویّتی)). (( فەرەضەن وەکوو سێر خضووری لە بەغداد کردی، لێرەیش یەکێك و یا کۆمەڵێك مەدرەسەیەکی لەیلی ئەیتام بکاتەوە. موحەقەق ئەم خدمەتەی لە خدمەتی یەکێ لەم ئەعاظیمەی کە ناومان برد، کەمتر نابێ و، بەم نەوعە ناوی گەورەیی و ئەبەدی بۆ خۆی پەیدا ئەکات و الی الابد لای میللەتەکەی بە موقەددەس و حەتتا نەسلاونەسلیش موحتەرەم و بە گەورە ئەزانرێ)).

لە (لازمە ثەروەتدارەکانمان لێرەدا چەند شیرکەتێکی ئۆتۆمۆبیل تەشکیل بکەن)[٥٢]دا، بۆ هشێتنەوەی سەرمایە لە شارەکانماندا، وتراوە: (( لازمە توجارەکانمان و صاحێب ثەروەتەکانمان ئەم مەسئەلەیە بهێننە بەرچاویان... یا هەرکەسە بۆ خۆی چەند ئۆتۆمۆبیلێك، یاخۆ بە شیرکەت چەند قۆمپانیایەکی ئۆتۆمۆبیل تەشکیل بکەن... ئەوسا پارەکەمان چنگ خاریج ناکەوێ، لە لیواکەی خۆمانا ئەمێنێتەوە، وە حەتتا بەم سەبەبەوە ئەتوانین قیسمێك ثەروەتی خاریجیش جەلب بکەین)).

لە (ئیقتیصادییات-شیرکەت)[٥٣]دا، هەر لەوبارەیەوە، نووسراوە: (( ئەسبابی تەرەقییاتی هەموو میللەتێك لە هەمووشتێك زیاتر ئیقتیصادییاتێتی)). باس هەر لەسەر تووتن بووە، کە ئەوکاتە گرنگترین بەرهەمی کشتوکاڵی کوردستانی پێك هێناوە؛ لەبەرئەوەی بێ بەرنامەو نارێکوپێك کڕراوەو فرۆشراوەو ساخ کراوەتەوە، نە تووتنەوان و نە قەڵەمچییەکان خێری وایان لێ نەدیوەو، ساڵ بەساڵ لە شکان و زیاندا بووە. بۆیە پێشنیار کراوە: (( با بۆ توتونەکەمان شیرکەتێك تەئسیس بکەین، بەڵکوو وەکوو ئێستا کە ڕۆژ بە ڕۆژ دوچاری ئەبین، یا ثەروەتەکەمان مەحوو نەبێتەوەو ئیفلاس نەکەین و، بەوسایەیەوە موحەقەق زووڕاع، مەللاك، صاحێب پارەکانمان، حاصڵی میللەتەکەمان دەوڵەمەند ئەبێ... وە کە ثەروەتمان بوو و موقابیل بە مەصرەفەکەمان واریداتێکی دائیمیمان تەئمین کرد، ئەوسا ئەتوانین بۆ حوصووڵی هەموو ئەسبابێکی تەرەقی هەوڵ بدەین و لە مەملەکەتەکەمانا تەئسیس بکەین)).

### ٢ . ٢ . ٣ . ٣ . سنووقی کۆمەککردن:

لە (میللەتێك بە حیسسی تەعاونی ئەفرادی میللەتەکەی لەگەڵ یەکتریدا تەرەقی ئەکات)[٥٤]دا، پێشنیاری دانانی سنووقێکی هاوکاری کراوە بۆ دەستگیرۆیی‌ی هەژاران و ئیش بۆ دۆزینەوەیان. کاری لەوچەشنەی ئەرمەنەکانی بەغدا بە نموونە هێنراوەتەوە: (( وتوویانە هەر عەقڵە لە خەسارێك. ئەگەر ئێمە لە صەد خەسار عەقڵێکمان وەرگرتایە، ئینتیباهێکمان بهێنایە، ئێستا تەرەقی‌ی ئێمە فەوقی هەموو میللەتێك ئەبوو. هەموو میللەتێك ئەفرادی میللەتەکەی لەگەڵ یەکتریدا حوسنی موعاوەنەتی هەیە، ئیللا ئێمە نەبێ)). (( بەڵام هەموو میللەتێك بە سائیقەی ئینقیلاب و تەضییقاتێکەوە ئینتیباهی هێناوە، ڕێگای تەرەقی و تەعالییان دۆزیوەتەوە و بەسەر ڕێگایەکا ئەڕۆن کە دائیما بە مەنزڵی تەرەقی و مەقصوودیان ئەگەیەنێ. کەچی میللەتی ئێمە لەگەڵ ئەم هەموو ئینقیلابەدا کە دیمان، لەگەڵ ئەم هەموو فەلاکەتەدا کە بەسەرمانا هات، داخی بەجەرگم هیچ ئینتیباهێکمان نەهێنا، بە هیچ مەقصەدێك نەگەیشتین و دائیما بەرەو تەدەننی ئەڕۆین!)).

---

[٥١] "ژیان"، ژ٨٨، ل١-٢.

[٥٢] "ژیان"، ژ١١٧، ل١-٢.

[٥٣] "ژیان"، ژ١١٠، ل١-٢.

[٥٤] "ژیان"، ژ١٠٥، ل١-٢.

(( ذاتەن میللییەت، وەطەن خۆشویستن، ئیستیقلالییەت بۆ ئەوەیە کە میللەتەکە عومووماەن دەوڵەمەند، حوڕ، مەسروور بژی.. . ئینجا ئێمەیش ئەگەر میللییەتمان ئەوێ موحافەظەی بکەین و وەطەنەکەمان خۆش ئەوێ، ئەبێ وەکوو میللەتەکانی کە بۆ ئەوەی ئەفرادی میللەتەکەمان بێئیش نەمێنێتەوە، هەموو موفید، فەعال و ساعی بێ، ئەبێ وەکوو ئەوان ئەم ئوصووڵە تەعقیب بکەین و، بە ئایەتی (لیس للانسان الا ماسعی) عەمەل بکەین و، لە هەموو شارێك، قەضایەك و ناحیەیەکدا صندووقێکی تەعاونمان ببێ، ئەو پارەیەی کە ئەیدەین بە سواڵکەرە مل قەویەکانمان و تەمەڵی پێ قەڵەو ئەکەین و بە شۆرباخواردن ڕایانئەهێنین، تەسلیمی ئەو صندووقەی بکەین و فەقیرو بێئیشەکانمان هەرکەس بەقەدەر ئیقتیداری خۆی بەوپارەیە سەوقی سەر ئیشیان بکەین، لە وەطەنەکەمانا پیاوی عاطل و تەمەڵ نەهێڵینەوە بە نەوعێك کە ئەوانیش جوزئێکی عاطل نا، بەڵکە هەریەکەیان بکەین بە شەخصێکی فەعال و موفید کە ئەوانیش بتوانن موعاوەنەتی کەسێکی کە بکەن)).

**٢. ٢. ٣. ٤. خێزان:**

ڕەشید نەجیب، لە زنجیرە وتارێکدا، لە خێزان پێکەوەنان و منالٌ بەخێوکردن و چەند لایەنێکی تری پەیوەست بە کۆمەڵگاوە دوواوە. لە (منالٌ بەخێوکردن و بەرهەمهێنانن)[٥٥]دا، بە ئامار سەلماندوویە کە سلێمانی لەماوەی ١٠٠ ساڵی ڕابردوودا تا ئەوکاتە دانیشتوانی زیادی نەکردووە، لەبەر نەك هەر گرانی و شەڕو ژن نەهێنان و ڕشانەوە، بەڵکە خراپیی جۆری منالٌ بەخێوکردن و بەرهەمهێنان کە بووەتە هۆی لەناوچوونی ژمارەیەکی زیاتری منالان. وتوویە: (( هەروەك قووەتی عموومییەی میللەتێك موحەصەڵەی قووەی فەردییەی ئەفرادەکەیەتی، ضەعیفێتیی میللەتیش نەتیجەی بێهێزی، کەموکورتیی ئەفرادیەتی.. . لەوساوە بەشەر لە ماضیی خۆی بەرداوەو ڕوو بە ئیستیقبالی تێئەکۆشێت، تەکثیری نوفووس، تەربییەی ئەولاد.. بووە بە یەکێ لە عومدەی ئەساسییەی ژیان و بە هەدەف و جەهدو تێکۆشین)).

لە (ژنهێنان، بناغەی ژیان)[٥٦]دا، وای بۆ چووە کە (( ژین یەعنی عائیلە، عائیلەیش یەعنی ژین. ئەم دوانە کەلیمەیەکی موتەرادیفن و یا جووتێکن کە زادەی ئەمانە سەعادەتە.. . ئەگەر بێتوو میللەت قابیلی تەشبیە بێت بە خانوویەك، بێشوبهە تەشکیلی عائیلەش لایقە بکرێ بە بناغەی)). (( بیلخاصە ئیحتیاجی ئیزدیواج تەنها بە سائیقەیەکی ئیجتیماعییەوە نییە، بەڵکوو زیاتر نەتیجەی ضەروورەتێکی فیزیۆلۆژییە. ئەصڵی نوقطەی موهیم، شکل و نەوعی واسیطەی ڕەفعی ئەم ئیحتیاجەیە)).

لە (موحافەظەکاری، عەنعەنەپەرستی لە حەیاتی ئیجتیماعییەماندا)[٥٧]دا، جەختی کردووە کە نابێ هەر پابەندی نەریتەکانی ڕابردوو بین، بەڵکە ئەبێ بۆ ئێستا بژین و ڕوومان لە دواڕۆژیش بێ: (( بەڵێ بەو ئیعتیبارەی کە کەموزۆر جۆرێکی باوك و باپیرمانین، قیسمێکی ماضین، مەربووطی عەنعەنەی ڕابوردووین. فەقەط لازمە لەعەینی زەماندا لە بیرمان بێت لەپێش هەمووشتێکدا ئێمە ئەم ڕۆژەین، پشتمان کردۆتە ڕۆیشتوو و ڕوومان لەپێشەوەیە)). بۆیە داوای کردووە ئامرازو بیرکردنەوەی ئێستامان پەرە پێبدەین، تا بتوانین گۆڕانکاری بکەین و ئاگاداری پێشکەوتنەکانی دنیا بین.

عەبدوڵلا عەزیز ، لە (هەرزەکاریت بپارێزە، پیریت خۆی دوورئەخاتەوە)[٥٨]دا، هەرزەکاریی و لاویی بە گەنجینەیەکی نەبڕاوە بۆ قۆناغی پیریی مرۆڤ خۆیی و بۆ کۆمەڵگایش داناوەو، پێی لەسەر ئەوە داگرتووە کە لاوان بە خۆڕاگریی و پاراستنی بنەماو بنیاتی لاوی خۆیان ڕابهێنن. ئەو بایەخە کۆمەڵایەتییە لە (چاودێریی و یارمەتیی منالان)[٥٩]یشدا دەرکەوتووە، کە پێشنیاری تێدا کراوە، بە لاساییی کۆمەڵی پاراستنی منالان لە

---

[٥٥] "ژیان"، ژ١٣٤، ل٣و، ژ١٣٥، ل٢-٣.

[٥٦] "ژیان"، ژ١٤١، ل١و، ژ١٤٢، ل١و، ژ١٤٣، ل١-٢.

[٥٧] "ژیان)، ژ١٤٦، ل١-١٢و، ژ١٤٧، ل٢.

[٥٨] "ژیان"، ژ١٤٤، ل٢و، ژ١٤٥، ل٢و، ژ١٤٨، ل٢-٣.

[٥٩] "ژیان"، ژ١٥٩، ل١-٢.

بەغدا، یا شتێکی وا بکرێ، یان لقێکی لێبکرێتەوە، چونکە (( بۆ ئەوەی لەم عەصرەدا ئینسان بژیو خدمەتی وەطەنو میللەتەکەیش بکات، ئەبێ لە میعادو لە طاقەت زیاتر ئیش بکاتو تێکۆشێ. ئەمڕۆ غەربییەکان لەگەڵ ئەوەدا کە تەکامولیان کردووەو ئیحتیاجیان نەماوە، بەلام بۆ ئەوەی چاکتر بژینو لەیەکتری دوانەکەون، موتەمادی بێ ئیفاتەی وەقت هەوڵ دەدەنو بێئیش وەقتیان ضایع ناکەن)).

## ٢. ٢. ٤. هەڵوێست بەرامبەر بە بریتانیا:

ئەم دەورەیەیش، کوردو، هیچ نەبێ مونەووەرانو سەرانی، بە بوونی کاربەدەستانی بریتانیا لە عیراق، وەك سێهەم لایەنی دەسەلاتدار لەنێوان خۆیو حکوومەتی عەرەبیی عیراقدا، خۆشحاڵ بوونو، هێشتا چاوەڕوانی دەسکەوتی زۆریان لێکردوون.

لە (چاکە لە فکر ناچێتەوە)[٦٠]دا، ستایشی کۆرنوالیسی ڕاوێژکاری وەزارەتی داخلییەی عیراق کراوە، کە ((بۆ کوردستانیش لە سەعیکردن وەکوو قوصووری نەکردووە، هەموو فیداکارییەکی ئیختیار کرد)). لە (بەموناسەبەتی موفارەقەتی فەخامەتی مەندووبی سامیی عیراق سێر هێنری دۆبسو تەعیینی فەخامەتی گلبەرت کلاتیۆنەوە)[٦١]دا، بە پێداهەڵدانەوە وتراوە: (( غەیری ئەمەیش، بۆ ئەوەی کوردەکانی جنووبی لە تەرەقییات مەحرووم نەبنو عەنعەناتی میللییەیان باقی بێ، بە واسیطەی ئەم مەسئەلەیەوە بە قەراری عوصبەتول ئومەم، بە واسیطەی تەشەبوثاتو هیممەتی موشارئیلەیهی سێر هێنری دۆبسەوە بەعضی ئیمتیازاتیان درایە کە لەگەڵ عیراق بەیەکەوە بژین)).

لە (تەشەکوری گەورەکانمان ئەکەین کە وەفاو ڕاستێتیی کوردیان ئیثبات کرد)[٦٢]دا، وردتر بارودۆخی چەند ساڵی ڕابردوو ڕوون کراوەتەوەو، ئینگلیز وەکوو ڕزگارکەرو دابینکەری دواڕۆژی ئاسوودەی کورد ناسێنراوە: (( کوردستانی لای خواروو کە ئەمڕۆ لەگەڵ عیراقا بەیەکەوە ئەژین، هەموو ئەیزانین کە لەپێش شەڕی گەورەدا–حەربی عوموومیدا– لە چە حاڵێکی خراپا بوو. وەکوو لە مەدەنییەت بێبەش مابووینەوە، ئەحواڵێکی خۆشیشمان نەبوو و سەربەست نەبووین، حقووقێکیشمان نەدرابوویە. لەگەڵ ئەم حاڵەیشدا کە شەڕی گەورە دەستی پێکرد، ئێجگاری فەوتاینو، بۆ ئەوەی نەمرین قووتێکی لایەمووتمان چنگ نەئەکەوتو خواردەمەنی لە ولاتەکەمانا نەمابوو. نەتیجە لە حاڵێکی غەرغەرەدا کە دوایی شەڕ هاتو کە حکوومەتی فەخیمە تەشریفی هێنایە ولاتەکەمان، ئێمە وەکوو دارێکی بێ لقو پۆپمان لێهاتبوو و بە عاستەم تۆزە حەیاتێکمان تێدا مابووەوە. بەلام بە واسیطەی چاودێریی حکوومەتی فەخیمەوەو کە لە هیندستانەوە خواردەمەنیی بۆ جەلب ئەکردینو بە بار پارەی ڕژانەی ناو ولاتەکەمانەوەو لە هەموو جیهەتێکەوە یارمەتیی داینو ڕێی تیجارەتی کردەوە، بووژاینەوەو لقو پۆپمان پەیدا کردەوە. وە غەیری ئەوەیش بۆ ئەوەی سەربەست بین حقووقی داینێو چەند دەفعە سەعیی فەرمووی کە ئیدارەیەکی بەتەنهاییمان بۆ تەشکیل بکات. بەلام چونکە ئیبتیدائی بووین نەمانتوانی بەرهەمی بێنین، ئیدارەی بکەین، لە خۆمان تێك دا)). (( لەگەڵ ئەمەیشا لێمان مەئیووس نەبوو، لە مەسئەلەی ویلایەتی مووصڵدا کە تورکەکان ئەیانوت داخلی میثاقی میللیمانەو مەسئەلەیش هەر عیبارەت بوو لە داگیرکردنی کوردەکان، دیسانەوە بۆ ئاگاداریو پاراستنی حقووقمانو بۆ ئەوەی تووشی فەلاکەتێکی کە نەبینەوە، حکوومەتی فەخیمەو بەتایبەتی فەخامەتی سێر هانری دۆبس موعتەمەدی سامیی عیراق لەسەر ئەو عەزمو نییەتەی کە هەیبوو دەوامی کردو بۆمان تێکۆشاو، وەکوو ویلایەتی مووصڵی نەجات دا بۆ ئاگاداریی شەرەفی میللییەمان بە واسیطەی عوصبەتول ئومەمەوە زۆر ئیمتیازی بۆ سەندین. وە ئەم ئیمتیازەی ئێستا هەمانە، هەر بە سەبەبی ئەو لوطفو شەفەقەتەوە پێکهاتووە)).

---

[٦٠] "ژیان"، ژ١٣٣، ل١-٢.

[٦١] "ژیان"، ژ١٣٦، ل١-٢.

[٦٢] "ژیان"، ژ١٥٥، ل١-٢.

لە (بۆ جەنابی سێر جلبەرت کلاتیۆن مەندووبی سامی‌ی تازەی عیراق)[٦٢]دا، دووبارە بەشان‌وباڵی مەندووبی سامیدا هەڵدراوەو، وەفاداریی کورد بۆ ئینگلیز نوێنراوە: (( مەندووبی سامی‌ی عیراق سێر هانری دۆبس لەو موددەتەی کە لە عیراقدا بوو. زۆری چاوەدێری بۆ قەومی کورد دەکردو، حەتتا لەسایەی هیمەت‌و فەعالییەتی ئەو، قەومی کورد لە پریشکی ئاگری تورکەکان نەجات دراو حوقووقیان داخڵ بە قەراری عوصبەتول ئومەم کرا)). (( کورد قەومێکە صاحێب وەفایەو، لە هەرکەسێک صەداقەتیان دیت لە بیری ناکات‌و، بە موقابیلی ئەم چاکەیەی کە لە موشارئیلەیهی دیتوویانە، دائیما بۆ ئەو منەتدارو شوکرانن)). ((قەومی کورد... هاواری خۆی لەگەڵ هاواری قەومی عەرەب دەکاتە یەک‌و، هەروەکوو قەومی عەرەب بە صوورەتی پاڕانەوەو ئەلیمانە موطاڵەباتی خۆیان ئیددیعا دەکەن. قەومی کوردیش بۆ دەعوای حوقووقی خۆی دوا ناکەوێت، کە ئەم حوقووقە لە موطاڵەباتی ئەوان مەشرووعترە)). (( قەومی کورد لە ڕووی دووری نایەوێت دوچاری مەذەللەت بێت، ئەمەلیان وایە یەدی طوولای ئێوە بۆ تەنفیذی قەراراتی مەوقووفە کە میللەتی کورد مونتەظیرە بە شکڵێ کە ڕەبطمان بکات بە ئیخلاصییەتی حکوومەتی مونتەدەبە درێژە)).

لە (عەودەتی جەنابی موتەصەڕیفی موثەقەفمان لەگەڵ میوان جەنابی میستەر چەپمەن موفەتیشی ئیداری‌ی هەولێر)[٦٤]دا، سەبارەت بە "چەپمەن"ی کاربەدەستێکی پێشووی ئیگلیز لە ناوچەی سلێمانی، وتراوە: ((میللەتی کورد کە وەفا خەصڵەتی طەبیعییەو ئەساسییەیانە هیچ وەقتێك چاکە فەرامۆش ناکەن. بناء علیه ئیمکانی نییە گەورەیی‌و چاکەی ئەم ذاتە بەقیمەتەمان لە بیربچێتەوەو ئەبەدییەن تیذکاری موشارئیلەیهی لە دڵی هەموو کوردێکدا نەقشی بەستووە. لە هەر جێگایەك ببێ، هەموو کوردێك هەموو ئانێك تەمەننای صیحەت‌و سەعادەتی ئەکات... موشارئیلەیهی زۆر حەقی گەورەیی‌و لوطفی بەسەر ئەهلی ئەم وڵاتەوە هەیە، لەوەقتێکدا کە ئەم لیوایە لە حاڵێکی زۆر عوصیان‌و نائەمینیدا بوو، بە هەموو مەتانەتێکەوە موقاوەمەتی فەرموو و هەموو مەزاحیمێکی ئیقتیحام کردو، بیل نەتیجە بە واسیطەی حوسنی تەدابیری موصیبەو تەدقیقاتی مووشکافانەیەوە هەموو مانیعەیەك بەرطەرەف بوو)).

لە (حەقیقەتێك)[٦٥]دا، ڕزگاربوون لە مەینەتیەکانی حوکمی تورك بە دەسکەوتێکی گەورەو دەرووی خێرو سەرفرازی بۆ کورد ژمێرراوەو، تەنانەت هەموو هەڵەو بێ‌باری‌و ناهەقیەکانی ئینگلیز دەرهەق بە کورد، خراوەتە پاڵ کورد خۆی: (( کە تورکەکان بەناوی خەلافەت‌و ئیسلامییەتەوە ئیستیلایان کردین، لە هەموو حوقووقێك مەحرووم مابووینەوەو ئەکثە ری عەنعەنانی میللییەیان پێ‌ون کردین. زبانی مادەرزادەکەمان کە لە هەمووشتێك زیاتر نیشانەیە بۆ میللییەت، ئەویشیان لێ‌مەنع کردین. موخابەراتی ڕەسمی، میللی‌و حەتتا تەدریساتی ئیبتیدائیشمان هەر بە تورکی بوو. لەبەرئەوە لە هەموو تەرەقییات‌و مەدەنییەت مەحرووم مابووینەوە. غەیری ئەمەیش وەقتێك کە شەڕی گەورە دەستیپێکرد بە سەبەبی ئەو ظوڵمانەوە کە لێمان کرا، ئەکثەری میللەتەکەمان مەحوو بووەوەو باقیەکەی تریشی خەریکی مردن بوو، لە حاڵەتی غەرغەرەدا دەرگای ڕەحمەتمان لێکرایەوەو ئەراضیەکەمان لەطەرەف حکوومەتی فەخیمەی ئینگلیزەوە ئیستیلاکرا. ئەم حکوومەتە چونکە مەدەنی بوو و لە میللەت پێگەیاندنا زۆر تەجرەبەدیدە بوو، بۆ ئەوەی ئێمەیش بکات بە میللەتێکی عەصری، وەکوو گەلێ حورییەتی داینێ چەند جاریش سەعیی فەرموو کە بەتەواوی ئیدارەیەکی سەربەخۆمان بۆ تەشکیل بکات، بەڵام لەبەرئەوەی هێشتا قابلییەتمان پەیدا نەکردبوو، میللەتێکی ئیبتیدائی بووین، ئیدارەمان پێ نەکرا. دیسانەوە ئەو حامییەو مورەببییە موشفیقەمان تەعەڕڕوضیکی نەکردە میللییەتمان. هەرچەندە لەگەڵ عیراق‌و عیراقیەکانا تەوحیدی ئیدارەی کردین، بەڵام دیسانەوە بە قەراری عوصبەتول ئومەم بەعضی ئیمتیازی موهیممی بۆ سەندین

(٦٢) "ژیان"، ژ١٦١، ل١.

(٦٤) "ژیان"، ژ١٦١، ل٢.

(٦٥) "ژیان"، ژ١٦٣، ل١-٢.

که نەتیجە پێی تەرەقی بکەین و لە ئیستیقلالا بتوانین بەتەنها بۆ خۆمان بژین وەکوو موخابەراتی ڕەسمی ی حکوومەتی و تەدریسات بە کوردی بێ و مەئموورین هەمووی لە میللەتی خۆمان بێ)). ((کەواتە بە مەجبووری و بە ئارەزوویەکی طەبیعییەوە دائیما موحافەظەی حوقووقمان تەودیعی ئەو حامییە ئەکەین. باوەڕ ناکەم کەسێ بێ لەدوای ئەم هەموو چاکەیەی لەگەڵمانا کراوەو کە زیندوو کراوینەوەو بۆ ئیستیحصالی حوقووقمان هەوڵ دراو تەئمینی بەعضی مەقاصیدمان کرا، لەگەڵ ئەوەیشدا تیکرار بۆ ئیلقای فەلاکەتێکی ترمان هەوڵ بدات. وە بە خواهیشێ و ئارەزوویەکی طەبیعییەوە هەموو ئەڵێین چۆن لەپێشا بۆ هەمووشتێك موقەددەراتی خۆمان تەسلیمی ئەو حامییە موشفیقەمان کردووە، ئێستایش هەر بەونەوعە تەسلیمی ئەکەین و قابیل نییە لەو فکرو قەرارە جیابببینەوە. وە ئەمە وەکوو خاصەیەکی ذاتیی لێهاتووە بۆمان. دەلیلیش ئەوەیە ئەووەقتە کە حکوومەتی فەخیمە بە موناسیبی زانی لەگەڵ عیراق بژین و چونکە بە شتێکی باشی زانی بۆمان، زۆر بە مەسرورییەتەوە قوبووڵمان کردو هەتاکوو ئێستا بۆ تێکدانی ئەو ئیدارەیەو لە عەلەیهی لەطەرەف کوردەکانەوە حەرەکەتێك نەکراوە وە بەعموومی موطیعی ئەم ئیدارەیە بوون)). ((مەحصووڵی غایەی حیسییاتی میللەت ئەوەیە بۆ موحافەظەی حوقووقی، وەکوو هەتاکوو ئێستا تەسلیمی کردووە، ئێستایش و لەمەودوایش هەر تەسلیمی حکوومەتی فەخیمەی بکات)).

لە (تەشریف هێنانی مەعالی مێجەر ئەدمۆنس، میستەر سمیس و سەعادەتی مێجەر لوئید)[٦٦]دا، بە هەمان پێودانگ وتراوە: ((ئێمە کە میللەتێکی فەقیرین و لە غەیری لوطف و شەفەقەتی حکوومەتی فەخیمە نەبێ، چاومان لە هیچی تر نییەو هەموو ئەسبابی خۆشی و بەرزبوونەوەمان هەر بە واسیطەی ئەو لوطف و شەفەقەتەوە پێکهاتووە. .. بەرامبەر بەم چاکەیەی کە لەگەڵمانا ئیبرازی ئەفەرموون، دائیما بە ئیخلاصێکی گەورە موقابیل بەم هەموو ئینسانییەتەی کە لەگەڵمانا کراوە بە دڵێکی خاوێنەوە بەیانی تەشەکور ئەکەین و بەناوی هەموو میللەتەوە تەمەننای سەعادەتی حکوومەتی فەخیمەو دوعای عومردرێژیی ئەم میوانە خۆشەویستانەمان ئەکەین)). ((حەقیقەتەن ئینکار ناکرێ لەحاڵێکا کە سلێمانی ئەو فەلاکەتەی دی و تووشی ئەو ئینقیلابە بوو، لەحاڵێکا کە موشارئیلەیهی لەکەرەکوە تەماشای ئیدارەی ئەم لیوایەو قەضاو ناحیەکانی ئەفەرموو، ئەوی لە هەموو کەس زیاتر یارییەو لوطفێکی فەوقەلعادەی لەگەڵ دەربەدەرەکان و دانیشتووی ئەم لیوایە کردبێ و ئەوی ئەم لیوایەی هێنابێتە ئەم حاڵەوە، هەر مەعالی مێجەر ئەدمۆنسە)).

لە (خۆشەویستی هەموو عیراق مەعالی میستەر سمیث موفەتیشی عامی مەعاریف!)[٦٧]دا، چاکەی بەکارهێنانی زمانی کوردی لە خوێندن و کاروباری ڕەسمیدا بە هی دەسەڵاتدارانی ئینگلیز لەقەڵەم دراوە: ((قەد ئینکاری ناکەین و دائیما بەرامبەر بە لوطف و شەفەقەتتان مەدیوونی شوکرانین کە لەوساوە دەستی یارمەتیتان بۆ ئەم میللەتە درێژکردووە، ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بۆ ساحەی مەدەنییەت هەنگاو ئەهاوین و لە نووری عیلم و مەعریفەت موستەفید ئەبین. .. لەبەرئەوە هەموو هەوڵ و تەقەلایەکمان حەصر کردۆتە سەر مەعاریف و لەمە زیاتر ئارەزوویەکی ترمان نییە. وە هەموو چاك ئەیزانین ئەم مەعاریفەی کە هەمانەو ئەم تەرەقییەی کە کردوومانە، هەر بە سەبەبی لوطف و شەفەقەتی صاحێب مەنصەبانی حکوومەتی فەخیمەوە هاتۆتە وجوود)). ((لەحاڵێکا کە نەمانئەزانی بە زبانی خۆمان بنووسین و بخوێنینەوە، ئێستاکە هەموو موخابەراتی ڕەسمی و میللیمان و ئەکثەری کتێبانی مەکتەبمان بە کوردییە)).

لە (وەکوو باقیی ئەهالیی لیواکە ئەهالیی ناحیەی ماوەتیش کەوتە ئیستراحەتەوە)[٦٨]دا، دیسان بەومەبەستەوە جەخت کراوەتەوە کە: ((موددەتێکی زۆر ئەم لیوایە بە سەبەبی بەعضی حەرەکاتی غەیرە

---

[٦٦] "ژیان"، ژ١٦٣، ل١-٢.

[٦٧] "ژیان"، ژ١٦٥، ل١-٢.

[٦٨] "ژیان"، ژ١٦٨، ل١-٢.

مەعقوولەی خۆمانەوە تووشی فەلاکەتێکی گەورە بووبوو و، ئەم موصیبەتە چونکە بەینێکی زۆر دەوامی کردو لە یەخەمان نەبوەوە، لیواکەمان وێران بوو و ئەمنییەت و ئاسایش مەفقوود و ئەهالی ثەروەتی نەمابوو. وە لەحاڵێکا هەموو دەستەوئەژنۆ دانیشتبووین و مەئیووسییەتێکی گەورە داگیری کردبووین، حکوومەت بەزەیی ی پیامانا هاتەوەو تەشریفی هێنایەوە لیواکەمان. وە بۆ ئەوەی هەمووکەسێك خەریکی ئیشوکاری خۆی بێ و ئەهالی ئیتر بە ڕەفاه و ئیستراحەت وەقت ڕابوێرن، حکوومەت بە هەموو قووەتیەوە سەعیی بۆ کردین و بە تەدابیری حەکیمانەی خۆی وەضعیەتی ئیدارەی لیواکەی هێنایەوە جێی خۆی و، لە جاران زیاتر ئەمنییەت و ئاسایشێکی ئەبەدیی بۆ تەئمین کردین و دەفعی هەموو غائیلیەکی کردین)).

**٢. ٢. ٥. تووتن:**

"ژیان"، وەکوو پێویست، ئاوڕی لە حاڵوباری کشتوکاڵی کوردستان و، بەتایبەت تووتن کە سەرەکیترین بەرهەمی کشتوکاڵیی بووە، داوەتەوەو، خراپیی جۆرو کەم نرخیی و کزیی بازاڕی تووتنی، لە نۆ وتاردا، ناڕاستەوخۆ بە مشوورنەخواردنی حکوومەت و کەمتەرخەمیی قەڵەمچی و پارەدارانی کورد لێك داوەتەوە.

لە (ئەمڕۆ هەر زەراعەت ئێمە دەوڵەمەند ئەکات)[٦٩]دا، ئاوا بایەخی کشتوکاڵ بۆ بووژاندنەوەو پێش خستنی کوردستان خراوەتە ڕوو: (( میللەتێك کە نەیتوانی ئیحتیاجاتی خۆی لەناو خۆیا تەئمین بکات و یا موقابیل بەو پێویستییەی کە لەخاریجەوە پەیدای ئەکات واریداتێکی نەبوو، نەتیجە نەك تەرەقی ناکات بەڵکوو ناژی و ئەمرێ. هەموویش ئەیزانین کوردستان وەکوو ناتوانێ پێویستیی خۆی پەیدا بکات، بەقەدەر ئەو پێویستییەشی کە لەدەرەوە بۆی دێت و بە پارە ئەیکڕێ، ئەموالێکی خۆی نییە کە بینێرێ بۆ دەرەوەو پارەی لێوە پەیدا بکات. ئەو ناتوانێ بە صوورەتێکی فەننی بەعەمەلی بێنێ)). (( هەرچەندە ئەراضیەکەی ئێمەیش لەمانە زیاتر بۆ زەراعەت موساعیدەو زیاتر قابیلە پارەی لێوە پەیدا بکرێ، چونکە بە صوورەتێکی فەننی زەرعی ناکەین و ناتوانین هەمووی بەکاربێنین، نەك لەخاریجەوە ثەروەتێکمان بۆ تەئمین ناکات بەڵکوو بەعضەن بەقەدەر پێویستی و خواردنی خۆیشمان حاصلاتی لێوە تەئمین ناکرێ)). (( دەشتی شارەزوور، بیتوێن... ئەم هەموو باغ و باغچەو دارستانەی کە لە کوردستان هەیە، ئەگەر لە حکوومەتێکی کەدا ببوایەو یا هی میللەتێکی کە بوایە بە صوورەتێکی فەننی بەکارئەهێنراو بەقەدەر بستێك خاك مشتێك ئاڵتوونی لێ پەیدا ئەکرا)). (( لازمە ئێمەیش بۆ ئەوەی بژین و دەوڵەمەند بین و پێش کەوین، ئەبێ هەموو هەوڵ و تەقەلایەکمان حەصر بکەینە سەر زەراعەت و ئەراضیەکانمان بە بۆش نەهێڵینەوەو بە صوورەتێکی فەننی زەرعی بکەین. بەڵام زەراعەتێك چۆن وەکوو گوتمان ئوصووڵە هەروا ئێمەیش بۆ چەند نەوعی زەراعەتێك چەند شیرکەتێك تەئمین بکەین و مەلاك و صاحێب پارەکانمان ثەروەتەکەیان یەك بخەن و چی پێویست بێ بۆ زەراعەت وەکوو ماکینەو موتەخەصیص جەلب و دەست بکەین بە زەراعەت)).

لە (ئەسبابی بێ قیمەتیی توتونەکەمان)[٧٠]دا، نیشان دراوە کە (( لە صەرفییاتی زیاتر لە موحیطەکەمانا توتون هەیە))و، (( هەموو ساڵێك لە ئێرانیشەوە بەقاچاق میقدارێکی زۆر بەناوی توتونی مەحەلییەوە دێتە وەطەنەکەمان و سەوقی بەغداد ئەکرێ)). لە (توتون)[٧١]دا، ڕەخنە لە ڕێوشوێنی کۆنی بەرهەمهێنانی تووتن گیراوەو، پێڕەوکردنی ڕێگای تازەو هێنان و بەکاربردنی تۆوی ئەوروپایی پێشنیارکراوە. ڕوو لە نائیبەکانی کوردیش نراوە هەوڵی چاککردنی جۆری تووتن و پسپۆڕهێنان و بردنە دەرەوەی تووتن بدەن. لە (توتونی ئێران)[٧٢]دا، داوای ڕێگرتن لە بەقاچاخ هێنانی تووتنی ئێران کراوە، تا نرخی خۆماڵییەکە نەشکێ. ئەویش، وەك

---

[٦٩] "ژیان"، ژ١٧٤، ل١-٢.

[٧٠] "ژیان"، ژ١٢٤، ل١-٢.

[٧١] "ژیان"، ژ١٤٠، ل٣-٤و، ژ١٤١، ل٢.

[٧٢] "ژیان"، ژ١٥٠، ل١-٢.

له (به واسیطەی "ژیان"ی خۆشەویستمانەوە بۆ نەظەری مەرحەمەتی ئەولیای ئوموور)[72]دا، وتراوە، بە ناونووسکردنی بەراوەکانی تووتن و پاس پێدانیان.

له (ئەو هەوڵ و تەقەلایەی کە حکوومەت بۆ چاککردنی توتونەکەمان دای، عەقیم مایەوە)[74]دا، ئاماژە بە کۆششی نائیبانی کورد دراوە کە هاواریان گەیاندووەتە وەزارەتی دارایی و، بڕیار دراوە بودجەیەك بۆ چاککردنی تووتن تەرخان بکرێ، بەڵام بڕیارەکە سەری نەگرتووە. له (لەبابەت ئیصلاحی توتونەوە بەیاناتێکی مەعالی ئەمین زەکی بەگ)[75]دا، بە پەژارەوە نووسراوە: (( ئەهالی‌ی کوردستانی جنووبی لە توتون زیاتر واریداتێکی تری نییە، واسیطەی مەعیشەت و گوذەرانی هەر ئەم توتونەیەو، موقابیل بەم هەموو پێویستییەی کە لەخاریجەوە تەدراوکی ئەکات، هەر ئەم حاصلاتەی هەیەو ئەمیش چونکە چاك زەرع ناکرێ و میللەتەکەمان ناتوانێ ئیصلاحی بکات چەند ساڵێکە ساڵ بە ساڵ لە تەنەزولدایەو خەریکە مەحووبێتەوەو ڕەواجێکی نییەو ئیستیفادەیەکی لێ ناکرێ)).

وەك دەرئەکەوێ، کێشەی تووتن بەدرێژایی‌ی حوکمی پاشایەتی بەچارەسەرنەکراوی هێڵرایەوە. ساڵانی ١٩٤٨-١٩٤٩یش، جارێکیتر لەسەر ڕووپەڕی گۆڤاری کوردی-عەرەبی‌ی "نزار"، بە چەند وتارێکی عەرەبی، وروژێنرایەوە[76].

### ٢. ٢. ٦. زمان و چاپکراوی کوردی:

زمان، هەر لە سەرهەڵدانی هۆشیاری‌ی نەتەوەیی‌ی کوردییەوە، یەکێك بووە بەو بنەما گرنگانە کە ڕۆشنبیرانی کورد، بۆ سەلماندنی بوون و جیاوازی‌ی کورد وەکوو گەلێك، جەختیان لەسەر کردووە؛ لەبەرئەوەی ساڵەهای ساڵیش بێخزمەت و بێخاوەن بووە، لێرەولەوێ هەوڵی زیندووکردنەوەو دارشتنی دەستووری گەشەپێدانی ڕێنووس و بژاریان داوە. "ژیان"، لەومەیدانەدا، نەخش و کاریگەریی دیارو بەرچاون.

له (ئەهەممیەتی لیسان)[77]دا، بایەخی زمان و حاڵ وباری زووی کوردی ئاوا ڕوون کراوەتەوە: (( زبان بۆ میللەتێك لە هەموو عەنعەناتێك زیاتر ئەهەممیەتی زۆرترە. ئەو میللەتانەی کە میللییەتی خۆیان ون کردووەو دائیما مەوجوودییەتێکی مادی‌ی میللییەیان هەیە، لە هەمووشتێك زیاتر نیشانەی میللییەتیان زبانەکەیانە. وە بە سەبەبی زبانەکەیانەوە جیابوونەوەو، بە میللەتێکی سەربەخۆ ئەناسرێن...... میللەتێك وەلەو هەزار ساڵیش کەوتبێتە ژێر ئیدارەی میللەتێکی کەوە، بەڵام بە شەرطیك زبانەکەی خۆی تەرك نەکردبێ و جەبرەن لێی مەنع نەکرابێ، دیسانەوە ئەو میللەتە مەوجوودییەتەکەی خۆی هەر ڕائەگرێ و هیچ وەقتێك نانووسێ بە میللەتێکی کەوەو ئاخری هەر جیائەبێتەوە)). (( ئەم میللەتە هەرچەند لە هەمووکەس زبانەکەی عەنعەناتی میللییەی خۆی موحافەظە کرد. لەبەر تەضییقاتی ئەجانب و لەبەرئەوەی کە لە موحیطەکەدا لیسانی ڕەسمی و تەدریساتی مەکاتیب بە کوردی نەبوو، نەیتوانی و مەیدانی نەدرا کە تەرەقییەك بە لیسانەکەی بدات و تەکامولی پێ بکات. بەڵام ئەوەتەی حکوومەتی فەخیمەی بریطانیا موحافەظەی حوقووقی ئەم میللەتە ئەکات، بە سەبەبی لوطف و شەفەقەتی حکوومەتی فەخیمەوەو بە واسیطەی قەراراتی موصیبەو عادیلەی عوصبەتول ئومەمەوە زبانەکەمان سەربەست کراو ئەمڕۆ لە موحیطەکەمانا تەدریسات و موخابەراتی ڕەسمی بە زبانی مادەرزادی خۆمانە)).

له (هەنگاوێکی ئومێدبەخش و مژدەیەکی خۆش بۆ کوردان)[78]دا، پشت بەستوو بە بەیاننامەی ١٠/٤/١٩٣٠ی حکوومەتی عیراق سەبارەت بە بەڕەسمی ناسینی-نیوەناچڵی- زمانی کوردی لە ناوچە

---

[73] "ژیان"، ژ١٥٣، ل١-٢.

[74] "ژیان"، ژ١٨٣، ل١-٢.

[75] "ژیان"، ژ١٨٨، ل١-٢.

[76] ڕەفیق سالح، نزار ١٩٤٨-١٩٤٩، لێکۆڵینەوەی سدیق سالح، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٤٢، ٤٣.

[77] "ژیان"، ژ١٦٢، ل١-٢.

[78] "ژیان"، ژ٢٣٥، ل١-٢.

کوردنشینەکاندا[٧٩]، دوای ١٠ ساڵێك لە دامەزرانی حکوومەتی عیراق، بە یەکێك لە مەرجەکانی یەکێتی دڵخەوازانەی نێوان کوردو عەرەب ژمێرراوە: (( حەقیقەتەن لە هەموو کوردێکەوە مەعلووم بوو کە ئەم قابینەیە فکرێکی عالیی هەیەو، ئەیەوێ بۆ بەرزو بڵندیی عیراق ئەو ئەسبابانە مەحوو بکاتەوە کە هەتاکوو ئێستا ئەم دوو میللەتەی لەیەك دڵگیر کردبوو، لێی مەعلووم بوو کە ئیتیحادو یەك فکریو یەك وجوودیی ئەم دوو میللەتە بەوەوە ئەبێ کە موحافەظەی حقووقی میللیو عەنعەناتی کوردەکان بکرێ)). (( هەرچەند لەپێشەوە پێویست بوو موافیقی قەراری عوصبەتول ئومەمو ئیعتیرافاتی عیراق ئەم حقووقە بە کوردەکان بدرێ، بەڵام هەتاکوو ئێستا فیعلەن لە بەعضی مەناطیقی کوردییەدا موهمەل مابووەوەو عەمەلی پێ نەئەکراو ئارەزووی کوردەکان نەهێنرابووە جێو، عەلاوەتەن ئەم مەسئەلەیە کەسبی قانوونێتیی نەکردبوو، بەم سەبەبەوە ئیتیحادێکی تەواو لەبەینی ئەم دوو میللەتەدا پەیدا نەبووبوو)). (( لەم عەصری میللییەتەدا کوردیش هەمووەقتێك شوعوورێکی پاکو بڵندی میلليی تیا مەوجوودە، هەروەکوو ئارەزوومەندن بۆ ئیدارەی یەکێتی لەگەڵ عیراقا-عەرەبدا، لەعەینی زەماندا بە ئیشتیاقو پەرۆشییەکەوە ئەیشیانەوێ موحافەظەی هەموو عەنعەناتی میللییەو شەرافەتی قەومییەی خۆیان بکەن)).

((لازمیشە ئیتر لەمەودوا بە دائیمی سەعی بکرێ بۆ ئیتیحادێکی ئەم دوو جەرەیانەو بە دانی حقووقێکی مەشرووعەی میللەتی کورد، ئیتیحادێکی تەواو لەبەینی ئەم دوو میللەتەدا تەئمین بکرێ کە نەتیجە لەم ئیتیحادو مەزجی ئەم دوو میللەتەدا کیتلەیەکی موتتەفیقەو یەك غایە بهێنرێتە وجوودو، ئەمەیش هەر بەم جوزئی ئیهتیمامەوە دێتە وجوود. فائیدەو مەنفەعەتی ئەم ئیتیحادە بۆ طەرەفەینە، بۆ هەردوولا ئەبێ بە موجیبی بەرزبوونەوە، باخوصووص بۆ تەرەقیو تەعالیی ئەم حکوومەتە گەنجەی عیراقە ئەهەمییەتێکی حەیاتییەی هەیە، چونکە بەواسیطەی دۆستایەتیی قەومێکی جەسوورو جەنگاوەری وەکوو کوردەوە دائیما حودوودی شەرقیو شیمالیی عیراق بەرامبەر بە هەموو خەطەرێك مەحفووظ و موئتەمەن ئەبێ. جگە لەمەیش، لە جامیعەی عیراقدا لە جیاتیی بوونی عونصورێکی نامەمنوون برایەکی پڕمەحەبەتو پڕجیدییەت دێتە وجوود.. بەڵام بۆ ئەوەی ئەم دوو میللەتە لەیەك دڵگیر نەبن هەراوهوریا نەکەوێتە بەینیانەوەو ئیتیحادەکەیان زیاتر دەوام بکاتو بە ئەبەدیو بەجیددی بژین، موحافەظەی حقووقی میللییەی کوردەکانیان بە شەرط گرتووەو لەم ئیتیحادەدا دانی هەموو حقووقێکی مەشرووعەی کوردەوارییان بە پێویست زانیوە)).

لە (مژدە بۆ کوردەکان: دەستووری کوردی)[٨٠]دا، بەبۆنەی چاپو بڵاوبوونەوەی کتێبی (دەستووری زمانی کوردی)ی تۆفیق وەهبی بەگەوە، قسە لەسەر گرنگیی دەستوورو ئەلفوبێی زمان کراوە: (( بەڵام چونکە بۆ لیسانەکەمان دەستوورێك رێك نەخرابوو، ئەو ئەلفباو دەستوورەیش کە لەم ساڵانەدا بۆمان رێك خرابوو ئیبتیدائی بوون، زبانەکەمان تەکامولی نەکردو بە مەجبووری منداڵەکەمانمانو کاتبەکانمان هەرکەس بۆ خۆی بەشێوەیەك ئەیخوێندو ئەینووسی)). لە (لە خوێندەوارەکانی کورد تکا ئەکەین)[٨١]دا، بژاری کوردی لە وشەو زاراوەی بیانی بەپێویست لەقەڵەم دراوە: (( قیمەتی زوبانێك بەمە دەرئەکەوێ کە بۆ نووسینو خوێندنەوە ئەلفبایەکی باشو بۆ فێربوون رەهبەر-گرامێرێکی رێکوپێکی ببێ. وە غەیری ئەمانەیش ئازادە بێ لە کەلیماتی بێگانە. هەرچەند زوبانی ئێمە لەپێشا سافو بێگرێ چاكو خاوێن هەمووی کوردیی پەتی بووە، بەڵام بە سەبەبی ئیسلامەتیو دراوسێیەتیو تێکەڵاویی قەومانی ترەوە زۆر کەلیماتی بێگانە تێکەڵاوی زوبانەکەمان بووەو کەلیماتەکانی خۆمان ون کردووە.. پێویستە بۆ نەهێشتنی ئەم کەلیمە ئەجنەبییانەیش هەوڵ بدەینو لە جێی ئەوانە کەلیماتەکانی خۆمان کە باوكو باپیرمان لەوەختی خۆیدا بەکەڵکیان هێناوەو ئێمە ونمان

---

[٧٩] عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط٥، ج٣، ص١٢-١٣.

[٨٠] "ژیان"، ژ١٩٧، ل١-٢.

[٨١] "ژیان"، ژ٢٤٢، ل١.

کردووەو یا کەلیماتێك کە موناسەبەتی بەوانەوە بێ بیدۆزینەوەو بەعوموومی قوبووڵی بکەین و ئیتر بەم نەوعە زوبانەکەمان بکەینەوە بە کوردییەکی پەتی و بیخەینەوە سەر پێشوەکەی خۆی)).

لەپاڵ ئەوەدا، کەمی ی کتێبی چاپکراوی کوردی، بەحوکمی تەمەن کورتی ی بەکوردی نووسین و بڵاوکردنەوە، یەکێك بووە لە نیگەرانییەکانی ڕۆشنبیری ئەوسەردەمەو لەکاتێکدا حکوومەت وەك هەرە تواناترین لایەن بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە، هەنگاوێکی خێری نەناوە بۆ باربوو و دابینکردنی پێویستییەکانی بووژاندنەوەی ئەم مەیدانە. بێداروباریی ی بەتایبەت ئەوکاتەی کورد، لەم ژمارانەدا دەرئەکەوێ: تێکڕای کتێب و نامیلکەی لەچاپدراوی کوردی، هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی ی ساڵی ١٩٢٩، دەوری (٥٨) دانە بووە لە دنیادا؛ لەوانە ٣١ یان بەگشتی لە عیراق و، بەتایبەت لە سلێمانی و ڕەواندز چاپ کراون[٨٢]، ئەم ژمارەیە، بۆ خۆی بەڵگەی هەژاری ی کتێبخانەی کوردی و ساوایی ی ئەزموونی بەکوردی نووسین بووە.

هەر ئەم خاڵە، هانی مونەووەرێکی وەك عەبدوڵڵا عەزیزی داوە لە (مەطبووعاتمان)[٨٣]دا، بەپەرۆشەوە بێتە سەر باسی ئەم مەسەلەیەو، وا لێی بدوێ: (( دەرەجەی عیلم و ئیدراکی میللەتێك و نەوعی پێشکەوتنیان لە مەطبووعاتیاندا دەرئەکەوێ، چونکە میللەتێکی دواکەوتوو کە وریابووەوە پێش هەمووشتێك هەوڵ ئەدا بۆ تەرەقی ی مەعاریف کە بناغەی مەعاریفیش مەطبووعاتەو یا بناغەی مەطبووعات مەعاریفە.. .. بۆ پێشکەوتنی مەعاریفیش یەگانە ڕەهبەر مەطبووعاتە، کە ئەمەش ئەنواعی هەیە، مەثەلەن غەزەتە تەرجومانی حیسسیاتی میللەتە، کتێب و ئەدەبیات ئاوێنەی کەمالییاتی ئەو میللەتەیەو، کتێبی عیلمی ئەمەش یا تەئلیف و یا تەرجەمە ئەکرێ لە لوغەتێکی ئەجنەبییەوە. کتێبی مەکتەبیش لەمیانەی ئەمانەدا ئەژمێررێ)). (( قەومی کوردیش لەم قەرنی ئەخیرەدا کە وریابوونەوە، فەرقی ئەم نوقصانییەتەیان کرد. بۆ عەینی غایە لە ئەستەمووڵ لە زەمانی حکوومەتی عوثمانی مەجمووعەی (ڕۆژی کوردو هەتاوی کورد)یان نەشر کردو بەعضی کتێبیان لەچاپ دا)).

### ٢. ٢. ٧. کێشەی کورد:

"ژیان"، ئەم دەورە، بە ناوەرۆك لەچاو هەرسێ دەورەکەی تردا، دەوڵەمەندترو بەهێزو پێزترەو، ئەگەرچی بەلەدییە دەریکردووەو لێرەولەوێ بیرو بۆچوونی ڕەسمی ی حکوومەتی دەربڕیوە، بەڵام ئەشێ بڵێین لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٨ـەوە، مۆری ڕۆژنامەیەکی سیاسی ی کوردیی لە خۆی داوەو، لیبڕاوانە هەم داکۆکیی لە مافە ڕەواکانی کورد کردووەو، هەم هەموو چالاکییەکی کوردیی سەردەمەکەی بە ئەمانەت و وردو هەمەلایەنە لەسەر لاپەڕەکانی خۆی جێکردووەتەوە. هەر لەبەرئەوەیشە کە بایەخی مێژوویی ی "ژیان" لەم قۆناغەدا ئەوپەڕی زۆرەو، ڕاست تۆمارێکی بێغەل وغەشی ئەو هەلومەرجە ناسکەیە.

هۆیەکی دیاری ئەم هەڵوێستی کوردی نواندنەی "ژیان"، لەپاڵ کاریگەری ی هەلومەرجەکەدا، هی ئەوەیە کە ئەم دەورە لێپرسراوی ڕۆژنامەکەو بەشێکی نووسەرەکانی چالاکی ی سیاسی ی نهێنییان هەبوەو لە چوارچێوەی ڕێکخراوی سیاسیدا کوردایەتییان کردووە؛ ئەحمەدی عەزیز ئاغاو شێخ سەلام و عەبدولواحید نووری و مستەفا صائیب، سەرەتا ئەندامی دامەزرێنی (جەمعییەتی زەردەشتی ١٩٢٦-١٩٢٨)[٨٤]و، دواتر ئەندامی (جەمعییەتی خۆیبوون)و، عەلی عیرفان و ئەسیری هی (خۆیبوون)[٨٥]و، ڕەشید نەجیب و مەحموود جەودەتیش ئەندامی بەرزی

---

[٨٢] مستەفا نەریمان، ببلیۆگرافیای کتێبی کوردی (١٧٨٧-١٩٧٥)، بەغدا، ١٩٧٧، ل١٤-٢٦؛ سی. جەی. ئەومۆندز، ببلیۆگرافیای کتێبی چاپکراوی باشوور (١٩٢٠-١٩٣٦)، گۆڤاری کۆمەڵەی شاهانەی ئاسیای ناوەڕاست، ب٢٥، بەشی سێهەم، تەمووزی ١٩٣٧، ل ٤٨٧-٤٩٧و، هەمان بابەت (١٩٣٧-١٩٤٦)، هەمان گۆڤار، ب٣٢، بەشی دووەم، مایسی ١٩٤٥، ل١٨٥-١٩١.

[٨٣] "ژیان"، ژ٢٣٦، ل١.

[٨٤] ئارام، کۆمەڵەی زەردەشت لە مێژووی کوردا، "بەیان" (گۆڤار)، بەغدا، ژ١٩، تشرینی دووەمی ١٩٧٤.

[٨٥] د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، چ١، ب٢، ئامادەکردنی عەبدوڵڵا زەنگەنە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٢٩٢-٢٩٦.

(کۆمەڵی پشتیوانی کوردان-١٩٢٨)[٨٦] بوون. ئەو کۆمەڵانە ئامانجیان کەموزۆر بەدیهێنانی مافەکانی کوردو، ئەم ڕۆژنامەیەیش مەیدانێکی گونجاو بووە بۆیان تا داکۆکیی تێدا لە مەسەلەی کورد بکەن و زۆرترین وتاری لەبارەوە بڵاوبکەنەوە. بۆیە بەدوور نازانرێ کە حزبایەتیی ئەوانە، ئەگەرچی بە هیچ شێوەیەك ڕەنگی لە نووسینەکانیاندا نەداوەتەوە، هاندەریان بووبێ بۆ نووسین و خستنەڕووی پێویستی و داواکانی کوردەواریی و پێداگرتن لەسەر ڕەوایی یان.

جموجووڵی نائیبەکانی کورد، وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، بۆ بەیەکجاری چاککردنی باری خوێندن و مەعاریف و هێنانەکایەی ئیدارەیەکی کوردی لە ناوچە کوردنشینەکاندا، بە دیارترین دوو هەوڵی سیاسیی گرنگی ساڵی ١٩٢٨ی مونەووەران و سەرانی کورد حسێب ئەکرێن بۆ بەدیهێنانی تایبەتمەندییەکی کوردی. لەپاڵ ئەوەدا، ئەشێ گەشەکردن و ڕێکخراویی پلەبەپلەی بزاوتی کوردایەتی، کە لە ڕاپەڕینی ئاشتییانەی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ی بەردەرکی سەرای سلێمانیدا گەیشتە چڵەپۆپە، هەر لەڕێگەی "ژیان" خۆیەوە هەست پێ بکەین.

لە (حەقیقەتێك)[٨٧]دا، دەرئەکەوێ خرۆشانی خەباتی شارستانیی کورد بە مەزبەتەو برووسکەو نامە بۆ لایەنە دەسەڵاتدارەکان، ڕۆژنامەکانی بەغدایشی ورووژاندووەو، بەگشتی خراپ و نامەسئوولانە لێیان نووسیوە: ((غەزەتەکانی بغداد و العراق و... بەعضی حەوادیث ئەنووسن و ئەڵێن گۆیا کوردەکان خەریکی مەضبە طەن کە لە عیراق جیاببنەوەو، کەسێکی تر ئەڵێ واجبە لەسەر وەکیل و پیاوەگەورەکانمان بۆ ئەوەی وەحدەتێکی قەطعیی ئەم دوو میللەتە تەئمین بکەن، لازمە هەوڵ بدەن و ئیتیفاق بکەن)).

لە (ئەم ئیمتیازە کە بە کوردەکان بەخشراوە، تەطبیقی مەجبوورییە)[٨٨]دا، بە تێڕوانینێکی ڕاست و دروستەوە دامەزرانی دەوڵەتی عیراقی خستووەتە بەر باس و شیکردنەوەو، واقیعبینانە ڕوونی کردووەتەوە کە پێکەوەژیان و هاومافیی کورد و عەرەب زامنی دواڕۆژێکی ئارام و بێسەرئێشەیە بۆ هەردوولا: (( مەخفی نییە وەقتێك کە حکوومەتی فەخیمە عیراق و ئەم وڵاتەی ئیستیلا کرد، حقووقێکی تەواوی بە کوردەکان بەخشی و لەژێر ئیدارەی حکوومەتی فوخیمەدا ئیدارەیەکی سەربەخۆیان بۆ تەشکیل کرا. بەڵام وەقتێك کە عیراق داوای حقووقی موقەددەسەی خۆی کرد، چونکە مەعلووم بوو کە عیراق هەر عەرەب نییەو لە ئەقوامی موختەلیفە تەشەکولی کردووە، چونکە مەعلووم بوو لەگەڵ کوردەکانا ئەکثەری مەنافیعیان موشتەرەکەو لازم و مەلزوومی یەکترین و، باخوصووس لە حەللی ویلایەتی مووصڵا چونکە لیجنەی عوصبەتول ئومەم لێی مەعلووم بوو کە ئەکثەری سەکەنەی ئەم ویلایەتە کوردەو عادەتەن ویلایەتێکی کوردییە؛ مەجبوورەن لەسەر فکرو تەنسیبی حکوومەتی فەخیمەو بە قەراری عوصبەتول ئومەم ئیدارەی ئەم دوو میللەتە تەوحید کراو لە هەردوولا حکوومەتێکی عیراق هێنرایە وجوود. وە بۆ ئەوەی ئەم دوو میللەتە هەتاکوو سەر بەیەکەوە بژین، موتەئەثیر نەبن و حقووقی یەکتر غەصب نەکەن، وە هەردوولا عەنعەناتی میللییەیان هەر باقی بێ، وە بەوناوەوە تەرەقی بکەن، بەعضی ئیمتیازیان دا بە کوردەکان. وە لە عەلاوەی کوردستان بە عیراقدا، ئەم ئیمتیازە بە شەرط گیرا. بەڵام چونکە لەوساوە ئەم ئیمتیازە قیسمێکی کەمی لە بەعضی وڵاتە کوردەکانا تەطبیق ئەکرێ و لە ئەکثەری وڵاتەکانی ترا بە قەطعی هیچی تەطبیق نەکراوە، ئەم مەحەببەتەو ئەم ڕابیطەیەی کە لیجنەی عادیلەی عوصبەتول ئومەم ئەیویست، بەتەواوی تەئمین نەکرا)).

واتە ئەو حاڵوبارە کوردی هان داوە بەخۆ بکەوێ: (( لەبەرئەوە، چونکە میللەتی کورد زانیی ئەگەر مەسئەلە هەروا بمێنێتەوە، نەك تەرەقی ناکات، بەڵکوو ڕۆژبەڕۆژ بەرەودوا ئەڕوا. بەقەطعی قەراری دا کە داوای

---

[٨٦] هەمان سەرچاوە، ل٣٦٤-٣٦٥؛ احمد خواجە، چیم دی، ب٣، سلێمانی، ١٩٧٠، ل٣٠.

[٨٧] "ژیان"، ژ١٦٣، ل٢.

[٨٨] "ژیان"، ژ١٦٧، ل١-٢.

حوقووقێکی مەشرووعەی خۆی بکات. وە نەتیجە لەسەر ئارەزوو و خواهیشی حوقووقێکی میللەتەکە، وەکیلانی میللەت طەڵەبی ئەم حوقووقەیان کرد)). پاشان، بە زمانێکی شیرین و ژیرانە، داوای لە کاربەدەستانی عیراق کردووە ڕاستگۆو دووربین بن و، ئەگەر خێری عیراقیان ئەوێ، ڕێز لە مافەکانی کورد بگرن: (( ئینجا ئەی وەطەنپەروەرە موحتەرەمەکان، ئەی پیاوە سیاسیەکانی عیراق... ئێوە چۆن میللەتی خۆتان خۆش ئەوێ و ئەتانەوێ حوڕو سەربەست بژین، کوردیش بۆ عەینی غایە هەوڵ ئەدات. وە لازمە ئینسان مادام میللەتپەروەر بوو، حورمەتی میللییەتی میللەتێکی تریش بگرێ و، ئەمە لە دنیادا قانوونێکی طەبیعییە. وە دیسانەوە ئەبێ بزانن ئەم ئیمتیازەی کە دراوە بە کوردەکان، هەر بۆ ئەوەیە کە مەحەببەتێکی ئەبەدی بەین تەئمین بکات و، هەر بۆ ئەوەیە کە مەنافعێکی موشتەرەکەی لێ بێتە وجوود و، بەم سەبەبە هەردوولا تەرەقی بکەن و، حەتتا لەمەیش زیاتر لەپێش خۆتانەوە بۆ تەرەقی و تەعالییان سەعی بکەن. وە ئیللا ئەگەر هەروا بمێنێتەوە، نەك هەر کوردەکان دوا ئەخات، بەڵکوو ئەبێ بە سەبەبی دواکەوتنی هەردوولا)).

لە (جوابی غەزەتەی العراق بە تەئریخی ٩ی نیسانی ١٩٢٩)[٨٩]دا، وتراوە: لایەنە شۆڤێنیەکانی عەرەب و، لەوانە بەشێکی ڕۆژنامەکانی بەغدا، بە باسی داواکانی کورد تەنگەتیلکە بوون و هەڕەشەی لەناوبردنیان لە کورد کردووە. بەڵام "ژیان" هێمنانە ڕووی لێناون ئەو هەڵمەتە ڕۆژنامەوانییە ڕابگرن کە بە قازانجی عیراق ناکەوێتەوە: (( العراق کورد تەهدید ئەکات و ئەیترسێنێ بەوەی کە ئەڵێ (کوردەکان طەڵەبی وا بکەن وەکوو ئیددیعای ئەرمەنیەکانی لێدێت کە موقابیل بە تورکیا کردیان و نەتیجە بەم حاڵە گەیشتن)... ئەی صاحێب و موحەرریری العراق ! کورد بەوشەرطە لەگەڵ عیراقا ئەژی، نەك وەکوو غەزەتەکانی خاریج ئەڵێن و ئەنووسن (ئەبێ ئەم دوو میللەتە وەکوو بریطانیا و ئوسکۆتلاند بژین و تەماشای یەکتری بکەن) ، بەڵکوو کورد ئەیەوێ زیاتر تەماشای بکرێ... ڕجا لە ئەولیای ئوموور ئەکەین، ئەگەر ئەیانەوێ ئەم دوو میللەتە بەیەکەوە بژین، نابێ مەیدان بدەن شتی وا بنووسرێ، چونکە غەزەتەکانی کوردیش مەجبوور ئەبێ موقابیل بە هەموو تەعەڕروضێك نەك مودافەعە، بەڵکوو هوجووم بکات. هەر ئەوەندە ئەڵێین)).

هەر لە هاتنەدەنگدا دژی ئەو گەلەکۆمە ڕۆژنامەوانییە، عەبدولوەهاب کەرکووکی لە وەڵامی ڕۆژنامەی "البلاد"[٩٠]دا، کە نووسیویە: بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردی لە ناوچەکانی کوردەواریدا، کەرکووك ناگرێتەوە؛ جارێکی تر پەردەی لەسەر کۆنیی مەسەلەی کوردستانی بوون یا نەبوونی ناوچەی کەرکووك لاداوە کە وادیارە ئەوسایش دیوێکی کێشەکەی پێکهێناوە: (( ئەمە شتێکی ئاشکرایەو وەکوو ڕۆژ مەعلوومە کە نەفسی مەرکەزی لیوا کە بە ئەکسەرییەت کورد تەشکیلی ئەکات و، بۆ خاریجی لیوا هیچ حاجەت بە نووسین نییە، چونکی هەموو کەس ئەیزانێ کە هەموو کوردن و لەژێر هەواو لەبەر کانی و بەفراوی کوردستان ئەژین و زۆر لەکۆنەوە بە کوردایەتیی خۆیان ئیفتیخاریان کردووە... ئیجادکردنی ئەم نەوعە قسە ناحەقانەی ئەوان، هیچ وەختێ قەراری عوسبەتول ئومەم ناگۆڕێ و، لەخوسووس بەخشینی ئەو حەقە کە بە کوردەکانی شیمالی عیراق دراوە و، ئەم قەرارە لەتەرەف حکوومەتی بریتانیای گەورەو حکوومەتی عیراقەوە فیعلەن تەسدیق و قوبووڵ کراوەو، غەیری ئەمەیش فەخامەتی ڕەئیس وزەرای عیراقیش نووری پاشا سەعید تەئییدی ئەم قەرارەی کردو ئەمری دا لە مەناتیقی شیمالییەدا تەتبیق بکرێ... زۆر چاك لایان مەعلووم بێت تەنها بۆ چەند تورکمانێك ئیستیقبالی کوردەکانی کەرکووك و ئەترافی مەحوو و حوقووقیان زەوت ناکرێ)).

لە (تەشریف هێنانی وەلیعەهدی بڵندپایەو موظاهەرەتێکی عموومیی کورد)[٩١]دا، نوتقی ڕەمزی فەتاحی وەکیلی میللەت، ئەرك و ماف و هەڵکەوتی ئەوسەردەمەی کوردی وردو ڕوون پیشان داوە: (( موحیط و حاڵاتی

---

[٨٩] "ژیان"، ژ١٦٧، ل٢-٣.

[٩٠] "ژیان"، ژ٢٥٠، ل٢.

[٩١] "ژیان"، ژ٢٥٣، ل١-٤.

عومومییەی هیچ قەومێك نەبوە بە سائیقی تەرەقیو ئیعلا بۆ قەومێکی تر، بیلعەکس بووە بە سەبەبی فەلاکەتو ئیضمیحلال)). (( لەناو ئەفرادا نیفاقی دائیمیو بێمەحەببەتی))و ((بۆ ئیحقاقی حەقی تەرویجی ئامالو مەطالیبی عەوموومییە، موراحەعەت بە عەقڵو فکر نەکردن))ی بە دوو هۆی کلۆڵیی کورد دیاری کردووەو، وتوویشیە: (( ئەی کوردینە لەم حاڵەشدا نابێ ئێمە مەئیووس بین)). (( ئەمڕۆ ئەثەری خێری ئەم ئیتیفاقە لە میللەتەکەماندا ئەبینین، گەورەو بچووك داخڵو خاریج بۆ حوقووقی موکتەسەبەو مەشرووعەمان لە دائیرەی عەقڵو قانوون، مەنطیقو فکردا موطاڵەبەو مودافەعە ئەکەنو هەوڵ ئەدەن. وە لازمە لەمەودواش لە هەموو ئیشێکمانا حەقو حەقیقەت بکەین بە پشتیوانو ڕەهبەرمان)). (( حوقووقی ئێمە لە ماددەی ٤٠٣ی قەراری مەجلیسی عالیی عوصبەتول ئومەمو ماددە ٣ی موعاهەدەی ١٩٢٢و ماددە ١٠٩و ١١٠ی قانوونی ئەساسیی حکوومەتی عیراقییە تەثبیت کرابوو و کە لەطەرەف حکوومەتی فەخیمەی بریطانیاوەو جەلالەتی مەلیكو ڕەئیسی حکوومەتی عیراقییەوە ڕەسمەن تەئییدو ئیعتیرافی پێکراوە. مەعەل ئەسەف هێشتا ئەسیری دۆسیەو کاغەزەو لە شکلی عەنقادا ماوەتەوەو، حەتتا لەم موعاهەدە تازەیەشدا کە یەکدەفعە موناسەباتی ئینگلیزو عیراق قەطعییەتی کەسب کردووەو ئینتیداب نیهایەتی هاتووە، دیسانەوە خراوەتە گۆشەی نیسیانەوە، موعاهەدەکە وەکوو فەلاکەتێکی ناگەهـ ظوهوور ئومێدی ئیستیقبالی مەحوو کردووینەوە.. . لەبەرئەمە غایەی موظاهەرەکە ئیحتیجاجێکە بۆ مەطالیبو حوقووقی مەشرووحەو مەشرووعەمان. لازمە گەورەو بچووکی هەموو کوردێك، دەست بدەینە دەستی یەکتریو لەم ڕۆژە تەئریخییە ئیستیفادە بکەین)).

سەرانی کورد، بە لاچوونی ئینتیدابو بوونە ئەندامی عیراق لە کۆمەڵەی گەلانو دواتر باسك ئەستووربوونی حکوومەتەکەی، نیگەران بوونو، داهاتوویەکی ناڕۆشنیان چاوەڕوان کردووە، بۆیە پێیان لەسەر (موختارییەتی ئیدارە) بۆ کورد داگرتووە. لە (موطاڵەباتی عوموومی میللەتی کورد)دا، هاتووە: (( حاڵی حاضر موافیقی موعاهەدەی تازە، ئینتیدابی بریتانیا ڕەفعو لەسەرێکیتریشەوە لە بنوودی موعاهەدەدا حوقووقی مەشرووعەو موئەییەدەی کورد کە عیبارەتە لە موختارییەتی ئیدارە طەیو ئیعتیرافی پێ نەکراوە. کوردەواری بە عوموومی ئەم موعامەلەیە بە تەجاوزێکی صەریحی ئەزانن بۆ حوقووقی موعتەرەفەیان، بە یەکدڵو یەك ئاواز مەطالیبی خۆیان کە عیبارەتە لە موختارییەتی ئیدارە بۆ کوردستانی عیراقی، یەعنی لیوای کەرکووك، هەولێر، سلێمانی، ئەقضییەی شیمالی مووصڵو قیسمی سەرووی لیوای سیروان)).

ئەم وەزعە، کارێکی کردووە خەڵكو سەرانی خێڵاتو پیاوماقووڵانو، تەنانەت ئافرەتەکانی لیوای سلێمانیش، بە مەزبەتەو تەلگراف داوای بەجێهێنانی مافەکانی کورد لە مەندووبی سامیو سەرۆکی کۆمەڵەی گەلانو وەزیری کۆلۆنیەکانی بریتانیاو سەرۆکی حکوومەتی عیراق بکەن[٩٢]. هەتا بڕیاریش دراوە بەشداری هەڵبژاردن نەبن بۆ سێهەم خولی مەجلیسی نیابی[٩٣]. سەرانی کوردی هەولێرو کەرکووکیش هەمان هەڵوێستیان لەلا پەیدابووە.

حکوومەتی عیراق، لەبەردەم ئەم لێشاوی نارەزاییانەدا، پێی وابووە: پێویستە زەبروزەنگ بەرامبەر بە کورد بنوێنرێو، موتەسەریفو بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانیو قایمقامەکان لابرێنو داواکارانی حکوومەتی کوردی بگیرێن. ئەگەرچی کۆرنوالیسی ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ، بەتوندی ڕێی لەوە گرتووە، کەچی تۆفیق وەهبی بەگی موتەسەریفی هەر لابراوە. دواجاریش ناچار وەفدێکی بەرزی پێکهاتوو لە "یۆنگ"ی وەکیلی مەندووبی

---

[٩٢] کوردەکان موتەمادی داوای حوقووقیان ئەکەن، "ژیان"، ژ٢٥٢، ل٤؛ صوورەتی تەلغرافی ئەشرافو ڕوئەسای عەشائیرو سائیری طەبەقەی ئەهالیی سلێمانی بۆ مەراجیعی عالییە، "ژیان"، ژ٢٥٣، ل٣و، ژ٢٥٤، ل١-٤و، ژ٢٥٥، ل٣-٤؛ مەضبەطەیەکی تر بۆ تەئییدی طەڵەبی حوقووقی کوردان، "ژیان"، ژ٢٥٦، ل٣.

[٩٣] ئەهالیەکەمان ئیشتیراکی ئینتیخاباتی مەبعووثان ناکات، "ژیان"، ژ٢٥٢، ل٤؛ عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج١٠، ص٣٠١.

سامی‌و "جەعفەر عەسکەری"ی وەکیلی سەروەزیرو جەمیل مەدفەعی‌و جەمال بابانی جووتە وەزیر، بە بڕیاری ڕۆژی ٥/٨/١٩٣٠ی ئەنجومەنی وەزیران، هاتە کەرکووک‌و هەولێرو سلێمانی[٩٤].

"ژیان"، بە ١٠ لاپەڕە درەوشاوەترین ژمارەی خۆی سەروبەر بە ناونیشانی (تەشریف هێنانی فەخامەتی وەکیلی مەندووبی سامی‌و وەکیلی ڕەئسول وزەرای عیراق بۆ کەرکووک، هەولێرو سلێمانی‌و موجادەلەی کوردان)[٩٥]ـەوە، بۆ وردەکاریی باس‌و خواسەکانی کۆبوونەوەی سەرانی کوردو وەفدەکە تەرخان کردووە. هێنانەوەی قسەکانی هەندێ لەو نوێنەرانەی کورد، وەك پوختەو کۆی بیروڕای کوردی هەرسێ شارەکە، لەبەر بایەخی مێژوویی، بە پێویست ئەزانم:

محەمەد بەگی جاف: ((ئەم کوردانە بە یەك وجوودو یەك زبان داوای تەطبیقی موقەڕەراتی عوصبەتول ئومەم ئەکەن. ئەمە حەقمانەو ئەم حەقەمان ئەوێ‌و هەتا ئاخری تەعقیبی ئەکەین.. .. ئەم مەملەکەتە کوردەو، لەبەرئەوە هەموو کوردێك حەقی هەیە لە مەملەکەتی کورداندا طەڵەبی حقووقی میللەت‌و وەطەنەکەی بکات)).

ئەحمەد بەگی عوسمان بەگی هەولێری: (( پێویستە ئەم حەقە کە بە قەراری عوصبەتول ئومەم دامەزراوە، بماندرێتێ. لە ڕێی ئەم حەقە میللییەمانا ڕۆحی خۆمان فیدا ئەکەین)).

ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی: (( ئێمە لەم قسە پڕوپووچانە تێر بووین، بەحثی موستەقبەل ئەکەن.. .. هەتا ئاخری هەر موستەقبەلە. ئێمە حاڵەن تەطبیقی قەراری عوصبەتول ئومەممان ئەوێ. وە فەورەن ئەبێ لیوای دهۆك تەشکیل بکرێ)).

مەعرووف جیاووك: (( زۆر دەفعە بەعضی کەس‌و بەعضی لە گەورەکان بە منیان ئەگوت ئێوە بە پەنجەی ئەجنەبی ئەم طەڵەبە ئەکەن، یەعنی ئینگلیز.. .. ئێمە لەگەڵ عەرەبا مومکین نییە بە صوورەتی تەوحید بژین، فەقەط قابیلە وەکوو ئاوستریاو مەجارستان بژین.. .. جەریدەکانی بەغداد هاوار ئەکەن ئێمە عەرەبین‌و حکوومەتمان عەرەبە، ئەبێ کوردەکان وەکوو ئەرمەنیەکان لێ‌بکەین. ئیتر مومکین نییە پێکەوە بژین.. .. وا دیارە ئەم جەریدانە بە ڕەضای حکوومەت ئەنووسن، وە ئیللا ئەبوایە تەعطیل بکرانایە)).

ڕەمزی فەتاح: (( لەپێش هەمووشتێکا ئەبێ ئیعطای حقووقی موقەددەسەو ئیستیقلالی کوردان ببێ بە سەبەبی ئیتیحادی عونصوری کوردو عەرەب.. .. لە تەئریخی ٢٤ی کانوون ئەووەلی ٩٢٢ بۆ تەشەکولی حکوومەتێکی کوردییە لەبەینی حکوومەتی فەخیمەی بریطانیاو عیراقدا ئەم بەیانە نەشرو ئیعلان کرابوو. مادام کە ئەصڵ عوصبەتول ئومەم ئینتیدابی عیراقی داوە بە ئینگلیزو لە قەراری ئەم ئینتیدابەدا گوتوویەتی هەچ وەختێك عیراق صالح بێ ئیستیقلالییەتی ئەدرێتێ‌و، لەعەینی وەقتدا لازمە حکوومەتێکیش بۆ کوردەکان تەشکیل بکرێ، حقووقەن وا لازم بوو کە لەپێش تەنظیمی موعاهەدەی تازەی ئینگلیزو عیراقدا، کە تەئییدی قەراری عوصبەتول ئومەم‌و ئیستیقلالی حکوومەتی عیراق ئەکات، حکوومەتێکیش بۆ کوردەکان تەشکیل بکرایەو مەسئەلەی حکوومەتی کوردییەیش بە صەراحەت بخرایە مەتنی ئەم موعاهەدە تازەیەوە.. .. کوردەکان بەو شەرطە خۆیان خستە حەلقەی ڕابیطەی ئینگلیز کە حکوومەتێکی کوردییەی موستەقیللەمان بۆ تەشکیل بکرێ‌و لەسەر ئەمە ئیتیفاق واقیع بووبوو.. .. جەعفەر پاشا ئەفەرموێ کە بە لەك (واتە ١٠ ملیۆن/سدیق) پارەمان بۆ ئومووری نافیعەی کوردستان صەرف کردووە، ئەو ئومووڕەی نافیعەی ئەوان ئەڵێن قیشلاو ئستیحکاماتە بۆ موحافەظەی جەیشەکەی خۆتان. لەباتی ئەمە مەکتەبتان بۆ بینابکردینایە.. .. خەلافەتی عەباسییە لە ئەواخیری سەلطەنەتدا دەستی کرد بە ئستیخدامکردنی مەئموورینی تورك، فورس‌و کوردو، ئەمە بوو بە یەگانە سەبەبی ئیضمیحلالیان. حەز ئەکەم حکوومەتی عیراق ئەم تەجرەبەیە تیکرار نەکاتەوەو مەئموورینی کورد لەناو

---

[٩٤] تاریخ الوزارات العراقية، ج٣، ص٦٠-٦٤.

[٩٥] "ژیان"، ژ٢٥٧، ل١-١٠.

خۆیا ئیستیخدام نەکات، چونکە ئەبێ بە سەبەبی ئینحیطاطیو، کەذا ئیستیخدامی مەئمووری عەرەبیش لە کوردستانا ئەبێ بە سەبەبی مەحووبوونەوەی کوردەکان)).

حەمەئاغای ئەورەحمان ئاغا: (( کوردستان عیبارەت نییە هەر لە سلێمانی، لە زاخۆوە هەتا خانەقین هەموو کوردەوارییەو نایانەوێ لەگەڵ عیراقدا بژین و حکوومەتێکی موستەقیللەی کوردمان ئەوێ لەژێر ئینتیدابدا...... ئیمکانی ژیانێکی موتتەحید نییە لەبەینی عەرەب و کورداو هیچیان ئیستیفادە لەیەکتر ناکەن. بۆ هەردوولا وا چاکە کوردستانێك لەژێر ئینتیدابی عوصبەتول ئومەمدا)).

عیززەت بەگی وەسمان پاشا: (( کورد حکوومەتێکی موستەقیللەی ئەوێ لەژێر ئینتیدابدا. بە هەموو قووەتمانەوە بۆ ئەم غایەیە سەعی ئەکەین. ئەمجارە سیلاح و تفەنگمان قەڵەم و موراجەعاتە)).

مەجید ئەفەندیی حاجی ڕەسووڵ ئاغا: (( ئێستا هاوخوێن و براکانمان لە کوردستانی شیمالی لەطەرەف تورکەوە سەر ئەبڕڕێن. غەزەتەکانی بەغداد بە عەلەنی تەقدیری تورکەکان ئەکات و بەیانی شادمانی ئەکات. وە بە طوپ و تفەنگ و مەترالیۆز تەهدیدی ئێمە ئەکات کە ئەڵێ لەگەڵ تورکا ئەتانپلیشێنینەوەو عەرەب هیچی لە تورك کەمتر نییە.. .. بەڵێ غەزەتەکانی بەغداد کە لە عەلەیهیی حکوومەت مەقالێکیان نووسی، گورج دایئەخەن. بەڵام کە تەهدیدی کوردەکان بکات و لە ضددی ئێمە بنووسن، تەشویقیان ئەکەن و پارەیان ئەدەنێ)).

ئەم نارەزاییانە، دروست خەباتی ((قەڵەم و موراجەعات))ی ڕێبەرانی کورد بوون. بەڵام حکوومەتی-هەر لەسەرەتاوە- نا دیموکراتیی عیراق ئەوەی بۆ قووت نەچوە؛ هەتا کە ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ خۆپیشاندانی ئاشتییانەی خەڵك بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردن و داواکردنی مافەکانی کورد تا بەردەرکی سەرای سلێمانی سازکراوە، بە چەك و ئاگر بەرەنگاری بووەتەوەو خەڵتانی خوێنی کردووە.

**٢. ٢. ٨. هەواڵ و ڕاپۆرتەهەواڵ:**

هەواڵ کە سەرەکیترین بابەتی بەدەوامی ڕۆژنامەیە، لە "ژیان"یشدا، بەهەمان شێوە، زۆرترین پانتاییی بۆ تەرخان کراوە: ٤٥٢ لاپەڕە لە کۆی ٧٢٢ لاپەڕەی ئەم دەورەیە، واتە کەموزۆر ٦٢٪. تێکڕایش، ڕاپۆرتەهەواڵی تێدا ئامادەکراوە. لەکاتێکدا بەشەکانی تر، بە شیعرو وتارو هەمەجۆرو ئیعلانەوە، سەرجەم ٢٧٠ لاپەڕەی لێ پێکئەهێنن، واتە ٣٨٪.

بۆیە ئەکرێ بڵێین: "ژیان"، لەڕووەوە، پابەندی هونەری ڕۆژنامەوانی بووەو دریغیی نەکردووە؛ هەوڵی داوە زیاترین ژمارەی هەواڵەکانی دەرەوەو عیراق و ناوشاری سلێمانی، بەکورتی و چڕوپڕی، بخاتە بەرچاو. ئەو هەواڵانە، بۆ ڕۆژی خۆی کە ئامرازی تری پەیوەندی کەمتر فەراهەم بووە، گرنگ و کاریگەر بوون و، نەخشیان لە فراوانکردنی جوغزی ئاگاداریی و شارەزاییی خوێندەوارانیدا هەبوە.

دەرهێنان و کۆکردنەوەو پێش چاوخستنەوەی ئەم کۆمەڵە هەواڵە گرنگەم، بۆ مێژوو، بە سوودبەخش زانی:

**٢. ٢. ٨. ١. ناوشار:**

**٢. ٢. ٨. ١. ١. جەمعییەتی زانستی کوردان:**

* ئەم زاتانە، لە سەردانی سلێمانیدا، یاربووی مەکتەبی زانستییان کردووە: ئیسماعیل بەگی کوڕەزای عەبدوڵڵا پاشای ڕەواندزی، ٥٠ ڕووپیە (ژ١٠٠، ل٤)؛ سەیفوڵڵا بەگی عیززەت بەگی خەندان، ٥٠ ڕووپیە (ژ١١٠، ل٣)؛ ئەمین زەکی بەگ، ١٠٠ڕووپیەو، صەبری بەگی حاجی عەلی ئاغا، ١٠٠ ڕووپیە (ژ١١٤، ل٣).

* (( ئەم زانستییە تەقریبەن سێ ساڵ لەمەوپێش بۆ ئەم غایەیە کە نەخوێندەوارەکانمان تیا بخوێنن...... کرایەوە، هەرچەندە موددەتێك بە صوورەتێکی مونتەظەم عەینی غایەی تەئمین کرد، بەڵام لەپاشا بە هەر نەوعێك بوو و لەبەر هەر ئەسبابێك بوو دواکەوت و مەئیووسییەتێکی زۆری دا بە میللەت.. .. بەڵام صەد شوکور لەپڕێکا سەعادەتی موتەصەرپیفی خۆشەویستی حاضیرەمان (ئەحمەد عوسمانی هەولێری/س.).. .. ئەم سووئی

تەفاهومەیشی ڕەفع کرد، زانستیی هەر بەو غایەو ئیستیفادەی طەڵەبە نەخوێندەوارەکانمانەوە ئیحیا کردەوە))
(تەمثیل بۆ مەنفەعەتی زانستی، ژ١٢٧، ل١-٢).

* ئەحمەد ڕەشیدو عەلی ئەحمەدو عەبدوڕڕەحمان حاجی عەلی‌ی قوتابیانی زانستی، لە (ژ١٤٢، ل٢)دا وتارێکی هاوبەشیان بەناوی (نوبذەیەك لەخوصووص زانستی‌یەوە) بلاوکردووەتەوە.

* کەریم بەگی سەعید بەگی سکرتێری زانستی، ئەم (بۆ زانینی هەموو)ەی لە (ژ١٦٠، ل٤و، ژ١٦١، ل٤و، ژ١٦٢، ل٤)دا ڕاگەیاندووە: (( هەرکەس بیەوێ فێری خوێندنەوەو نووسین بێ، پاش جەژن زانستی طەڵەبە قەیدو قوبووڵ ئەکات. ئەم فرصەتە لەدەست بەن، پەشیمانیی لەدوایە)).

* عەبدوڵڵا لوطفی ئەفەندی‌ی حاجی عەلی ئاغا، ١٠٠ ڕووپیەی بەخشیوە بە زانستی (تەشەکور، ژ١٧٣، ل٣).

* صەبری بەگی حاجی عەلی ئاغا، ١٠٠ ڕووپیەی تری داوە بە زانستی (کەریم سەعید، بەیانی تەشەکورو یەکدوو قسە، ژ٢٠١، ل٢).

جێی وتنە، کەریم بەگ بۆ یەکەمین جار لەم ژمارەیەی "ژیان"دا، ١٩٢٩/٩/٣٠، زاراوەی (کۆمەڵ)ی بۆ (جەمعییەت)ی باوی ئەودەمە بەکارهێناوە، بەڵام هێشتا نەخراوەتە پاڵ (زانستی کوردان).

* بینای قوتابخانەی زانستی، کۆتایی‌ی ١٩٢٩، لە جادەی صابوونکەران بووە (تەشەکورو بەیانی مەمنوونییەت، ژ٢١٧، ل٢).

* بەپێ‌ی (بۆ زانینی هەموو) یەکی سکرتێری زانستی (ژ٢٢٤، ١٩٣٠/١/٢٣، ل٤)، ((صنفی تازە کراوەتەوە بۆ فێربوونی ئینگلیزی‌و، موعەللیم ڕەفعەت غەوث ئەفەندی مەجانەن ئەیڵێتەوە)).

* (( جومعە ٢٤ی مایسی ١٩٣٠ ئەعزا دایمیەکانی کۆمەڵ‌و قیسمێ لە ئەشراف‌و ئەهالی دەعوەت کران. ئێوارە لە زانستی کۆبوونەوە، ٧ کەس بۆ کۆمەڵی ئیدارە هەڵبژێرران: مودیری مەکتەبی موتەوەسیطە ڕەشید زەکی، حاکمی سوڵح مەلا سدیق ئەفەندی، موعەللیمی سانەوی ڕەفیق حیلمی، فایەق بەگی مارف بەگ، میرزا تۆفیق قەزاز، موتەرجیمی ئیداری ڕەشید نەجیب، کەریم سەعید ئەفەندی)) (هەڵبژاردنی کۆمەڵی ئیدارەی زانستی، ژ٢٤١، ل٣).

* کۆمەڵی زانستی، سوپاسنامەی بۆ مامۆستایانی مەکتەبی کچان ناردووە کە پۆلێکی تایبەتیان بۆ ئافرەتە نەخوێندەوارەکان کردووەتەوە (ژ١٤٢، ل١-٢).

*((١-هەیئەتی ئیدارە قەراری‌دا بۆ ئەوەی مەنبەعێکی تری واریدات تەئمین بکات بۆ زانیستی، هەموو ئێوارەی جومعان لە بینای زانستیدا دومبەڵە بکرێت‌و، عەلاوەتەن بۆ تەهزیبی ئەفکارو تەنویری خەڵق هەموو ڕۆژی جومعەیەك پێش کردنی دومبەڵەکە، لە سەعات نۆی کوردیدا موحازەرەیەك بدرێت. لەپێشەوە مەوزووعی موحازەرەکە لە غەزەتەدا نەشر ئەکرێت. لەوحەڵەدا هەموو کوردێك بۆ هاتن موختارە.

٢-لە بینای زانستیدا کتێبخانەیەك تەنزیم کراوە. هەموو خواهیشکەرانی عیلم ئەتوانن هەمووڕۆژێك لە سەعات ٣ هەتا ٧ی ئینگلیزی کە ئەکاتە هەشت هەتا دوانزەی کوردی، لەوێدا موتاڵەعە بکەن. جگە لە کتێب بەعزێ لە ڕۆژنامەکانی بەغداو میسریش مەوجوودەو، هەروەختێ بودجەی جەمعییەت خۆی گرت، ئیشتیراکی مەجەللە موهیممەکانی ئەوروپاو میسریش ئەکرێت. حاڵی حازر کتێبخانەکە زۆر فەقیرەو موحتاجی هیممەت‌و حەمییەتی هەموو کوردێکە، چە بە ئەمانەت چە بە بەخشین وەڵەو تاقە کتێبێکیش بێت بە منەت‌و فەخرەوە قوبووڵ ەکرێت)) (قەراری کۆمەڵی زانستی، هەمان ژمارە، ل٣-٤).

* زەواتی موحتەرەم‌و فیداکاری میللەت: ڕەشید ذەکی، ڕەفیق حیلمی، ڕەشید نەجیب، ئەحمەدی عەزیز ئاغا، محەمەد نووری ئەفەندی صاڵح، محەمەد ذهنی ئەفەندی، عەبدوڵڵا عەزیز، عەبدوڵڵا سامی، شەو بە خۆڕایی لە زانستی دەرس ئەڵێنەوە (ژ٢٤٤، ل٣).

* (( ئیجتیماعی عموومیی زانستی: زانستی تەزکەرەی مەتبووعی بۆ ئەهالی ناردووە بۆ ئیجتیماعێکی عموومی ڕۆژی جومعە سەعات ٩،٥ی کوردی لە بینای زانستی)) (هەمان ژمارە، ل٣).

* ((تەماشای حیسییات و سەخای میللەتەکەمان کەن: ڕاپۆرتە هەواڵێکە سەبارەت بە ئاهەنگی ڕۆژی جومعەی ١٩٣٠/٦/١٣ کە لە بینای زانستیدا کراوە بۆ پیتاککردن بۆ کڕینی چاپخانەیەکی گەورە. دوای مۆسیقاو گۆرانیی نیشتمانیی (لەم زەمانی ئینیباهەدا)ی مەکتەبی موتەوەسیتەو غەزەلێکی کوردیی (ئەی بادی صەبا تۆ قاسیدی من بە مەردانە)ی قوتابییەکی زانستی، سەید ئەحمەدی سەید عەبدوڕڕەحمان نوتقێکی کوردیی داوە. لە کۆتاییدا قوتابی فایەق تۆفیق چەند شیعرێکی خوێندووەتەوە. ڕەشید نەجیب نوتقێك و ڕەفیق حیلمیش نوتقێکی درێژی داوە. ١٥٩کەس (لیستەکە تەواو نەبوە) ٣١٤٤ ڕووپییەیان بەخشیوە)) (ژ٢٤٥، ل١-٣و، ژ٢٤٦، ل٢-٣و، ژ٢٤٧، ل٤و، ٢٤٨، ل٤).

* (( هەیئەتی ئیدارەی زانستی لە (تەشەکوری خالیسانە)دا، داوا لە سەرخێلان و خەڵکی بەشدارنەبووی کۆبوونەوەکە ئەکات: هەرکەس بەقەدەر ئیقتیداری خۆی کیسەی سەماحەتی بکاتەوەو موعاوەنەت بفەرمووێ))
(ژ٢٤٥، ل٣-٤).

(( هەیئەتی ئیدارەی کۆمەڵی زانستی لە (تەشەکورێکی عەلەنی)دا سوپاسی مودیرەو هەیئەتی مەکتەبی کچانی کردووە کە ڕۆژەتێ و پێنج قوتابیی کچی بە بەرگی جوانەوە بۆ ئاهەنگی زانستی ناردووە)) (ژ٢٤٧، ل٤).

* (سوپاسی ئاشکرا)ی دارتاش کراوە کە دوو کورسیی بە خۆڕایی بۆ زانستی کردووەو، ئیبراهیم ئەحمەدی قوتابیی سانەویی بەغدایش هەندێ کتێبی زۆر بەکەڵکی بەخشیوە بە کوتوبخانەی زانستی (ژ٢٤٩، ل٣).

* زانستیی ژنان:

(( هەمووشەوێك لە دووصەد قوتابیی صنعەتکار زیاتر لەم مەعهەدەدا ئەخوێنن)). هەتا (( پارەیەکی زۆری کۆکردەوە بۆ ئەوەی مەطبەعەیەکی گەورەی بۆ بکڕرێ)). (( ذاتەن موددەتێکی زۆرە صنفێکی تایبەتی بۆ ژنە نەخوێندەوارەانمان کراوەتەوەو بە ئەکثەری ئافرەتەکانمان هەموو ئێوارەیەك تیا ئەخوێنن.. .. ئەم دەفعەیەیش بۆ ئەوەی فەرعێکی زانستیی ژنان بکەنەوە کە تیا کۆببنەوەو تیا بخوێنن، ئافرەتەکانمان قەراریان دا ئیجتیماع بکەن و ئیشوکاری ئەم زانستیی ژنانە پێك بێنن، لەسەر ئەوە ڕۆژی ٢٨ی تەمووزی ٩٣٠ ساعەت نۆی عەرەبی لە ماڵی حەفیدزادە حەفصەخانمی نەقیبدا کۆبوونەوە. دوای کۆبوونەوەو شەربەت و چا خواردنەوە، لەطەرەف حەفصە عیرفان کە قوتابییەکی صنفی شەشەمی مەکتەبی کچانە، بە زبانی حەفصەخانمەوە نوطقێکی ئیفتیتاحی خوێندرایەوەو غەرەض لە ئیجتیماعەکە چییە بەیانی کرد. لەدوای ئەمە لەلایەنی بەدرییەخانمی شێخ قادر نووری ئەفەندییەوە ئیرتیجالەن نوطقێکی شیرین خوێنرایەوە. غەیری ئەمانەش زەکییە میرزا تۆفیق ئەفەندی قەزازو ناهییە شێخ سەلامیش هەریەکە نوطقیکیان خوێندەوە.. .. لە خیتامی ئەمانەدا ئافرەتەکان بە عموومی قەراریان دا بۆ کرێی ئەو خانووەی کە بۆ ئەم مەعهەدە ئەگیرێ و بۆ ئەساس و ماڵەزیمەو کیتابخانەی جارێ لەپێشەوە میقدارێك کۆبکەنەوە. لەسەر ئەوە کچە منداڵەکانی مەکتەب بەناو ئافرەتەکانا گەڕان و ئەو ڕۆژەو گوڵەی کە حاضریان کردبوو، یەکەیەکە کردیان بە بەرۆکی ژنەکاناو، ئەوانیش موقابیل بەم ئیشەو بۆ ئەم غایە عالییە کیسەی سەخایان کردەوەو لەئانێکدا میقدارێکی موناسیب کە هەمووی عیبارەت بوو لە ٨١٧ هەشتصەدو حەڤدە ڕووپیە پارەیان کۆکردەوەو تەبەڕوعیان کرد. باخصووص موحتەرەمە حەفصەخانم لەدوای هەموویان ماکینەیەکی سینگەری خەیاطی کە هیچ ئیستیعمال نەکراوەو بە ئەلەکتریك ئیش ئەکات و ئاخر مۆدەیەو کە بە (٣٩٥) ڕووپییەی کڕیوە بۆ ئەوەی بە ئەبەدی لەم مەعهەدی ژنانەدا بمێنێتەوەو ئیستیفادەی لێبکرێ تەبەڕوعی فەرموو و ئەم سەخا حاتەمانەی بە گەرمییەوە تەقدیر کرا.. .. لەدوای ئەمانە شەفیقە سەعید ئەفەندی کە ئەمیش قوتابییەکی موقتەدیرەی مەکتەبی کچانە، هەڵسایە سەرپێ بەناوی عموومەوە بەرامبەر بە

حیسسییاتی بەرزی ئافرەتەکان عەلەنی تەشکوری کردن‌و بەم نەوعە ئیجتیماعەکە دوایی‌ی هات‌و بڵاوبوونەوە)) (ژ٢٥٥، ل١-٣).

٢. ٢. ٨. ١. ٢. جموجووڵی هونەری:

* تەمثیل بۆ مەنفەعەتی زانستی:

(( شەوی پێنجەشممەی موصادیفی ٩٢٨/٨/٢٩ لەطەرەف هەیئەتی تەدریسییەو طەڵەبەکانی زانستی صرف بۆ مەنفەعەتی زانستی‌و تەئمینی تەمادی‌ی خوێندنی طەڵەبە ئومییەکانی زانستی تەمثیلیك کرا.. .. قیسمێك لە ئینقیلابی گەورەی فەرەنسەو خەلعو ئیعدامی قراڵ لوئیسی ١٦هەم بە کەماڵی مووەفەقییەت ئیجرا کرا.. .. سەعادەتی موتەصەرپیفی ئەکرەمی، ئامیر مەنطیقە، عوموومی ضابطانی جەیش، رِوئەسای دەوائیر، ئەشراف‌و هەموو ئەهالی تەشریفیان هێنابوو، بە نەوعێك کە کورسی بەرنەئەکەوت زۆر کەس بەپێوە راوەستابوو)). (( بە پێنج رووپیە بلیتی مەوقیعی مومتازیان ئەکرِی‌و حەتتا بە نەوعێك تەئثیری کردە ئەهالییەوە کە هەیئەتی تەمثیلیە مەجبوور بوو شەوێکیش تیکراری بکاتەوە.. .. تەقریبەن ٦٠٠ رووپیەی بۆ زانستی تەئمین کرد کە ئەم نەوعە موعاوەنەتە ئەبێتە باعیثی ژیان‌و ئیستیفادەی طەڵەبە ئومییەکان)) (ژ١٢٧، ل١-٢).

* سینەما بۆ زانستی:

(( بۆ ئەوەی واریداتێك بۆ دەفعی ئیحتیاجی مەکتەبە ئومییەکەی زانستی تەئمین بکات، بە سەبەبی تەشویقاتی مەعاریفپەروەرانەوە ئەو سینەمایەی کە لە سلێمانیدا مەوجوودەو ئیش ئەکات، شەوی جومعەی ١٩ی مانگ بۆ ئەم خوصووصە تەخصیص کرا. سەعادەتی موتەصەرپیفی خۆشەویستمان بیلذات تەشریفی هێناو، عومومی رِوئەسای دەوائیرو ئەشراف‌و هەموو حەمییەتمەندانی شار بە خواهیشێکی طەبیعییەوە ئیشتیراکیان کردو تەشریفیان هێنا بۆ سەیری ئەم سینەمایە. وە نەتیجە بە سەبەبی ئەم هیممەتەوە واریداتێکی موناسیبی تەئمین کرد.. .. وە ئەمرِۆ لەم جێگایەدا نزیکی ١٥٠ قوتابی کە لەبەر دەردی ئیدارە ناتوانن لە قوتابخانە رەسمیەکاندا بخوێنن، لەم مەکتەبەدا دەوام ئەکەن، وە ئەکثەریان بەتەواوی لێوەی بەهرەمەند بوون)) (ژ١٦٩، ل١).

* حەفلەو تەمثیلی مەکتەبی کچان:

(( مودیرەو هەیئەتی موحتەرەمەی مەکتەبی کچان بۆ ئەوەی فەننی تەمثیل‌و مەزایاکەی لە ئافرەتی موحیطەکەمان بگەیێنن، حەفلەو تەمثیلیکیان رێك خستووە.. .. وە چەند رِۆژێك لەپێشا لەطەرەف هەیئەتی تەدریسییەی مەکتەبەکەوە ئەکثەر لە ئافرەتی مەملەکەتەکەمان دەعوەت کرابوون‌و، هەموو بە سروورەوە ئیشتیراکیان کرد.. .. وە حەتتا بۆ ئەوەی بەعومووومی ئەم نەوعە حەفلەیە ببینن، رِۆژی ئاتیش کە جومعە بوو قیسمێکی زۆرتری ئافرەتی وڵاتەکەمان دەعوەت کرانەوەو دیسانەوە حەفلەکەیان بۆ کرتنەوەو تەمثیلەکەیان ئیجرا کردەوە)). (( هێشتا مەعنەوییاتی موحیطەکەمان موساعەدەی نەئەکرد بیلذات بچین‌و ئەم حەفلەیە ببینین)) (ژ٢٣٢، ل١-٢).

مادام پێنجشەممەو جومعەی پێشوو ئاهەنگ‌و تەمسیلەکە کراون، ئەبێ لە رِۆژانی ١٣و ١٤ی مارتی ١٩٣٠دا بووبن.

* پرۆغرام‌و نوطقی تەمثیل‌و حەفلەکەی مەکتەبی کچان:

راپۆرتەهەواڵێکە سەبارەت بەو ئاهەنگ‌و تەمسیلە، کە بریتی بوون لە:

یەکەم تەمسیل: ئینسان ئەوی ئەیچێنێ، ئەوە ئەدروێتەوە بە سێ پەردە، دوویان بە پەخشان (نثر)و، سێهەم بە شیعر (نظم).

دووەم تەمسیل: دایکێکی جاهیل کە خاشخاشی داوە بە منداڵەکەی‌و نەصیحەتی دوقتۆرێك، بە شیعر.

جگە لەوە، شیعرو وەرزش‌و نوتق‌و گۆرانیشی تێدا وتراوە (ژ٢٣٣، ل١-٣).

* ئیحتیفالێکی مەکتەبی هەڵەبجە:

راپۆرتەهەواڵێکە لەسەر ئاهەنگێکی قوتابخانەی هەڵەبجە کە سەعات ٨,٠٠ی ڕۆژی سێشەممەی ١/٤/١٩٣٠ جۆرەها وەرزش و یاری و گۆرانیی نیشتمانی و میللیی تێدا وتراون و، دەستەی مامۆستایان و قایمقامی قەزای هەڵەبجە و سەرۆکی دائیرەکان و مەئموورو هەموو ئەشرافی هەڵەبجە ئامادەی بوون. ٣٥٣,٨ رووپیەی وەك پیتاك تێدا کۆکراوەتەوە (ژ٢٣٤، ل١-٢).

* نەقش و دروومانەکانی کچان، ئیشی دەست و دروومان و نەخشی قوتابیانی بردووە بۆ پێشانگای کەرکووك و، هی کچانی کەرکووکیشی لەگەڵدا هێناوەتەوە و، لە بەیانیی ٢ی حوزەیرانی ١٩٣٠یەوە دانراون و خراونەتە پێش چاو، بەیانیان بۆ پیاو و ئێواران بۆ ئافرەت (ژ٢٤٢، ل٣).

**٢. ٢. ٨. ١. ٣. چالاکی و پێشکەوتنەکانی شار:**

* کانوونی دووەمی ١٩٢٨ هێڵی تەلەفۆن و تەلگرافی سلێمانی لەگەڵ شارەکانی تردا کرایەوە (بە موناسەبەتی تەئسیس و مواصەڵەتی تەلغرافەوە، ژ٩٧، ل١-٢).

* تا کاوونی دووەمی ١٩٢٨ بانقی کشتوکاڵی لە شاردا نەبوە (ئیهتیمام لەخوصووص فەلاحەتەوە، ژ٩٨، ل١-٢).

* مایسی ١٩٢٨ چاوەڕوانی هێنانی ئەلەکتریکی گەورەکراوە (ئەوانەی کە ئاثارێکی باش بەجێ ئەهێڵن الی الابد نامرن و ناویان باقییە، ژ١١٣، ل١-٢).

* خەستەخانەی بەیطەری لە سلێمانی:

راپۆرتێکە لە سەر چالاکییەکانی خەستەخانەکە بۆ چارەسەری وڵاغ و لە قەسابخانە (ژ١٧٧، ل١-٢).

* تەمووز-ئابی ١٩٢٩ بنکەی پۆلیس لە ناحیەی ماوەت کراوەتەوە و، ٥٠ پۆلیس و قۆمیسەرێکی بۆ دانراوە (وەکوو باقیی ئەهالیەکەمان ئەهالیی ماوەتیش کەوتە ئیستراحەتەوە، ژ١٩٠، ل١-٢).

* شارەکەمان بۆ ساحەی تەرەقی و ئاوەدانی هەنگاوێکی گەورەتری هاویشت:

(( بەلەدییە لە نەتیجەی سەعی و کۆششێکی زۆردا مووەفەق بوو بە تەنویرکردنی شارەکەمان و بە مەبلەغێکی زۆر موئەسەساتێکی ئەلەکتریقییەی گەورەی بۆ تەئسیس کردین. وە هەتا دوو مانگیتر لە شارەکەمانا خوطووطی ئەلەکتریق ئەبینین و جادە و کۆڵانی شارەکەمان بە چرای ئەلەکتریق ڕووناك ئەکرێتەوە)) (ژ١٩١، ل١).

* مژدە بۆ ئەهالی: ئەلەکتریکەکەمان تەواو بوو:

ئەبێ سەرەتای کانوونی یەکەمی ١٩٢٩ پرۆژەی کارەبای شار تەواو بووبێ (ژ٢١٦، ل١-٢).

* ئینتیخاباتی بەلەدییەی سلێمانی: (ژ٢٢٨، ل٣) ؛ ئەهالییەکەمان لەم ئینتیخاباتەدا ئیصابەتی کرد: (ژ٢٢٩، ل١-٢).

شوباتی ١٩٣٠ هەڵبژاردن بۆ مەجلیسی تازەی بەلەدییە کراوە و، حەمەئاغای ئەورەحمان ئاغا و مەحموود ئەفەندیی قادر ئاغا و شێخ محەمەدی شێخ مستەفا هەڵبژێرران. مەحموود ئەفەندی بە سەرۆکی شارەوانی هەڵبژێرراو، ئەوانی تریش بە ئەندام.

* صەیفییەی لوبنان:

داواکراوە هاوینەهەوارەکانی کوردستان ئاوا بکرێنەوە و، ڕێگاو ئوتێل و پێویستیی تری گەشتوگوزاریان بۆ دابین بکرێ، تا جێی ئەوانەی لوبنان بگرنەوە (ژ١٢٠، ل١-٢).

* تکا:

سلێمانی تا ئەودەمە نەخۆشخانەیەکی تەواوی تێدا نەبوە؛ داواکراوە دائیرەیەکی تەندروستیی ڕێکوپێك بە دەستەیەکی پزیشکییەوە دابمەزرێنرێ (ژ١٢٣، ل١-٢).

* ڕێکخستنی ڕێگاو ئیستیفادەی:

ڕێگاکردنەوە بۆ پێنجوێن و، لە هەڵەبجەوە بۆ خانەقین و، لە دووکانەوە بۆ میرزا ڕۆستەم و قەلادزێ و بیتوێن و، لەوێشەوە بۆ کۆیەو هەولێرو ئەمجا ڕەواندز، خراوەتە بەردەم کاربەدەستان (ژ١٢٥، ل١-٢).

* ڕەبطی سلێمانی بە بەغدادەوە بە واسیطەی تەلەفۆنەوە:

ئەوکاتە پۆستە هەفتانە ٢-٣ کەڕەت هاتوچۆی کردووە؛ هی ئاسایی هەفتەی دووجارو، هی نائاسایی هەموو ڕۆژێك هاتووەتە سلێمانی و ڕۆیشتووە. لە کانوونی یەکەمی ١٩٢٨دا، ساڵێك بووە تەلەفۆن بۆ سلێمانی ڕاکێشراوەو بە بەغداوە بەستراوە (ژ١٤٥، ل١-٢).

* نادیی مەئموورین:

ئەو نادییە بەشێوەیەکی کاتی لە (چایخانەی بەلەدییە)ی نزیکی سەرادا بووە (ژ١٤٩، ل١-٢).

* جادەی دەباخانەو نەظافەت:

کانوونی دووەمی ١٩٢٩ بڕیار دراوە دەباخانەکانی سەر ڕێی کەرکووك لابڕێن و بگەوێزرێنەوە بۆ لای قەسابخانە تازەکە تا بەهار (ژ١٥١، ل١-٢).

* لە سەمای مەعاریفا ئەستێرەیەکی گەش:

(( ئەحمەد ئەفەندیی عەزیز ئاغا قیرائەتێکی ئەلفبای کوردیی لەسەر گرامێرەکەی تۆفیق وەهبی بەگ داناوە، بەم نزیکانە خۆی لە مەکتەبە ئومییەکاندا ئەیڵێتەوە)) (ژ٢٤١، ل١).

ئەو قیرائەتە سۆراخی نییە.

* شوکوور ڕوئەسای عەشائیرکانیشمان بەجیددی بۆ نەشری مەعاریف هەول ئەدەن:

تەوێڵە ١٩٢٩ قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە. قوتابخانەیەکی شەوانە، بە هیممەتی قادر بەگی جەعفەر سوڵتان، بۆ ئەوانەی کە تەمەنیان تێپەڕیوە، کراوەتەوە (ژ٢٢٧، ل١-٢).

* لە مەکتەبی کچانی سلێمانیدا سینفێك بۆ تەلەبە نەخوێندەوارەکانمان:

پۆلێك بۆ ژنە نەخوێندەوارەکان کراوەتەوە، ئێواران سەعات ١٠-١١ی عەرەبی ئەلفباو حیسابی تێدا ئەوترێتەوە (ژ٢٤٠، ل٢).

* مەکتەبی ئوممی لە چەمچەماڵ:

مامۆستاکانی چەمچەماڵ شەوانە ٢ سەعات دەرس بە دوو پۆلی نەخوێندەوارەکان، کە نزیکەی ٦٠ قوتابین، ئەڵێنەوە (ژ٢٤٣، ل٢).

* بۆ پێشەوە هەنگاوێکی تر:

مامۆستاکانی هەڵەبجە دەرسخانەیەکیان بەتایبەتی کردووەتەوە، هەمووشەوێك دوو سەعات دەرسی تێدا ئەڵێنەوە بە ٤٩ قوتابی لە ئەهالی (ژ٢٤٥، ل٤).

**٢. ٢. ٨. ٢. دەرەوەی شار:**

* ژیان برایەکی خۆشەویست و پشتیوانێکی بەقووەتی چنگ کەوت:

(( عەزەتەی کەرکووك کە ڕەفیقێکی خۆشەویستی "ژیان"ە، بە سەبەبی ئەوەوە لە کوردستان و لەناو میللەتی کوردا ئینتیشار ئەکات، بۆ ئەوەی ببێ بە ئاوێنەی حاڵ و تەرجومانی حەقیقەتی میللەتەکە. ئیتر لەمەودوا قیسمێکی زۆری بە کوردی ئەنووسرێ و ئینیتشار ئەکات.. . شوکور دوێنێ دوو صەحیفەی بە کوردی نووسرابوو، هاتە سلێمانی)). (( ئەم دوو لیوایە کە دراوسێی یەکترین و ئەهالیەکەی هاوخوێن، هەمجنس، هاوزبان و هەموو غایەیەکیان یەکە، بە سەبەبی ئەوەوە غەزەتەی کەرکووك هەتا ئێستا بە لیسانی مەحەللی و مادەرزادی خۆی ئینتیشاری نەئەکرد، لە هاواری یەکتری نەئەگەیشتین و بە فەریادی یەکتری نەئەکەوتین)) (ژ٢٣٨، ل١-٢).

غەزەتەی کوردیی کەرکووك:

(( غەزەتەی کەرکووك کە هەتا ئێستا دوو صەحیفەی بە کوردی دەرئەچوو، قەرار دراوە هەموو ڕۆژێکی دووشەممە دەرچێ و چوار سەحیفەی بە کوردی بێ)) (ژ٢٤٠، ل٤).

واتە لە ٧ی مایسی ١٩٣٠یەوە دوو لاپەڕەی بە کوردی دەرکردووەو، هەر بەپێی ئەو بڕیارە، ئەبێ لە دووشەممەی ڕێکەوتی ٢٦ی مایسی ئەوساڵەیشەوە بە چوار لاپەڕەی کوردی دەرچووبێ. ڕۆژنامەی "کەرکووك" کە لەبری و وەك درێژکراوەی "نەجمە"ی تورکی زمانی بەلەدییەی کەرکووك، یەکەم ژمارەی ١٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٦ بەوناوە تازەیەوە بڵاوبووەوە، تا دوا ژمارەی (٢٠٣٦)ی ٢٠ی ئابی ١٩٧٢[٩٦]. بەقسەی ئەدمۆندز، تەنیا ٥٣ ژمارەی، لە (ژ٣٠٢)ی ٢ی مایسی ١٩٣٠یەوە تا ژ(٣٥٤)ی ٢٩ی مایسی ١٢٩٣١، لەپاڵ تورکیدا، بەشی کوردیشی هەبوە[٩٧].

* کۆمەڵی یانەی سەرکەوتن:

(( نائیبی هەولێر مەعرووف بەگ جیاووك لەگەڵ چەند پیاوێکی ترا لە وەزارەتی داخلییەی عیراق داوای مەئزوونییەتیان کردووە بۆ ئەوەی کۆمەڵێك تەشکیل بکەن و بەناوی (یانەی سەرکەوتن)ەوە نادییەك دابمەزرێنن. وەزارەتی داخلییە مەئزوونییەتی داونێ و، لەسەر ئەوە خەریکی دامەزرانني کۆمەڵەکەن)).

(( جەنابی مارف بەگ جیاووك ڕۆژی ئەم جومعەیە ڕەسمی کردنەوەی کۆمەڵی (یانەی سەرکەوتن) ئیجرا ئەکات. بۆ ئەم خوسووسە گەلا لە ئینگلیزەکان، پیاوە گەورەکانی بەغدادو کوردەکانی دەعوەت کردووە)) (ژ٢٤١، ل٢، ٤)

(( ڕۆژی جومعەی ٣٠/٥/٣٠ لە (ڕۆیاڵ سینەما)دا ڕەسمی کردنەوەی بە سوورەتێکی ڕێکوپێك و جوان جێبەجێ کراوە. لە میعادی خۆیدا بانگکراوەکان کە عیبارەت بوون لە مەعالی وەزیری عەدلییەو وەزیری مەعاریف و نەقیبول ئەشرافی بەغدادو شاعیری شەهیر جەمیل سیدقی ئەفەندیی زەهاوی و هەموو مەئموورین و زابیتان و کوردەکانی بەغداد کۆبوونەتەوە)) قوتابیانی گوردی بەغدا نەشیدی مەلەکی بە عەرەبی و هی وەتەنیی کوردییان وتووە. مارف جیاووك و خەڵەف شەوقی داودی نوتقیان تێدا داوە. ئەمانە بە کۆمەڵی ئیشکەری یانە دەرچوون: ئیبراهیم حەیدەری، ئەمین زەکی بەگ، مارف جیاووك، مەحموود جەودەت، عەبدوڵلا لوتفی بەگ، خەڵەف شەوقی داودی، محەمەد عەلی زابتی تۆپچی، ئەحمەد ئاغای کەرکووکی، موحامی عارف پشدەری (ژ٢٤٣، ل١-٢).

* وەزارەتی تازە:

وەزارەتە تازەکەی عەبدولموحسین بەگ ئەسسەعدوون لە شوباتی ١٩٢٨دا کوردی تێدا نەبوە، لەکاتێکدا کەمەنەتەوەکانی تر هەریەکە یەك یا دوو وەزیری هەبوە، بۆیە "ژیان" نووسیویە: (( قەومی بەدبەختی کورد بەنەظەر ئەم ئەقەلییاتەوە ئەکثەرییەتێکی عەظیمە تەشکیل ئەکەن و، ئەگەر موافیقی عەدل و موساوات و بەپێی نوفووسی مەوجوودەی حەرەکەت بکرایە، حەقی ئیشغالی سێ کورسییان ئەبوو. مەعەل ئەسەف سەماحەتی بەخشینی کورسییەکیشمان لەگەڵ نەکرا)). ڕۆژنامەکانی بەغدا بەتەوسەوە نووسیویانە: لەبەر ئایەتی (تسعة رهط يفسدون في الارض)، نایانەوێ وەزارەتی نۆیەم بدەنە کورد، نەوەکوو ئیفسادی ئەرزی عیراق بکەن: ((طیفلی مەشرووطییەتی عیراق هەتا ئێستا پێنج باوك وەیا پێنج وەزارەتی دێ، لەمانە تەنها دوانی ئەخیر کورسییەکی کوردی تێدابوو. نازانم کام یەك لەم پێنجە بە صەمیمییەت و جیددییەتێکی وەطەنپەروەرانە بۆ مەنافیعی موڵك و میللەت تێهەڵچوون. وە چە خدمەتێکی موهیمیان بۆ ئوممەتەکەیان کردو، چە ئەثەرێکی تەرەقیی سیاسی، ئیجتیماعی، ئیقتیصادییان پێنیشان داو موفسید تەوەهومی لێ تێکدان)). (( ئێمە بەناوی سەلامەتیی

---

[٩٦] مصدق توفی، یەکەمین ڕۆژنامەڤانیا کوردی، "مەتین" (گۆڤار)، دهۆك، ژ٩٩، نیسانی ٢٠٠٠، ل٥٠-٥١.

[٩٧] سی.جەی. ئەدمۆندز، بیبلیۆگرافیای چاپکراوی کوردیی باشوور (١٩٢٠-١٩٣٦)، لەئینگلیزییەوە وەرگێڕانی سەلمان عەلی/ دەستخەت.

وەطەنەوە ئارەزوومان وابوو کە هەموو عەناصیری موختەلیفەی عیراق دەست بەنە دەست یەك و موتتەفیق بن.. .. وە دیسان بەناوی عەدل و موساواتەوە ئارەزوومان ئەکرد کە ڕەئیس وزەرای تازە لە تەشکیلی قابینەکەیدا قەومی کوردی بە ئەکثەرییەتی موهیممەیەوە لە بیر نەچوایەتەوە)) (ژ١٠٢، ل١-٢).

### ٣. ژیاننامە[٩٨]:

#### ٣. ١. ئەحمەد موختار جاف:

کوڕی وەسمان پاشای محەمەد پاشای کەیخوسرەو بەگی جافە، ساڵی ١٣١٦ك (١٨٩٨-١٨٩٩) لەدایك بووە. لە هەڵەبجە، خراوەتە حوجرەو، قورئان و وردە کتێبی دینیی پێ‌خوێنراوە. شێخ محێدین ئەلفوبێ و سەرەتای خوێندن و، سلێمان بەگی کاتب قارسیش زمانی فارسیی فێرکردووە. درێژەی بە خوێندن نەداوەو، بە موڵکدارییەوە خەریك بووە. لە ١٩١٩ وە کەموزۆر قایمقامی هەڵەبجە بووە تا ١٩٢٥. یەکەم و سێهەم خولی پەرلەمانی پاشایەتی‌ی عیراق، بە نائیبی سلێمانی هەڵبژێرراوە. ڕۆژی ١٩٣٥/٢/٦ خافڵکوژ کراوەو، لە گۆڕستانی دێی (عەبابەیلێ) نێژراوە[٩٩].

#### ٣. ٢. ڕەفیق حیلمی:

کوڕی ساڵح کەرکووکی کوڕی مارف ئاغای عەزیز ئاغای بابەکر ئاغای مەلا وەیسییە، ساڵی ١٨٩٨ لە کەرکووك لەدایك بووە. قوتابخانەکانی ڕوشدیەی عەسکەری‌ی سلێمانی و ئەعدادی‌ی عەسکەری‌ی بەغداو دوا پۆلی ئەعدادی‌ی موڵکیی لە١٩١٤دا لە سلێمانی بڕیوە. پاشتر قوتابخانەی (ئەندازەی باڵا)ی لە ئەستەمووڵ تەواو کردووە. پاشان بووە بە مامۆستا لە ئەعدادی‌ی موڵکی و "نموونەی سەعادەت"ی سلێمانی و، لە (المجر الکبیر)ی شاری عەمارەو هەولێرو کەرکووك و ناسرییەو مووسڵ و بەغداو باقووبەو بەسرە. دوای ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨، کراوە بە مولحەقی ڕۆشنبیری لە باڵوێزخانەی عیراق لە تورکیا تا ١٩٥٩. ١٩٦٠/٨/٤ کۆچی دوایی‌ی کردووە. ئەندامی کۆمەڵی "هێڤی"و، دامەزرێنێکی "کۆمەڵی سەربەخۆیی‌ی کوردستان"و "جەمعییەتی کوردستان"و "کۆمەڵی پشتیوانی کوردان"و، سەرۆکی حزبی "هیوا" بووە. ١٠ کتێب و گەلێ وتاری بڵاوکراوەی هەن[١٠٠].

#### ٣. ٣. شێخ سەلام:

کوڕی شێخ ئەحمەدی شێخ عەبدولکەریمی شێخ ئەحمەدی شێخ محەمەدە، ساڵی ١٨٩٢ لە دێی (عازەبان)ی قەزای هەڵەبجە لەدایك بووە. تا ١٩٠٤، لای شێخ محەمەدی خەڵکی دێی (تاوێرە)، فارسی و بنەماکانی صەرف و نەحوی عەرەبیی خوێندووە. پاشان لە حوجرەی دێی (ئەحمەد برندە) زانستی دینیی وەرگرتووە، تا ١٩١١ کە ئیتر بۆ خوێندن چووەتە مزگەوتی "شێخ عەبدوڕڕەحمانی عازەبانی" لە سلێمانی. دوای دەوری ساڵێك، خووی داوەتە ئەدەبیاتی کوردی و فارسی. بە بڕانەوەی جەنگی گەورە، گەڕاوەتەوە بۆ سەر موڵکی خۆیان لە (عازەبان)و، خەریکی کشتوکاڵ بووە.

لە ١٩١٩دا، بە ڕاسپێری‌ی مەحموود پاشای جاف، هاتووەتەوە بۆ سلێمانی و، بووەتە تەتەری نێوان پاشاو شێخ مەحموودی نەمر. دوای شەڕی دەربەندی بازیان، هەڵاتووەو، ٣مانگ لە شاخی (زەردە) خۆی شاردووەتەوە. ئەمجا چووەتە دیوی ئێران و تا (١٩٢٠-١٩٢١) نیوەی کاتەکە لە (سنە) مارەتەوە. دیسان گەڕاوەتەوە بۆ دێی (نێرگسەجاڕ) لای مەحموود پاشا، کە بە هەوڵێکی زۆر لێبوردنی مێجەر سۆنی بۆ

---

[٩٨] لەبەرئەوەی نووسەران و شاعیرانی ئەم بەرگە، ١٠ یان (ئەحمەدی عەزیز ئاغا، پیرەمێرد، ڕەشید نەجیب، عەبدوڵڵا عەزیز، عەبدولواحید نووری، عەلی عارف ئاغا، فایەق بێکەس، فایەق زێوەر، مستەفا صائیب، شێخ نووری‌ی شێخ صالح) ژیاننامەو وێنەیان لە یەکەم بەرگی ئەم کتێبەدا هێنراوەتەوە، پێویست نەبینرا لێرەدا دووبارە بکرێنەوە.

[٩٩] ڕەفیق ساڵح، دیاری کوردستان (١٩٢٥-١٩٢٦)، ل٧٨-٧٩.

[١٠٠] ڕەفیق ساڵح، سێ ڕۆژنامەی ڕۆژگاری شێخی نەمر، لێکۆڵینەوەی د.کەمال فوئاد و سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٤٠-٤٢.

وەرگرتووە. بە پلەی "چاوەش"ی پۆلیس دامەزراوەو، کراوەتە مەئمووری مەرکەزی پۆلیسی قەزای شارباژێڕ تا هاتنەوەی شێخی گەورە لە ئەسارەت.

لە دووەم حکوومەتی کوردستاندا، بە مودیری ئەوراقی عەسکەرییە دانراوە تا ١٩٢٣. شێخ، دوای چۆڵکردنی سلێمانی، لەگەڵ چەند کەسێکی تردا، خستیە زیندان لە دێی (پیران)و شاخی (سیاکۆڵە)ی پشت دێی (دزلی). هەر ئەوساڵە، بەگیراوی هێنرایەوە بۆ سلێمانی. کە بەردراوە، چووەتەوە بۆ (عازەبان)و، سەر فەلاحەتی. لەبەر هەڕەشەی گرتنەوەی لەلایەن شێخەوە، ئەوێی بەجێهێشتووەو، لە دێی (فەقێ جنە) گیرساوەتەوە. وازی لێنەهێنراوە، تا لە (ناوتاق)ی مێوڵ لە شاخی (باشاری) بریندار کراوە.

مایسی ١٩٢٤ بە مانگانەی ١٢٠ ڕووپیە کراوەتە تەحسیلداری ناحیەی وارماوا کە ئینگلیز خستبوویە سەر قەزای کفری. هەمان وەزیفەی لە هەڵەبجەو سلێمانیش دیوە تا ١٩٢٨. ئەوساڵە دەستی داوەتە بازرگانیی تووتن؛ لە شارەزوور و مەریوان کڕیویەو، لە سلێمانی فرۆشتوویەتیەوە. پێشترو ساڵی ١٩٢٦، لەگەڵ کۆمەڵێك ڕۆشنبیری شاری سلێمانیدا، بەهاوکاریی مەحموودخانی کانی سانان، (جەمعییەتی زەردەشتی) یان دامەزراندووە کە پەیوەندیی بە حکوومەتی ئێرانەوە هەبوە. لە ١٩٢٨دا، بەهۆی ئاشکرابوونی جەمعییەتەکەوە، لە سلێمانی دەستبەسەر کراوە.

١٩٣٠، پاش شەڕی بەردەرکی سەرا، لەگەڵ سێ ئەفسەری کوردی ناو سوپای عێراقدا، مەحموودو حامید جەودەت و کامیل حەسەن، هەڵاتووە بۆ لای شێخی گەورە لە (پیران). لەوێ (کۆمەڵی سەربەرزیی کورد) یان پێك هێناوە. هەتا لەگەڵ هێزەکانی شێخیشدا هاتووەتە پشدەرو شارباژێڕ.

١٩٣٢بووە بە موراقیب لەسەر ڕێگەی پێنجوێن. ١٩٣٣ دوورخراوەتەوە بۆ بەسرە. ١٩٣٥ کە ئەمین زەکی بەگ بووە بە وەزیری ئەشغاڵ، گێڕاویەتیەوە بۆ ڕێگەی دەربەندیخان. خزمەتەکەیی گواستووەتەوە بۆ دائیرەی کشتوکاڵ و، بووەتە موراقیبی دارستانی لیوای سلێمانی. براوەتە بەغداو، کراوەتە موراقیبی (ویقایەی نەباتی)ی شاری بەغداو (مەزرووعات)ی دەوری شار. ١٩٣٦ بە هەمان وەزیفەوە نێرراوە بۆ لیوای حللە. ١٩٤٠ چووەتەوە بۆ دائیرەی ئەشغاڵی سلێمانی. ١٩٤٣ بۆ ماوەی ساڵێك لە وەزیفە دەرکراوە. ئەمجا، بە موستەخدەمی، بە مەئمووری مەنتووجاتی مەحەللیی قەزای شارباژێڕ دانراوە. ١٩٤٤-١٩٤٥ کراوە بە مەئمووری دائیرەی نوفووسی پشدەر. بەو وەزیفەیەوە، گوێزراوەتەوە بۆ هەڵەبجە (١٩٤٨-١٩٤٩)و هەولێر (١٩٥١)و، دووبارە هەڵەبجەو، ئەمجارە بۆ بەغدا. ١٩٥٣ براوە بۆ دائیرەی دارستان (غابات). ١٩٥٥ خانەنشین بووەو، دەستی بە کشتوکاڵ کردووەتەوە. ڕۆژی ١٩٥٩/٣/٣ کۆچی دوایی کردووە. دیوانێکی لەچاپدراوی هەیە[١٠١].

### ٣. ٤. صالح قەفتان:

کوڕی عەبدوڕڕەحمان کوڕی مەحموود کوڕی ئەحمەدی قەفتانچییە، ١٨٨٤ لە سلێمانی لەدایك بووە. قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەریی سلێمانی و ئەعدادی عەسکەریی بەغداو مەکتەبی حەربییەی ئەستەموڵی تەواو کردووەو، بووە بە ئەفسەر تا تەمووزی ١٩١٤ کە لەبەر نەخۆشیی دڵ کراوە بە مامۆستای ئەعدادیی موڵکیی سلێمانی. ١٩١٩-١٩٢٢ بازرگانیی بەتووتنەوە کردووە. ١٩٢٢/٧/٢١ بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنی (جەمعییەتی کوردستان) لە سلێمانی هەڵبژێرراوە. لە دووەم حکوومەتی کوردستاندا، بووە بە موعەللیمی جوگرافیاو مێژووی مەکتەبی ئەعدادیی مەحموودی.

سەرەتای حوکمی پاشایەتی، لە ١٩٢٣/٩/٤-١٩٢٥/٩/٧ مامۆستای قوتابخانەی کۆیە بووەو، پاشتر کراوە بە بەڕێوەبەری مەکتەبی ئەووەڵ و پاشان فەیسەڵییە. ئەندامی ئەنجومەنی مەعاریفی لیوا بووە کە لەنێوان ت١-ت٢ی ١٩٢٥دا دامەزراوە. ١٩٢٦/١٠/١٣ بە ئەندامی هەیئەتی ئیدارەی (جەمعییەی زانستی کوردان)

---

(١٠١) دیوانی سەلام، چاپخانەی تەمەدون-بەغدا، ١٩٥٨، ل دە-بیست ویەك؛ نجم الدين ملا، مينای شكسته، ب٢، سلێمانی، ١٩٤٠، ل٢٩-٣٥ (دەستخەت).

هەڵبژێرراوە. دواتر لە ١٩٢٨/٩/١-١٩٢٩/١٠/١ بووە بە بەڕێوەبەرو لەوەبەدوا تا ١٩٣٠/١٠/١ بە مامۆستای قوتابخانەی ناوەندیی سلێمانی. دواتر براوەتەوە بۆ قوتابخانەی سەرەتایی تا ١٩٣٦/٣/٨ کە ئیتر خانەنشین کراوە. لێپرسراو (موحەڕریر)ی ڕۆژنامەی "زیان"ی شارەوانیی سلێمانی بووە لە (ژ١، ١٩٣٧/٩/١٢)ـەوە تا ٢٠-٢٧ ژمارەی هەووەڵ. خاوەنی یەکەم گۆڤاری کوردیی "زانستی" ناوی شاری سلێمانیی‌یە کە هەر خۆی ٢٥ی شوباتی ١٩٣٨ تاقە ژمارەیەکی لێ دەرکردووە. نووسینی بڵاوکراوەی لە "زیان"و "ژین"و "گەلاوێژ"یشدا هەیە. ڕۆژی ١٩٦٨/٨/٣٩ کۆچی دوایی‌ی کردووە.

ئەم کتێبە لەچاپدراوانەیشی هەن:

١- بەراوردێکی تاریخی، چاپخانەی ژین-سلێمانی، ١٩٣٦، ١٨ل.

٢- پەندی تاریخی، چاپخانەی نجاح-بغداد، ١٩٣٧، ٦٠ل.

٣- نەتەوەی کورد تورکمان نین، چاپخانەی کامەران-سلێمانی، ١٩٥٩، ٣٥ل.

٤- مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ، چاپخانەی سلمان الاعظمي-بغداد، ١٩٦٩، ٤٠٨ل.

٥- گریگۆری پیترۆف، لە وڵاتی گوڵەزەنبەقی سپیدا، چاپخانەی سلمان الاعظمي-بغداد، ١٩٧٠، ١٥٧ل (وەرگێران)[١٠٢].

### ٣. ٥. ئەسیری:

عەبدولخالق کوڕی سەید حسێنی بەرزنجی‌ی ڕێبەرێکی تەریقەتی نەقشبەندییە،ساڵی ١٨٩٠ لە کەرکووک لەدایك بووە. بە مناڵی لای حاجی محەمەدی وەستا فەتاح لە مزگەوتی حاجی ئەحمەد ئاغای مستەفا ئاغا خوێندوویە. بە فەقێیەتی، هەورامان‌و هەڵەبجەو جوانڕۆو بانەو سەقزو سنەو چوورِ گەڕاوەو، هاتووەتەوە بۆ کەرکووك، لای مەلا عەلی حیکمەت زانستی ڕەوانبێژی‌و ڕیازیاتی خوێندووەو، ئیجازەی زانستی لێوەرگرتووە. لە دادگای کەرکووك، وەك کاتب‌و سەرکاتب‌و، لە بەڕێوەبەرێتی‌ی موڵك‌وماڵی نابەکامەکان‌و، دادگای شەرعیش وەزیفەدار بووە، تا لە ١٩٥٨دا خانەنشین کراوە. ١٩٦٢/٦/١٨ کۆچی دوایی‌ی کردووەو، لە گۆڕستانی شێخ محێدین نێژراوە. دیوانێکی لەچاپدراوی هەیە[١٠٣].

### ٣. ٦. عەلی عیرفان:

کوڕی مەلا عەبدوڵڵا عیرفان کوڕی مەلا ڕەسووڵ کوڕی مەلا مەمەندە، ساڵی ١٨٨٢ لە گەڕەکی (کانێسکان)ی شاری سلێمانی لەدایك بووە. خوێندنی حوجرەی لای باوکی‌و، قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەریشی هەر لەوێ تەواو کردووە. ئەم زەزیفانەی هەبوە: مامۆستا لە هەڵەبجە، کاتب لە دادگای سلێمانی، کاتب عەدلی دادگای کۆیە. ١٩٤٢ خانەنشین بووە. ١٩٢٥ بووە ئەندامێکی بەرزو دامەزرێنی (جەمعییەتی مودافەعەی وەطەن) کە بۆ پشتیوانی‌ی لکاندنی کوردستانی جنووبی بە عیراقەوە لە سلێمانی دامەزرا. ئەندامێکی دامەزرێنی (جەمعییەتی زەردەشتی-١٩٢٦)و، دواتر ئەندامی لقی سلێمانی‌ی (جەمعییەتی‌خۆیبوون) بووە. لە ئەیلوولی ١٩٢٧ـەوە، کراوە بە بەڕێوەبەری چاپخانە لە شارەوانی‌ی سلێمانی‌و، بەرپرسی‌ی ژمارەکانی (٨٢-٢٥٩)ی ڕۆژنامەی "ژیان"ی

---

[١٠٢] ڕەفیق ساڵح، ڕۆژنامەی ژیان (ژ١-٨١)، ب١، لێکۆڵینەوەی سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢٤، ٢٦؛ جەمال خەزنەدار، بانگی کوردستان، بەغدا، ١٩٧٤، جەمال خەزنەدار، ڕۆژی کوردستان (١٩٢٢-١٩٢٣)، بەغدا، ١٩٧٣، ل٦٢؛ کەمال ڕەئووف محەمەد، صالح قەفتان‌و یەکەم گۆڤاری سلێمانی/٢، "کاروان"، ژ٧٩، ئەیلوولی ١٩٨٩؛ کەمال ڕەئووف محەمەد، ڕۆژنامەی "ژیان"، "ئاسۆ" (ڕۆژنامە)، بەغدا، ژ٣٢، ١٩٩٠/٢/٣، ل٤؛ سدیق ساڵح، زبان‌و چاپخانەی بەلەدییەی سلێمانی، "ڕۆژنامەنووسان" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ٣، زستانی ٢٠٠٣، ل٨٦-٩٤.

کاك کەمال ڕەئووف لەو ساخکردنەوەیەی گۆڤاری "کاروان"یدا، جەختی کردووە کە صاڵح قەفتان لە ڕۆژگاری حوکمی شێخ مەحمووددا وەزیفەی نەبوە؛ لەکاتێکدا "ڕۆژی کوردستان"ی زمانی حاڵی دووەم حکوومەتی کوردستان (ت١ ١٩٢٢-مارتی ١٩٢٣) نواندوویە کە موعەللیمێکی ئەعدادی‌ی مەحموودی بووە.

[١٠٣] دیاری کوردستان (١٩٢٥-١٩٢٦)، ل٩٠-٩١.

گرتووەتە ئەستۆ. بەهۆی شەڕی بەردەرکی سەراوە لە ١٩٣٠/٩/٦دا گیراوەو، چەند مانگێك لە زیندان توندکراوە. ١٩٤٢ شەش مانگێك، بە ڕاسپێری شێخ لەتیفی حەفید، چووەتە ئێران و، گەیشتووەتە شاری باکۆی یەکێتی سۆڤێت و، پەیوەندی بەرووسەوە کردووە بۆ مەسەلەی کورد. پاشتریش سەردەمێك وەکیلی بووە لە پێنجوێن.

یەکەم نووسینی، لەپاڵ دوو بابەتی تردا، پێشتر لە ڕۆژنامەی "ژیانەوە"دا بڵاوکردووەتەوە. لە خەیرییە حەسەن ڕەفعەتی ئامۆزای خۆی، هۆشیارو صەلاح و زێباو صەبیحەی هەن. ١٩٦٨ کۆچی دوایی کردووەو، لە گردی سەیوان نێژراوە. هەر نامیلکەیەکی لەتورکییەوە وەرگێڕراوی هەیە:

-ڕۆبن پاشا، کورد لەکەیەوە خەریکە، چاپخانەی فورات-بغداد، ١٩٢٧[١٠٤].

### ٣. ٧. فاتمە محێدین (ف. عەلییە):

١٩٠٥ لە شاری بەغدا لەدایك بووە. لە قوتابخانەی (ئیتیحاد و تەرەقی) (١٩١٤-١٩١٧)ی ئەوێ خوێندوویە. پاشتر بووەتە هاوسەری ژیانی ئەحمەدبەگی فەتاح بەگ "حەمدی"ی شاعیر. ٣٥ ساڵ مامۆستای قوتابخانەی کچان بووە. دوای زەهراخانی مستەفا پاشا یامولکی کە ٣ ساڵ (١٩٣٠-١٩٣٣) بەڕێوەبەری قوتابخانەی کچانی سلێمانی بووە، ئەم لە ١٩٣٤ دا بەو وەزیفەیە شوێنی گرتووەتەوە. ١٩٨٦ کۆچی دوایی کردووە[١٠٥].

### ٣. ٨. محەمەد ئاغای حاجی حسێن ئاغا:

کوڕەزای حاجی ئەوڵای گەورەو، لە بنەماڵەی ئاغاتەهایە. ساڵی ١٨٨٤، لە سلێمانی لەدایك بووە. خوێندنی دینیی تەواوکردووەو، ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە. بازرگانیی، بەتایبەت، بە تووتنەوە کردووە. هەڵوێستی کۆمەڵایەتی و سیاسیی دڵسۆزانەی بۆ گەل و وڵات هەبوە. تشرینی دووەمی ١٩٤٨ کۆچی دوایی کردووەو لە گردی ئاوەڕاستی سەیوان نێژراوە. لە ڕۆژنامەی "ڕۆژی کوردستان"یشدا نووسینێکی بڵاوکراوەی هەیە[١٠٦].

### ٣. ٩. مەحموود جەودەت:

کوڕی ئەحمەد جەودەت کوڕی مەحموودئاغا چکۆلەو، بەئەسڵ لە ئاغاکانی زەنگەنەیە. ١٨٨٨ لە سلێمانی لەدایك بووە. بە مناڵی، لای خواجە ئەفەندی و مەلا ئەحمەد دەنگ گەورە قورئانی خوێندووەو فێری نووسین و خوێندنەوە بووە. قوتابخانەکانی ڕوسدیەی سلێمانی و ئەعدادیی عەسکەریی بەغداو، لە ١٩٠٩یشدا مەکتەبی حەربییەی ئەستەمووڵی تەواو کردووەو، بووە بە ئەفسەر. سەرەتای یەکەم جەنگی جیهانی، کراوە بە مولازمی یەکەم و، بەشداریی شەڕەکانی (چەناق قەلعە)و (کوت الامارة)ی کردووە. هێزەکانی ئینگلیز بەدیلی گرتوویانەو، بردوویانەتە هیندستان. لەوێ لەگەڵ ئیسماعیل حەقی شاوەیس و چەند دیلێکی تری کوردپەروەردا کۆمەڵێکی سیاسییان دامەزراندووەو، پەیوەندییان بە سەرانی کوردی دەرەوەوە کردووە.

١٩١٩ کە بەردراوە، هاتووەتەوە بۆ سلێمانی، چووەتە ناو لەشکری یەکەم حکوومەتی کوردستان بە سەرۆکایەتیی شێخی گەورە. سەردەمی حاکمیی مێجەر سۆن، لە سەر چالاکیی کوردانە گیراوە؛ لەگەڵ چەند لاوێکی مونەووەری شاریشدا (کۆمەڵی سەربەخۆیی کوردستان: ١٩١٩-١٩٢٠)یان پێکهێناوە. هەر ئەو دەورە، ماوەیەك کراوە بە موهەندیسی بەلەدییەو، وازی لێهێناوە. ساڵی ١٩٢١، لەبەر تەنگ پێهەڵچنینی کاربەدەستانی ئینگلیز، هەڵاتووە بۆ تورکیا. لەوێ، بووە بە قوماندانی بلووکی ژاندرمە لە (وان).

---

[١٠٤] د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ب٢، ل١٩٢؛ عەبدوڵڵا زەنگەنە، ژیانەوەو شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، هەولێر، ٢٠٠١؛ هەندێ زانیاریی ڕۆژانی ٢١و ٢٠٠١/١/٢٣ی برایان صەلاح عیرفان و شوان عادیل عیرفان. سوپاس بۆ هاوکارییان.

[١٠٥] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ب١، ل ٢٥٩-٢٦٦؛ ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی ڕەشە، شاری سلێمانی، ب١، دار الحریە للطباعة- بغدا، ١٩٨٥، ل ٤٧٥؛ کەمال ڕەئووف محەمەد، یێکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانی/ ٢، "کوردستانی نوی"، ژ١٣١٣، ١٩، ١٩٩٦/٦/١٩.

[١٠٦] ڕەفیق ساڵح، ڕۆژنامەکانی ڕۆژگاری حوکمی شێخی گەورە، ل١٩.

ساڵی ١٩٢٣ گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتو، لە ٢١ی مایسدا بە پلەی مولازمی یەکەم لە سوپای عیراق وەرگیراوە. ٦ی نیسانی ١٩٢٦، کە لە بەتالیۆنی سێهەم بووە، کراوە بە ڕەئیس (نەقیب). ٢٣ی ئابی ١٩٢٩ بەئیرادەی شاهانە بووە بە ڕەئیسی یەکەم (ڕائید). ٣٠ی مایسی ١٩٣٠، لە هەڵبژاردنی (یانەی سەرکەوتنی کوردان)دا لە (ڕۆیاڵ سینەما)ی بەغدا، بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردن هەڵبژێرراوە. ١٩٣٠، دوای شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانی، لەگەڵ شێخ سەلامی شاعیرو حامیدی برای و کامیل حەسەندا ڕیزی سوپایان بەجێهێشتووەو، چوونەتە پاڵ شێخ مەحموود لە (پیران). لەوێ، (کۆمەڵی سەربەرزیی کوردان) یان پێکهێناوە شەوی سەری ساڵی تازەی ١٩٣١ تەسلیم بە حکوومەت بووەتەوەو، دراوەتە دادگاو، لە سوپا دەرکراوە. کراوە بە ئەندازیار لە دائیرەی ئەشغاڵ. لەسەر کێشەی کوشتنی "عەبدوڵڵا سەنەوی"ی بەڕێوەبەری مالییە کە مامەڵەی خانەنشینیەکەیی لەبەر بەشداریی پێشتری مەحموود جەودەت لە جووڵانەوەکەی شێخ مەحمووددا دواخستووەو جێبەجێی نەکردووە، گیراوەو، دوای کودەتای عەسکەریی بەکر صدقی لە خنکان ڕزگاری بووە. بەڵام کە بەکر کوژراوە، ڕۆژی دووشەممەی ڕێکەوتی ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٣٧، ئیعدام کراوە.

مەحموود جەودەت، زمانەکانی تورکیو فارسیو عەرەبیو فەرەنسیو ئینگلیزیی زانیون. پێشتر نووسینی لە ڕۆژنامەی "ژیانەوە"دا بڵاوکراوەتەوە. ئەم کتێبانەیشی هەیە:

١. پروفیسور ج.أ. سلمنت، بهاءاللهو دوری نوی، چاپخانەی معارف-بغداد، ١٩٣٣، ٣٣٦ل (وەرگێڕان لە فەرەنسییەوە).

٢. پولەندە وە یا لهستان، چاپخانەی معارف-بغداد، ١٩٤٠، ٢٣٧ل.

٣. چیرۆکێکی ڤیکتۆر هۆگۆی لە فەرەنسییەوە وەرگێڕاوەو چاپ نەکراوەو سۆراخی نییە[١٠٧].

## ٤. وێنە[١٠٨]:

ئەحمەد موختار جاف

ڕەفیق حیلمی

شێخ سەلام

---

[١٠٧] ڕەفیق حلمی، یادداشت، چ١، بەشی یەکەم/ب٣، هەولێر، ١٩٨٨، ل٣٨، ١٠١، ١٠٢و، بەشی دووەم/ب٤، ل١٠٩، ١١٢، ١٣١-١٣٢؛ جەلال تەقی، بیرەوەریەکانی ئەحمەد تەقی دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودوسمکۆ، چ٢، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٢٨؛ سدیق سالح، کامیل حەسەن لاپەڕەیەکی ون، "هەزارمێرد" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ٨، حوزەیرانی ١٩٩، ل١٦-٥١؛ عمر حسن دولت، مێژووی ژیانی مەحموود جەودەت، "ڕەنگین" (گۆڤار)، بەغدا، ژ٦٠، ١٩٩٣، ل١٥.

[١٠٨] سوپاسی زۆرم بۆ هاوڕێی ئازیزم کاك قادر میرخان کە ئەم وێنانەی، دوای سکانو پاککردنەوە، بەم شێوەیە دەرهێنا. خوا نموونەی زۆر بکات. سوپاسیش بۆ ئەو برا بەڕێزانە کە ئەو وێنانەیان خستە بەر دەستم.

صاڵح قەفتان

ئەسیری

عەلی عیرفان

فاتمە محێدین

محەمەد ئاغای حسێن ئاغا

مەحوود جەودەت

**سەرچاوەی وێنەکان:**

١.ئەحمەد موختار جاف: دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، دیوانی ئەحمەد موختار جاف، بەغد، ١٩٨٦.

٢.ڕەفیق حیلمی: کاك فەوزی ڕەفیق حیلمی.

٣.شێخ سەلام: نجم الدین ملا، مینای شکستە، ب٣، ١٩٤٠ (دەستخەت).

٤.صاڵح قەفتان: مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ، بغداد، ١٩٦٩.

٥.ئەسیری: مستەفا عەسکەری، دیوانی ئەسیری، چ١، ب١، بەغدا، ١٩٨٧.

٦.عەلی عیرفان: کاك صەلاحی کوڕی.

٧.فاتمە محێدین: "ڕۆشنبیری نوێ"، ژ٧٣، مارتی ١٩٧٣، ل١٥.

٨.محەمەد ئاغای حاجی حسێن ئاغا: کاك هێمن شاڵی.

٩.مەحموود جەودەت: پولەندە وەیا لهستان، بغداد، ١٩٤٠.

## ٥. پێڕست:

### ٥. ١. بابەتی نووسەران:

#### ٥. ١. ١. بابەتی ناوی نووسەر لێدراو:

| نووسەر | ناونیشانی بابەت | ژمارە |
|---|---|---|
| ١. ئەحمەد موختار جاف | ١. گوڵی خوێنین/ شیعر | ٢٤٧ |
| ٢. ئەحمەدی عەزیز ئاغا: (أ.ع) | ١. سەعادەتی ئێستا، فەلاکەتی پێشوو | ٨٢ |
| ٣. پــیرەمێرد: (فـــائیق تۆفیـــق)، (تۆفیق) | ١. باڵۆرێی نەسرین/ شیعر | ١٠٩ |
| | ٢. حیسسی کوردی، لاوکی سادەی دەوێ/ شیعر | ١٧٣ |
| ٤. ڕەشید نەجیب: (ڕ. ن) | ١. "سەعد"ی میصر نا، "سەعد"ی دنیا مرد | ٨٤ |
| | ٢. ئالامی بەشەر/ شیعر | ٩١ |
| | ٣. عەشق و خەیاڵ/ شیعر | ٩٤ |
| | ٤. نەخۆشیی ئیجتیماعیمان: سیلسیلەی موصاحەبەیەک؛<br>مناڵ بەخێوکردن و بەرهەمهێنانن-١<br>مناڵ بەخێوکردن و بەرهەمهێنانن-٢ | <br>١٣٤<br>١٣٥ |
| | ٥. نەخۆشیی ئیجتیماعیمان:<br>بێقەراری، بێعەزمی-١<br>بێقەرای، بێعەزمی-٢<br>بێقەرای، بێعەزمی-٣ | <br>١٣٧<br>١٣٨<br>١٣٩ |
| | ٦. نەخۆشیی ئیجتیماعیمان:<br>ژنهێنان، بناغەی ژیان-١<br>ژنهێنان، بناغەی ژیان-٢<br>ژنهێنان، بناغەی ژیان-٣ | <br>١٤١<br>١٤٢<br>١٤٣ |
| | ٧. نەخۆشیی ئیجتیماعیمان: موصاحەبەی ٤؛<br>موحافەظـــەکاری، عەنعەنەپەرســـتی لـــە حـــەیاتی ئیجتیماعیماندا-١<br>موحافەظـــەکاری، عەنعەنەپەرســـتی لـــە حـــەیاتی ئیجتیماعیماندا-٢ | <br>١٤٦<br>١٤٧ |
| ٥. ڕەفیق حیلمی: (ڕ.ح) | ١. ڕەدییەیە بۆ ئەو مەقالەیە کە خیطاب بە مودیری عامی مەعاریف بە ئیمضای (قال و قیل) لە غەزەتەی ژمارە ٢٩٥٦و ٢٩/١٢/٢٦ی "العراق" نووسراو بوو-١ | ٢٢٢ |
| | هەمان ڕەدییە-٢ | ٢٢٣ |
| | هەمان ڕەدییە-٣ | ٢٢٤ |
| | هەمان ڕەدییە-٤ | ٢٢٦ |
| | | |
| | هەمان ڕەدییە-٥ | ٢٢٨ |
| | هەمان ڕەدییە-خاتیمە | ٢٣٠ |

| | | |
|---|---|---|
| ٦. دوقتۆر ستاوت | ١. هاواری کوردان-١ | ١٨٤ |
| | هاواری کوردان-٢ | ١٨٥ |
| | هاواری کوردان-٣ | ١٨٦ |
| ٧. شێخ سەلام | ١. ڕازو گلەبیی ژیان | ٢٣٨ |
| ٨. صالح: (قەفتان) | ١. بەواسیطەی "ژیان"ی خۆشەویستمانەوە، بۆ نەظەری مەرحەمەتی ئەولیای ئوموور | ١٥٣ |
| ٩. ئەثیری: (عەبدولخاق) | ١. مەدحی ئۆستا بەشیر/ شیعر | ١٠٠ |
| ١٠. عەبدوڕڕەحمان عەزیز | ١. زۆر شتمان نوقصانە | ١١٢ |
| ١١. عەبدوڵلا عەزیز: (ع. عەزیز) | ١. هەرزەکاریت بپارێزە، پیریت خۆی دوورئەخاتەوە-١ | ١٤٤ |
| | هەرزەکاریت بپارێزە، پیریت خۆی دوورئەخاتەوە-٢ | ١٤٥ |
| | هەرزەکاریت بپارێزە، پیریت خۆی دوورئەخاتەوە-٣ | ١٤٨ |
| | ٢. مەطبووعاتمان-١ | ٢٣٦ |
| | مەطبووعاتمان-٢ | ٢٣٧ |
| | مەطبووعاتمان-٣ | ٢٤٣ |
| | مەطبووعاتمان-٤ | ٢٤٤ |
| ١٢. عەبدولواحید نووری: (ع. واحید)، (ع. و. نووری) | ١. کتێبەکانی مەکتەبەکانمان | ٢٤١ |
| | ٢. یەکەم دەوڵەتی کورد لە عیراقا (وەرگێڕان) | ٢٤٦ |
| ١٣. عەبدولوەهاب کەرکووکی | ١. بۆ جەنابی مودیری موحتەرەمی ژیان | ٢٥٠ |
| ١٤. عەلی ئەحمەد، عەبدوڕڕەحمان حاجی عەلی | ١. نوبذەیەك لەخوصووص زانستییەوە | ١٤٢ |
| ١٥. عەلی عارف (ئاغا) | ١. جوابی سوورکێو/شیعر | ١١٧ |
| ١٦. فائیق بێکەس: (ف. بێباك)، (ف.بێکەس) | ١. ئینطیباعاتی گۆیژە/ شیعر | ١٠١ |
| | ٢. یادی وەطەن/ شیعر | ١٠٦ |
| | ٣. گفتوگۆ لەگەڵ ئەستێرەیەکدا/ شیعر | ١١٤ |
| ١٧. فائیق زێوەر | ١. بۆ لاوانی کورد/ شیعر | ١١١ |
| | ٢. گفتوگۆ لەگەڵ شاخی سوورکێودا/ شیعر | ١١٣ |
| ١٨. فاتمە محێدین: (ف. عەلییە) | ١. مەکتەبی کچانی سلێمانیو مودیرە خانم | ١٢٨ |
| ١٩. محەمەد ئاغا حاجی حسێن ئاغا: (عەطار محەمەد) | ١. بۆ ئیدارەخانەی خۆشەویستی غەزەتەی "ژیان" | ١٠١ |
| | ٢. هەچییەك سەرمایەیەکتان هەیە، لە نەخۆشیەکانتانا مەخۆن | ١٠٧ |
| ٢٠.محەمەد کەریم ئاغا، فەرەج تۆفیق | ١. سەردەمێکی ڕابوردووم بۆ برا نەخوێندەوارەکانم | ١٤٠ |
| ٢١. مستەفا صائیب: (کوردی) | ١. ئافرەت-١ | ٩٣ |
| | ئافرەت-٢ | ٩٤ |
| | ئافرەت-٣ | ٩٦ |
| | ئافرەت-٤ | ٩٧ |

| | | |
|---|---|---|
| | ٢. یەکەم دەوڵەتی کورد-١ | ٢٤٩ |
| | یەکەم دەوڵەتی کورد-٢ | ٢٥٠ |
| | یەکەم دەوڵەتی کورد-٣ | ٢٥١ |
| ٢٢. مەحموود جەودەت: (م.ج) | ١. گوڵی خوێنین، مەنزوومی سولی پرودوم (وەرگێڕان) | ٢٤٣ |
| ٢٣. شـێخ نـووریی شـێخ صـاڵح: (م.نووری) | ١. یانەی هرکەوتن/ شیعر | ٢٤٦ |

**٥. ١. ٢. ناوی ڕەمزی لێدراو:**

| | | |
|---|---|---|
| ١. پیرۆت | ١. لەسەر تەلغرافێك كە لەڕەواندزەوە بۆ "ژیان" هاتووە | ١٢٨ |
| ٢. حەقبێژی قصەڕەق | ١. قصەی حەق وەلەو ڕەقیش بێ، نابێ كەس پێی ناخۆش بێ | ١٠١ |
| ٣. خەسرەو | ١. بۆ جەنابی مودیری "ژیان" تەقدیم | ١٣٠ |
| ٤. ع.ك.باخانی | ١. یا لیت قومي یعلمون | ١٧٨ |
| ٥. كوردێك | ١. تەقدیمی ئیدارەی غەزەتەی "ژیان"/ شیعر | ٥٤٠ |
| ٦. كوردێكی حەقیقەت پەرست | ١. بۆ ئیدارەی جەریدەی "ژیان" | ٢٥٣ |
| ٧. كوردێك | ١. دواڕۆژی وڵاتمان بەچی باش ئەبێ: پێشكەوتنی ژنانمان | ٢٤٧ |
| ٨. لاوێكی كورد | ١. تێكۆشینی بەشەر بۆ وەرگرتنی حوڕڕییەت | ٩٩ |

**٥. ١. ٣. ناوی نووسەر لێنەدراو:**

| ناونیشانی بابەت | ژمارە |
|---|---|
| ١. مەدەنییەتی كۆن و تازە (وەرگێڕان) | ٨٣ |
| ٢. سەعیی فەردێك میللەتێك ئیحیا ئەكاتەوە | ٨٥ |
| ٣. لازمە پارە جەلب كەین، نەك بیدەین بە خاریج | ٨٦ |
| ٤. نائیب و واجیباتی | ٨٧ |
| ٥. پیاوی گەورە كێیە | ٨٨ |
| ٦. تەربییەو تەعلیم بەنەظەر ڕۆحی میللەتەوە تەخالوف ئەكات | ٨٩ |
| ٧. خەطابەكی تەعلیمی | ٩٠ |
| ٨. ئەسبابی دواكەوتنمان | ٩١ |
| ٩. تەجنیدی ئیجباری و مەندووبی هەولێر | ٩٢ |
| ١٠. میللەت و میللییەت | ٩٣ |
| ١١. خۆزگە | ٩٤ |
| ١٢. بە موناسەبەتی عەودەتی مەلیكی خۆشەویست و فەعالی عیراقەوە | ٩٥ |
| ١٣. بە موناسەبەتی تەئسیس و مواصەلەتی تەلغرافەوە | ٩٧ |
| ١٤. ئیهتیمام لەخوصووص فەلاحەتەوە | ٩٨ |
| ١٥. موعامەلاتی تەسجیلی نوفووس بۆ میللەتێكی موتەمەدینەو بۆ هەموو حكوومەتێك لازم و بەڵكە واجیبە | ١٠٠ |

## ٢.٥. وردەبابەتی هەمەجۆر:

## ٥ . ٣ . هەواڵ و ڕاپۆرتەهەواڵی؛

### ٥ . ٣ . ١ . دەردوە:

| ژمارە | سەرباس |
|---|---|
| ژ٨٢: | حوکمی مەحکەمەی بۆلشەویك |
| ژ٨٤: | ئینتیخابات لە تورکیا<br>حوکمی مەحکەمەی لاهای<br>موستەشاری مالییەی ئێران<br>تورك لە خاریج قەرض ئەکات<br>لە لوڕستان<br>شای ئێران<br>حەریق<br>ڕۆژی تەعطیل |
| ژ ٨٥: | موعاهەدەی سیڕِیی بەینی ئیطاڵیاو ڕووس<br>وەزیری حەربییەی بریطانیا<br>تەصریحاتی جەعفەر پاشا<br>حکوومەتی ئەنقەرە<br>میستەر هاریسۆن<br>عەقیلەی مەرحووم سەعد زەعلوول پاشا<br>طەیارەیەکی ئەڵمانیی حەربی |
| ژ ٨٦: | غازی مصطەفا کەمال پاشا<br>شەمەندۆفرێکی تورك<br>بۆڵشەویکەکان<br>ڕەضاخان<br>حکوومەتی ئێران<br>حکوومەتی یۆنان<br>حکوومەتی ئێران<br>ڕەئیس جمهووری هیندنبۆرغ<br>مەلیکی ئەفغانستان |
| ژ ٨٧: | ئیعدام لە ڕووسیە<br>شیرکەتی نەقلییەی حیجاز<br>حرووفی لاتینی |
| ژ ٨٨: | جەلالەتی مەلیك لە لەندەن<br>شاهی ئێران زیارەتی ئەنقەرە ئەکات<br>ئەمیر عەبدوڵلا |
| ژ ٨٩: | واپۆرێکی ئیطاڵیا غەرق بووە<br>موفاوەضات<br>تیجارەتی ڕووس لەگەڵ عەرەبستانا |

| | |
|---|---|
| | مەسئەلەی عیراق لە عوصبەتول ئومەمدا<br>طاعوون لە هیندستانا<br>قصە لەعەلەیهی ڕەئیس جمهووری یۆنان<br>عوموومی سوفەراکانی دووەلی ئەجنەبی لە تورکیا<br>چەرکەسەکانی غەربی تورکیا |
| ژ ٩٠: | جەلالەتی مەلیك فەیصەڵو جەعفەر پاشا<br>موذەکەرەی ئامریقا<br>کوڕی غەلیومی ئەڵمان<br>غاندی‌ی مەشهوور<br>سەفیری ئێران لە ئینگلتەرەدا<br>ئێستاش عوصیان دەوام ئەکات لە کوردستانی شیمالیدا<br>تەقریری ئینگلیز لەخوصووص عیراقەوە دراوە بە عوصبەتول ئومەم |
| ژ ٩١: | سوورییەکان لە تورکیا<br>جەلالەتی مەلیك حسێن<br>جەلالەتی مەلیك جۆرج نیشانێکی تەبەڕوعی ئەمیر عەبدوڵلا فەرمووە<br>قووەی نیظامییەی بریطانیا لە چین<br>سیاحەتی وەزیری موستەعمەراتی بریطانیا<br>قەرضی بریطانیا لەسەر دەوڵەتەکان<br>خەلیفە سولطان عەبدولمەجید<br>نوفووسی تورکیا<br>ئەلەکتریق لە طەهران<br>حکوومەتی ئێران<br>طەیارە لەسەر دەماوەند<br>لەبەینی ڕووس‌و ئێرانا |
| ژ ٩٢: | قەرضی ئەهالی‌ی بریطانیا<br>عەشائیری نەجد تەعەڕوضی نوقطەیەکی عیراقیان کردووە<br>ئیتیحادی جەمعییەتێك بۆ مەحوی بۆڵشەویکێتی<br>ڕەفیقی طەیارەی بێ‌ئینسان |
| ژ ٩٣: | یۆنانیش خەریکی موعاهەدەیە<br>بودجەی تورکیا<br>هودا خانم شەعراوی<br>مەلیکی ئەفغان<br>ئیطاڵیا موتەئەثیرە<br>ئیستێرن بانق<br>ڕەفیق ئەدۆڵف<br>ئەو طەییارەی کە چووە بۆ هیندستان<br>موفاوەضە لە لەندەن بەصوورەتێکی باش جەرەیان ئەکات |

| | |
|---|---|
| | به تەلەفۆن لەگەڵ واپۆڕەکان قسەکردن<br>٧٢ شەخص لە ئەستانبووڵ حەبس کراوە<br>موخالەفەت لەبەینی گەورەکانی بۆڵشەویکا<br>جەلالەتی مەلیك |
| ژ ٩٥: | مەلیکی ئەفغان<br>سێر هانری دۆبس موعتەمەدی سامی<br>بەعضی لە عەشائیری نەجدی<br>غریو لە ئیطاڵیا<br>ڕێگای هەوائی لەبەینی مەشهەدو موحەممەڕەدا<br>جەمعییەتی تەحدیدی سیلاح<br>ئیعدام نامێنێ<br>ئیبنول سوعوود ئۆتۆمۆبیل ئەکڕێ |
| ژ ٩٦: | کوردستانی شیماڵی و ئیدارەی مەخصووصە<br>ژپلینێکی ٨٠ کەسی<br>ئینتیخاباتی بەلەدییەی لۆندەرە<br>گۆیا لە ئەمریقادا موسەکیرات مەنع کراوە<br>هودا خانم شەعراوی<br>فەلەسطین قەرض ئەکات |
| ژ ٩٧: | مەلیکی ئەفغان<br>نیشان<br>لە قەیصەری مەعدەنی خەڵووزی ئاسن دۆزراوەتەوە<br>سەفیری تورکیا لە ئەمریکا<br>تونێڵێکی گەورە<br>ئیستاسیۆنێکی قووەی هەوائییە<br>سەرما<br>ئەڵمانەکان حیمایەی چینی جنووبی ئەکەن<br>خەبەری نەجد<br>یۆنان قەرض ئەکات<br>مەوعاوەنەتی عەمەلە بێ ئیشەکانی فەلەسطین |
| ژ ٩٨: | مەلیکی ئەفغان<br>لوئید جۆرج<br>سەرمای ئەمریقا<br>سووریە لە مەجلیسی فڕانسەدا<br>قونصووڵی ئیطاڵیا لە ئۆدەسا کوژراوە<br>لەئەمریقاوە ئاڵتوون ئەبەن بۆ ئەورووپا<br>تورکەکان لە ئەمریقا پارەی قەرض<br>ئیطاڵیا و تورکیا |

| | |
|---|---|
| | شەمەندۆفری ئەلەکتریق |
| | فورطەنە لە لەندەن |
| | مەسئەلەی تەسوییەی قەرضەکانی حکوومەتی عوثمانی |
| | حودوودی بەینی تورکیاو سووریە |
| | قانوونی ئەساسیی حکوومەتعی شەرقی ئوردن |
| | پارەی تورك |
| | بەحرەین و ئێران |
| | مەلیکی ئەفغان |
| | زەلزەلە |
| | حکوومەتی ڕووسیا مەئموورەکانی نەفی ئەکات |
| ژ ٩٩: | جەمعییەتێکی سیڕری لە ئەستانبووڵ |
| | قونسلۆسی بریطانیا لە تورکیا |
| | قەبرستانێکی عەصری لە ئەنقەرە |
| | ئیتیفاقی میصرو بریطانیا |
| | سوقووطی قابینەی حکوومەتی لوبنان |
| | مەجلیسی عومووميی لۆندەرە |
| | مەلیکی ئەفغان |
| | ئێران ڕووپیە مەنع ئەکات |
| | فەقیرەکانی ئێرانی لە بەغداد |
| ژ ١٠١: | زیارەتی مەلیك و مەلیکەی ئەفغان بۆ پارس و بەرلین |
| | نەهێشتنی سیلاح |
| | بۆڵشەویکەکانی تورك |
| | مەسئەلەی وەزیری بەحرییەی تورك |
| | تەبەڕڕوعاتی مەلیکی ئەفغان |
| | هیندستان ولیجنەی تەحقیقاتی ئینگلیز |
| ژ ١٠٢: | ڕووسیەو ئێران |
| | موخابەرە لەبەینی طەهران و ئەنقەرەدا |
| | قەرضی یۆنان |
| | وەزیری بەحرییەی تورك |
| | مەکتەبی کچانی ئەمریقا لە برووسە |
| ژ ١٠٣: | موعاهەدەی بەینی فرانسەو ئەمریقا |
| | لە مەکتەبێکی کەلکەتەدا لەبەینی طەڵەبەکانا شەڕ بووە |
| | موعاهەدە لەبەینی تورك و ئیسویچدا |
| | ئیستیعفای وەزارەتی سووریا |
| | مەلیکی ئەفغان زیارەتی ئیسویچرە ئەکات |
| ژ ١٠٤: | سیاسەتی ئینگلیز لە عیراق |
| | مەلیکی ئەفغان و زیارەتی لۆندەرەی |

| | |
|---|---|
| | قسەی مەلیکی ئەفغانستان<br>لەبەینی تورکیا و یۆنانا<br>لە حودوودی ئەفغان و هیندستانا<br>مەلیکی ئەفغان |
| ژ ١٠٥: | سیاسەتی ئەفغانستان<br>بۆمبایەك لە سلانیك ئینفیجاری کردووە<br>تەعیینی ولیەم نیرل بۆ پارس<br>چوارصەد شەخص تەلەف بووە<br>وەفاتی ئیسکویث<br>بینایەکی سەفارەتخانە |
| ژ ١٠٧: | عوصبەتول ئومەم<br>شەمەندۆفری ئێران<br>ئێران لە موحەممەرەو ئەطرافی ئیدارەی عەسکەریی ئیلغا کردووە<br>مەلیکی ئەفغانستان<br>موعاهەدەی بەینی شەرقی ئوردن و حکوومەتی بریطانیا<br>لە بەحری قەزدبین فورطەنە<br>لە ئەناطولدا سەرما<br>لەبەینی شام و بەیرووتا<br>وەرەثەی سولطان عەبدولحەمید داوای ئەملاکەکانیان ئەکەن<br>مەلیکی ئەفغان<br>کچی جەلالەتی مەلیك جۆرج |
| ژ ١٠٩: | ڕەئیسول وزرای میصر<br>بۆڵشەویکی لە فڕانسەدا<br>خەطی شەمەندۆفری ئێران<br>ئاڵتوون بە طەیارە نەقڵ ئەکەن<br>زاوای ئیمپراطوری سابیقی ئەڵمان |
| ژ ١١٠: | مەسئەلەی میصر<br>ڕەفیق ترۆتسکی<br>تورکیەو لادینێتی<br>شیرکەتی نەوتی فارس |
| ژ ١١٣: | مەلیکی ئەفغان<br>مالییەی ئێران<br>سێر کلایتۆن<br>مەلیکی ئەفغان و مەلیکە<br>فڕانسە قەرضی حکوومەتی بریطانیا تەئدییە ئەکات<br>بەینی تورك و حکوومەتەکانی تر<br>شەمەندۆفری ئێران |

| | |
|---|---|
| ژ ١١٦: | ئێران بۆ ئەورووپا قوتابی ئەنێرێ<br>لەخوصووص ئیعتیرافی ئێران بە حکوومەتی عیراق<br>مەلیکی ئەفغان لە ئەنقەرە |
| ژ ١١٧: | عەدەدی حەجاجی ئەمساڵ<br>موناسەبەتی تەتویجی جەلالەتی مەلیکی موعەظەمی عیراق<br>موحارەبەی بەینی ژاپۆن و چین<br>هەرایەك لەبەینی صەهیۆنیو شیوعیەکانا |
| ژ ١١٩: | مەلیك و مەلیکەی ژاپۆن<br>ئینگلتەرە زۆر ئیهتیمام لەگەڵ طەیارە ئەکات<br>قیطارێکی شەمەندۆفر لە خەط دەرچووە<br>حکوومەتی هیند<br>ئیتیفاقی بەینی ئەمریقا و فرانسز<br>موعاهەدەی بەینی ئیطاڵیا و تورکیا<br>مصطەفا کەمال پاشا زیارەتی ئەستانبووڵ ئەکات<br>مەلیك و مەلیکەی ئەفغان |
| ژ ١٢٠: | جێگایەك دۆزراوەتەوە پڕە لە ئەڵماس<br>ئەفغان سێ طەیارەی پەیدا کردووە<br>مەسئەلەی قەرضی عوثمانی لە فڕانسە تەواو بووە<br>ماکینەی فۆطوغرافیك کە ڕەسمی مەعیدەی پێ ئەگیرێ<br>تورك موعەللیم ئەنێرێ بۆ ئەفغان<br>قابینەی میصر سوقووطی کرد<br>لافاو لە ژاپۆن<br>پۆستەی هەوائیی بەینی ئێران و بریطانیا |
| ژ ١٢١: | مەحکەمەی ئارناوود<br>حوقووقی ژن<br>عەمەلەی ژاپۆن<br>هەرە گەورەترین طەیارە<br>چینییە وەطەنیەکان<br>نەتیجەی لافاوی ژاپۆن<br>وەلیعەهدی بریطانیا سیاحەت ئەکات<br>لەبەینی ئێران و حیجازدا<br>مەندووبی سامیو قائیدی عامی فەلەسطین<br>لە چینا موحافەظەی ئەخلاق ئەکرێ<br>ئیحتیقال لەخوصووص ئیستیقلالییەتی ئەمریقاوە<br>واریداتی (پاناما) |
| ژ ١٢٢: | غەزەتەی شیکاغۆ تریبوون<br>قابینەی تازەی یۆنان |

| | |
|---|---|
| رەئیس جمهووری مەکسیقا<br>هەورەتریشقە<br>مۆمیای فیرعەونەکانی میصر<br>رەئیسی قابینەی تازەی میصر | |
| مەجلیسی مەبعووثانی میصر داخراوە<br>جوابی وەزیری خارجییەی حکوومەتی بریطانیا<br>دەعوەتی مەلیکی بریطانیا<br>لە میصرا هەراوهوریا<br>ئەنفاقی طەنجە<br>سولطانی عەمان<br>عەسکەری ئەمریقا لە چین گەڕاوەتەوە<br>پۆستەی هەوائی لە هەموو ئەناطولڵا<br>لەبەینی ئیطاڵیا و یۆنان<br>فورطەنە لە بەحری موحیطی هیندیدا<br>یۆنان و مەلەکی<br>خەطی شەمەندۆفری ئێران<br>لە ئیطاڵیادا پرۆپاغاندەی بۆڵشەویکی | ژ ١٢٣: |
| مۆزەخانەی طوپ قاپوو<br>بۆڵشەویکەکان دزی ئەکەن<br>ئێران و حیجاز<br>وەزیری بیلاطی ئێران لە لەندەن<br>وەفاتی فیلەسووفێکی ئینگلیزی<br>رەمزی ماکدۆناڵد<br>مەجلیسی مەبعووثان و ئەعیان<br>میصر: بەیاناتی میستەر چەمبرلاین<br>لۆرد لوید<br>سێر گلبەرت کلاتین | ژ ١٢٤: |
| تەئجیلکردنی مەبعووثانی سووریە<br>تەیموور طاش وەزیری ئێران<br>طەیارەیەکی پۆڵۆنیا<br>موذاکەرەی بەینی عیراق و حیجاز<br>ئەفغان و ڕێگای شەمەندۆفر<br>لەبەینی ئیسویچ و ئێرانا<br>لەبەینی چین و بریطانیادا | ژ ١٢٥: |
| مصطەفا کەمال پاشا ئەناطوڵی ئەگەڕێت و خەڵقی دەعوەت ئەکات بۆ تەعلیمی حرووفی تازە<br>نەوتی موصڵ<br>نەوتی مووصڵ بۆ حەیفا | ژ ١٢٩: |

| | |
|---|---|
| | مەندووبی سامی‌ی سووریا<br>بازاڕی ئۆتۆمۆبیل لە ئینگلتەرە<br>لە تورکیادا مەکتەبێك بۆ گەورەکان<br>طەڵعەت قیابەگ مومەثیلی تورکیا لە عیراق<br>ژن لە ئینتیخاباتا<br>نەقلییات بەطەیارە<br>ئافرەت لە ئەفغانا |
| ژ ۱۳۰: | لەبەینی نەجدو عیراقا<br>فابریقەی کاغەذ لە تورکیادا<br>حکوومەتی میصر چەند غەزەتەیەکی مەنع کردووە<br>سولطانی مەسقەط<br>ئیتیفاقی بەحری |
| ژ ۱۳۱: | ثەروەت پاشا<br>۹۰۰۰ ئۆتۆمۆبیل لە تورکیا<br>وەزیری موفەووەضی ئێران<br>تەیموور طاش وەزیری ئێران<br>سیاحەتێکی هەوائی<br>نائیبی وەزیری طەیەرانی ئینگلتەرە<br>جەلالەتی ئیبنول سوعوود<br>وەنیزەلوس |
| ژ ۱۳۲: | حادیثەیەکی موئلیم<br>وەزیری داخلییەی ئێران<br>ڕەئیسی وەزارەتی قەنادا<br>ڕەفعی حیجاب لە ئەفغانسان<br>مەسئەلەی غەزەتەچییەکەی ئەمریقا لەخوصووص نەشری موعاهەدەی بەحرییەکەی بەینی ئینگلیزو فڕانسەدا..<br>تەحتەل بەحرییەکی فڕانسە<br>بەینی چین‌و ژاپۆن<br>ئەحمەد زوغۆی مەلیکی ئارناووت |
| ژ ۱۳۳: | ئێران بۆ ئەورووپا طەڵەبە ئەنێرێ<br>مەوجوودی عەمەلە بێئیشەکان لە بریطانیادا<br>جەژنی خەڵاصی ئەستانبووڵ<br>ئیستیعفای لۆرد برکنهید<br>سەفەری ئەمیر عەبدوڵڵا |
| ژ ۱۳٤: | تەئەهولی وەلیعەهدی ئێران<br>حەربی یەمەن<br>تەنفیذی قانوونی ئەساسی‌ی چین |

| | |
|---|---|
| | حکوومەتی حیجاز<br>مەنعی بۆڵشەویکەکان لە وەظائیفی حکوومەتیدا |
| ژ ۱۳٥: | وەزیری موفەووەضی بریطانیا لە حکوومەتی ئێرانا<br>طاعوون لە چینا<br>ضابطی ئۆردووی ئەفغان<br>ڕیاسەتی جمهوورییەی ئەمریقا<br>میستەر بولدوین<br>لە ئیطاڵیادا حەفلە |
| ژ ۱۳٦: | عەرەبەکان ئێران تەرك ئەکەن<br>یۆنان لەگەڵ دراوسێکانیا<br>مەجلیسی مەبعووثانی ئێران<br>حودوودی تورك‌و سووریە<br>بەینی تەورك‌و بولغار<br>لەبەینی حودوودی سووریەو تورکیادا<br>حوقووقی ژنی فەلەسطین لە ئینتیخاباتا<br>حکوومەتی بۆڵشەویك‌و ئەمریقا<br>ئیغتیشاش لە ئێرانا<br>ئیعتیرافی مەلەکیەتی‌ی ئەحمەد زوغو بەگ<br>شاهی ئێران لە عەبادانا<br>ئیختیراعی ئێرانییەك |
| ژ ۱۳۷: | سیاسەتێکی سپری لە بەینی دووەلی ئەورووپادا<br>بەدرۆخستنەوە<br>ملیۆنێك فرانق<br>ئەهالی‌ی ئەنقەرە<br>بەپێ سیاحەت<br>نەحاس پاشا بەرائەتی کردووە<br>دەفعی مەلاریا<br>موتەخەصیصەکانی ئەمراضی عەقلییە<br>مەسئەلەیەکی غەریب<br>عینوانی ڕەسمی‌ی مەقامەکان<br>سوقووطی قابینەی فرانسز<br>تەئجیلی مەجلیسی تەئسیسی‌ی سووریە |
| ژ ۱۳۸: | لۆرد برکنهید<br>وەلیعەهدی بریطانیا<br>ئەحواڵی ئێران-ئینتیخاباتی ژن<br>مەسئەلەی شاپقە<br>وەزارەتی ڕۆمانیا |

مدیر معارف منطقهٔ بغداد جناب عبد الرزاق المدی چاپی ومفتش مصطفی افندی بو تفتیش مدارس ام لوانه تشریفیان هینا وه نسلیمانی عرض بخیرهاتنیان اکین .

بو کرپاره محترمه کانمان :

طبیعی هو ابزانن ادارهکان مصارفاتی زوره بو کلی غزته یك پاره یك زور لازمه مقابل بهم صرفیاتی و اردانی پی ویسته رجا له کرپارهکانمان اکین وام مسئله به حواله ی وجدانیان اکین اوانه ی که حقی دو سال ۳ سالیان له سره وله ابتدای نشری ام غزته وه هیشتا هیچیان نه داوه یا به جاری ویاخود به قسط پارهٔ آبونه کیان بنیرن . [ ژیا ]

مقررات محکمه :

غفور کرده زا و ابراهیم رحمان له براوه ک قماریان کردوه له سر پاره هر یکه به پینج روپیه جزای نقدی حکم دراون .

ابراهیم کوری حسن له برامه به ولاغی سقط ایشی کردوه به پینج روپیه جزا محکوم کراوه .

اعلان

بو استیفای عشر و حصهٔ حکومی کیلوی توتون امسال به یك آنه ودو پای تقدیر وله وزارت مالیشه وه تصدیق فرموراوه له اعتبار امروه ام قیمتانه اعتباری پی اکری موافق ماده ۸ نظامنامهٔ اعشار اعلان کرا . متصرف سلیمانی

عشر قسل وکچ وخشت سر قضای سلیمانی به ۳۵۰ روپیه له مزایده دایه بو امه هر کس طالبه مراجعت به مجلس اداره بکات . متصرف سلیمانی

مقدار ۳۴۲۳ تنکهٔ بطالی بنزین له کوره کانیان اخویته مزایده وه اوانه ی ایانه وی بی بیقن له تلسزخانه مراجعت به سارجین ادم مأموری تلسز بکهن .

ورقه ی مزایده ابی روژ ۱۵ تشرین ثانی له پیش ساعت ۹ انکلیزیدا تسلیم دائرهٔ قوماندان طابور چوارم لوی عراق بکریت که له و وقته دا احاله قطعی قرار ادریت .

اعلان

طالبین دعوت اکرین بو مناقصه تعمیرات بعضی خانو که له سلیمانی دا لطرف جیش لوی یه وه اشغال کراون شرائط ممکنه یا له دائرهٔ مفتش اداری سلیمانی و یا له دائرهٔ رئیس بلدیا به بینریت ، هو طلبنامه یکی مناقصه ابی بو مفتش اداری بنوسریت .

له ریاست بلدیه وه :

اعلان

| بدل مخمنه روپیه | فوت مربعی | نوعی ملك | ناوی صاحب ملك |
|---|---|---|---|
| ٤٠٠ | ٨٤٠ | قسمیك له حوشه و پایهٔ خانو | حنیفه خان حرمی کریم بك |

بو کشادی جادهٔ صابونکران له خانوی حنیفه خان حرمی کریم بك او قسمه ی که تقرری کردوه قطع و استملاك بکری نوع و جنس و او مقداره ی که لی قطع اکری له کل بدلی که له طرف هیئت تخمینیه و مجلس بلدیه وه بوی تقدیر کراوه له بالاوه نشان دراوه اگر صاحب ملك له داخل قانوندا اعتراضیکی هیه له تاریخ ام اعلانه وه هتا نو روژ لازمه درمیانی بکا بو اکادری اعلان کرا .

له چاپخانه بلدیه چاپ کرا .

بو همو شتیك

مخابرات : بەناوی ادارەخانەوە اکری

§

ادارەخانە : لە بنای بلدیەدایە

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی بە انەیکە

کرباو

دشش مانك منە

بە سالیك شش روپیەدەدا

بو دەرەوە بدل ابونە

حوت روپیە و نیوە

لە ٦ مانك کمتر ابونە قید ناکری

اعلانات

بەد پریك ٦ انە دەسینریت

یکی بە انەیکە

همو شتیك اتوسی هفتەی جاریك دردەچی غزتەیکی کوردیە

تاریخ انتشار ۲۱ کانون ثانی ۹۲٦ ( سیشەمە ) ۲۲ جمادی الاول ۱۳٤٥ ۱٥ تشرین ثانی ۱۹۲۷


خطابەیکی تعلیمی

امرو هرچند بعضیك لە علمای علم اجتماع انکار تأثیرات تربیە اکن فقط ، اکثریت عالم لەمراەن کە اگر تربیە لەکل روحا تراوق بکات تأثیریکی مهمی ابی بەسر افکار و ملکات عقلیەی انسانا ، لەبرامە لە تعلیمدا تربیە و اصول تدریس موقعیکی مهم اشغال اکن .

بو منالیك کە لە اول دورەی تعلیمیابی لازمە لە پیش همو شتیکا دقت لە جلب رغبت و یا ایجاد شوق و خواهش بکری برامبر بە علم ، ذاتاً ایستا بە تواری مضرت و بی ثمرەیتی تعلیم و تحصیلیك کە بە جبر خرا بیتە میشکەوە درکوترە .

بناء علیە اوانەی کە پروغرام دائەنین لازمە ام نقطە مهمە بکرنە پیش چاو و بعضی موضوع و مسائل مغلق نەهینە پیش چاوی منالەکان .

پیش ارەی کە منهاج تنظیم اکن لازمە ارزو ، شوق ذوقی منالەکانی محیطە کە تحلیل و بو پیدا پروغرامە کە وریك بخن .

مثلا : بو منالیکی صنف دوم ابتدائی دروس تاریخ لازم ناکات عبارت بی لە محاربات ایبیال ، یا مغلوبیت دارا و یا مذهب روما و یونان ... چونکە لە دورەی اولدا مقصد لە تدریس دروس تاریخ میشك پر کردنی منال نیە لە وقایع بی سر و بن ، بلکە نقطەی نظر لەمەدا تنها ایجاد خواهش و ذوقیکی تاریخیە بو منالە کە تاکو لەمەوە ذوق وەگری کە لە سالان اتیدا منالە کە بە امیدی عشقی حکایەتەکانی پیشو خواهش و ارزوی خویندنی تاریخ بکات .

ذاتاً هر لبرامەیە کە استاد شهیر ساطع حصری بو تاریخ صنف دوم ابتدائی بعضی اعاظم مشهور عربانی حکایەواری قبول و داخل پروغرامی کردوە ، فقط طبیعی امیش معلومە کە صرف بو منالەکانی عربی کردوە چونکە هرکس لە حکایەی احفاد و پیاوە مشهورەکانی ملتی خوی زیاتر ذوق وراکری ، مع الاسف مربیەکانی مات کورد هیشتا امەیان درك نکردوە ایستایش لە صنفی دومی ابتدائیدا عینی حکایتیك اخوینن بە منالەکانمان کە بو منالە عربەکان داخل منهاج کراوە و هر اوان استفادەی لی اکن .

رجا لە مربیەکانمان اکین لیکی بدنەوە و بزانن

ه مکاتبه‌کانی سابانیدا مقالیك له حکایه‌ی دارا ویاخود اسکندر ، یا عمر بن عاص ، زیاتر مسرور ابی ؟ ویا ه حکایهٔ پاشاکانی بابان ویا بدرخانه‌کان ویا کریم خانی زند ...

طبیعی امه اکار ناکری بومقالیك له پیش هو شـتیکا له درس تاریخدا حکایه‌ی عیطه‌کی خوی وقایعی که مناسبتی هبی به وطنه‌کیه‌وه زیاتر پی مسرور ابی وبو درس تأریخ خویندن زیاتر هوس پیا اکات .

یکی له‌کل ام مسئله معلومه‌یه‌یشدا ایستایش له معلمه‌کانمان وله‌وانه‌ی که خویان به متخصص ام درسه ازانن بو تاریخی ام صنفه عینی اوکتیبیان ترجمه کردوه که بومناله‌کانی عرب تالیف کراوه ، وامیشیان پی تطبیق اکن که تاثیرکی هیچ ناکات به سر دماغ مناله‌کانا .

انجا امیدمان وایه له معلمه‌کانمان وله انجمن معارف سعی بکن بوتأریخی ام صنفه کتیبیك که بحی مناقب علم ، محاربات پیاوه مشهوره‌کانی خومان . وکو بابان ، بدرخانی ، شیخ معروف نودی‌ی ـ او بحر علومه ، حمه آغای کویه ـ او حاتم طایی‌ه بکات تالیفی بکن ولم صنفه‌دا تدریس بکری ومناله‌کانمان ذوق لی ورگرن وخواهشتیان ببی که له صنفه‌کانی ترا استفاده له درسی مهم تأریخ بکن .

## هوالی دره‌وه :

### جلالت ملك فیصل وجعفر پاشا

لندن ـ مفاوضات بین عراق و انکلیز به موافقت وبه آرزوی طرفین جریان اکات له وزارت مستعمره‌ی بریطانیا احتمال هیه جلالت ملك وفخامت رئیس الوزراء له دوای دو هفته‌ی تر بو بغداد بگریته‌وه .

انقره ـ غازی مصطفی کمال پاشا به اجماع آراء انتخاب کراوه‌وه به رئیس جمهوری ترکیا .

### مذکره‌ی افریقا

پارس ـ له سر او اختلافه‌ی له‌سر کرك له بینا واقع بوه حکومت جمهور منطقه‌ی افریقا مذکره‌یکی داوه به فرانسه .

### کوری غلیوم المان

برلین ـ کوری غلیوم المان له سر ئولو-یست کوتوته خوارده‌وه مدهش بریندار بوه له دوای بردنه خسته خانه‌ی وفاتی کردوه .

### غاندی مشهور

بینا له و خبراته‌ی که‌ورکیراوه مستر غاندی مشهوری هندی ایروازی له سیاست هیناوه ، چونکه ل زارتی مداوسه‌کانا له‌غیری اوه که مناله کانی تشویق کردوه بو ایش کردن له خصوص صنایع و تجارت و اقتصادیات مله‌که‌وه قطعیاً بحثی سیاستی نکردوه .

### سفیر ایران له‌انکلتره‌دا

لوانس خان که له طرف حکومت ایرانه‌وه تعیین کراوه به سفیر انکلتره زیارت جلالت ملك جورج خامس کردوه واعتمادنامه‌که‌ی تقدیم کردوه .

### ایستایش عصیان دوام اکات له کوردستانی شمالی‌دا

دوغرو یول ـ بینا له سر او خبرانه‌ی که غزته‌ی ازناغ نشری کردوه ، له‌سه‌ر اوجه‌لاقیدا به تحریکات بولشو یکه کان بعضی قبائل کورد عصیانی کرده هر چند له طرف قوت ایرانه‌وه تجزیه کراون و قسمیك له سرکرده‌کانیان کیراون فقط دیشتا به تواوی تسکین نکراوه ، و دشبرت وشقاوتان هجومی کردوته سر بتلیس و قسمیکیان اشغال کردوه له جهه‌ی درسیمه‌وه وضعیت له لای کوردکانه له‌اطراف ( پالو ) دا هیجانیکی عظیم

هیه ، عشائر خنس و رئیسه‌کانی زازا متفقاً هجومیان کردوته سر ارضروم ، و قوتی زوری کورده‌کان له لای ارمراته‌وه تجمعی کردوه . عثمان نوری پاشای فرقه قوماندانی تورك به خویی قواته‌کیه‌وه مغلوب و وجعتی پی کراوه ، و له لایکی زه‌وه کورده‌کان شاری ( بایزید )یان گرتوه ، له دوای تالان کردن تخلیه‌یان کردوه و لم شرانه‌دا دو طیاره‌ی تورك سقوطی کردوه ، و کلی عسکریان اسیر کردوه .

---

هوال داخلی :

باران له بغداد

روژی ٣ ام مانگه له بغداد بارانیکی به شدت باریوه له اول شه‌وه‌وه هتا وختی نیوه‌رو دوامی کردوه .

---

رشانه‌وه

له لوای دلیا رشانه‌وه نختی کم بوه جاران که روژی پنج شش کس توشی ام علته ابو ایستا روژی انجا شخصیك اصابتی اکات .

---

وزارت عراق

غزته‌ی بغداد تایمس نوسیویتی که وتی وزرای عراق باش نیه عمر دریژیان شش حوت روژی تره فقط غزته‌کانی تری بغداد ام خبره تکذیب اکن چونکه الین له عراقا وضعیتیکی وا روی نه‌داوه که ببی به سببی سقوط هیئت وزراء .

---

تقریرانکلیز که له خصوص عراقه‌وه دراوه به عصبة الامم

له وقتی تماشا کردنی او تقریره که حکومت بریتانیا له خصوص عراقه‌وه داویه‌تی به عصبة الامم ، مستر بوردیلونی مستشار مندوب سامی بریطانیا له عراق تأکیدی تقریره‌که‌ی کردوته‌وه و فرمویه‌تی : وضعیتی عراق باشه ، له سال ١٩٢٦ له واردات صدی حوت فضله ظهوری کردوه له خصوص ایش کردنی عمله‌وه هیچ منازعه‌یك وقوعی نه‌بوه و اجرته‌کانیان زور باشه محتاج نابن به تراوی اداره‌ی پی اکن ، چونکه له مانگی ایلولا له خصوص افیون و مواد که لیه‌وه له کل حکومت ایرانا اتفاقیك کراوه ایترام موادانه له ایرانا کمتر زرع اکرین و عراقیش لم افته نجاتی بوه .

له خصوص مسائل دینیه‌وه بیانی کردوه که له ١٩٢١دا معلوم بوه که نفوس عراق عبارته له ٢٨٥٠٠٠٠ لهمه ١٥٩٠٠٠٠ مسلم سنیه و ٨٨٠٠٠ شیعه‌یه و ٧٩٠٠٠ جوله‌کیه و ٧٨٠٠٠ خرستیان و ١٥٠٠٠ ارمنی و بعضی طائفه‌ی‌ترن . و موافق قانون اساسی عراق له خصوص دینه‌وه همو شتیکه‌وه حقوق اقلیات محفوظه ، و او مسئله مهمه‌ی که له سال ١٩٢٦دا له خصوص تعیینی حدود عراق و تورکیا ، اویش به صورتیکی باش تراوبو و ایستا بینی عراق و تورکیا زور باشه و همو منازعه‌ی حدود له طرف مامورین طرفینا به صورتیکی مسالمتکارانه حل اکری .

[§§]

برائت

مالمدیری مرکز جناب سعید ادیب افندی و مالمدیری قضای دیبجا جناب حاجی حمید افندی که بینیك له‌مه‌وپیش له طرف مفتش مالیه‌وه اتهام کرابون و دستیان له ایش کیشرابووه‌وه ، انجاره له نتیجه محاکمه‌دا له طرف محکمه‌وه هردوکیان برائتیان کرد وغیره مجرمیتیان تبین کرد تبریك و اشتراك مسرور بتیان اکین .

## هاتن و رویشتن

معالی وزیر معارف جناب امین زکی بك دوینی ایواری به اوتوموبیل تشریفی هیناوته ایره . عرض بخیرهاتی اکین . و امید اکین که ام تشریفەی ببی به وسیلەیکی ترقی وتکملی مدارسەکانمان .

سعادت متصرف اکرمی روژیجمعه بو تماشاکردنی ایشوکاری قضای شارباژیر تشریفی بردبوه مرکزی قضای شارباژیر لەدوای روژی عودتی فرموەوه .

تشکرات مساعی مشکوره و تمنای موفقیتی اکین .

جناب مفتش اداری کەچندروژی لوپیش بوسیاحت وتفتیش لەکل رفیقة محترمەی میسس لاین چوبو وناحیة وارماوا روژی ۱۳ مانك عودتیان فرموەوه عرض بخیرهاتنەوەیان اکین .

حفیدزاده جناب شیخ عبد القادر افندی بو بینینی ایشوکاری خصوصی خوی تشریفی چووه بو تنکیسر .

جناب قائمقام البجه حمید بك دو ۳ روژلوپیش تشریفی هینایه سلیمانی لەدوای روژیك عودتی فرموه توفیق رفیق بی .

له بکمزادهٔ هورمان — لهون جناب افراسیاب بکی برازای وغفار بکی کوری جعفر سلطان تشریفیان هیناوەته سلیمانی عرض بخیرهاتنیان اکین .

رئیس عشیرتی پشدر جناب بابکراغای سلیم اغا لەکل سعید اغای عثمان اغا و حمه امین اغای علی اغا و مصطفی اغای عثمان اغاو رسول اغای پیروت اغا و بابکراغای عمر اغا محضا بو ملاقات و دیدەنی جناب متصرف تشریفی هیناوەته سلیمانی لەدولتخانەی جناب متصرف مسافرن عرض بخیر هاتنەوەیان اکین .

له بکزادهٔ بیاف جناب احمد مختار بك بو ایشوکاری خصوصی خوی تشریفی هیناوەته سلیمانی خیربیت .

### اعلان

خانویك که له محلهٔ چوارباغ واقعه و به ژماره ۶—۱۱۸ مرقمه و له مابینی حاجی کریم کوری حمه شریف و رحمه پکی قادر و سائره مشترکه . بناله سر دعوایك که بو ازالهٔ شیوعی اقامه کراوه . لەبراوه له نتیجەی کشفدا تظاهری کرد که خانوی مذکور تقسیم هلناکری قرار درا هتا چلو پینج روژ بخریته مزایدەوه و بفروشری . بناء علیه له تاریخی نشری ام اعلانەوه هتا چلو پینج روژ پتراوانەی که طالب به کرینی خانوی مذکورن به صدی ده تامینتەوه مراجعت به محکمەی صلح سلیمانی بکەن .

حاکم صلح سلیمانی

---

له ریاست بلدیەوه :

### اعلان

له داخل وخارجی بازاروا بەبی اذن ومعلومات دائرهٔ بلدیه آیا لەبر دوکان وایا سرریکا ومیدان کورسی صندوق وسائر هموعه اشیایك دانانی نوه. هر کسی به خلاف ام اعلانه حرکت بکا ولەبر دوکانیا ویا لسر ریکا ومیداندا کورسی وصندوق و اشیای سائره دانی بەپی ماده ۱۲۶ قانون عقوبات بغدادی تجزیه اکری بو آکاداری اعلان کرا .

### اعلان

له داخلی شرائط معینەدا درست کردنی قصابخانەیکی موقت به ۱۰۰ روپیه له عهده طالبیایه هر کسی طالب مذقصەیه مراجعت بەدائرهٔ بلدیه بکا. بو کاداری اعلان کرا .

[§§]

---

له چاپخانهٔ بلدیه چاپ کرا .

بو هەمو شتێك
مخابرات : بەناوی ادارەخانەوە اکری
§
ادارەخانە : لە بنای بلدیەدایە
مدیر : سلیمانی زیان
یکی بە انەیکە

# ژیان

کریاو
دە شش مانك سەد
بە صالیك شش روپیەدەدا
بو دەرەوە بدل ابونە
حوت روپیەو نیوە
لە ٦ مانك کمتر ابونە قید ناکری
اعلانات
بەد یریك ٦ انە دەسیترێت
یکی بە انەیکە

هەو شتێك انوسی هفتەی جاریك دەردەچی غزتەیکی کوردیە

تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦ (سیشمە) ٢٧ جمادی الاول ١٣٤٥ ٢٢ تشرین ثانی ١٩٢٧


## [ اسباب دواکوتمان ]

لەکاتێکەوە معلومە کە پنجەی استبداد مانی پێش کوتن وواسطۀ دواکوتنی قوم کورد بو . و امرو کە استبداد لە سرمان رفع بوە ایمێش بەواسطۀ توحیدی مساعی ویکیەتی لەکل قوم نجیب عرب کە عادتا مدایەکین بویك کامە حس ام تأخرە مؤسفە و امدواکوتنە الیمەمان کردوە .

بە کمال حسرت و سرصاوە بوندارك ام دواکوتنە وبو امەی کە لەساحۀ موجودیتدا تمیزی بکین امانەوی لە تعلم علوم ومعارفدا طی مسافە ودو هنکاو بکین بە هنکا یك .

وتا امرو لە ری ام مقدمە عالیەدا کە توحیدیکی فکری ومنافعیکی مشترکە متصور وغایەیە ، هیچ مانعیك ظهوری نکردوە ونشبهەیە کەلەمودوایش نایکا . و وا ازانم کە لە اموری متعارفەدا انفعیت وچاکترین تدریس ، وتدرس وقوەیك امەیە بە زمانی مادرزادی خوی بی .

چونکە اکر بەزمانیکی تر بکری لە پێش گیشتن بە غایە کە تعلم علمە ، ایجاب اکات بصرفی مدتیکی زور . اوسا لازمە تیەناچی لە مقصد بو فیربونی علمەکە کە طبیعی امیش اوقاتیکی زور ضایع اکات بە مثالەکە .

حتی بە نوعیك اکر بە لسانی خوی بە صالی فیری علمیك بەبی تحقق بە لسانیکی کە بە شش حوت صال اوسا تحصیل اکات بو اثباتی امە ، اکر مقایسەی زمانی تورك و ایستامان بکین معلوم ابی ایستا چونکە بەلسانی خومان تدریس و تدرس اکین لەکل اوسادا چند فرقمان هیە و بەو نسبتەوە چند پێشکوتوین ، حتی اتوانم بلیم طلبەیەکی صنفی پنجم ، ششم ابتدائی مقابل بە طلبەیەکی اخر صنفی اعدادی زمانی تورکە .

حتی امە دلیلە لەو ضابطانەی کە لە حربیەی تورك دراچون و ابون بە ضابط زوریان هبو بە تواوی تورکیان نە ازانی ، طبیعی کە فیری لسانەکە نەبوبی بە اولی طریق استفادەی لە علمەکەش نەکردوە .

حاصل چاکبتی تدریسیك کە بە لسانی مادرزاد بکری هیچ متخصصیکی علم تربیە وتدریس انکاری ناکات وهیچ مانیك بە لسانیکی کە ترقی نکردوە و نایکات ، مقصدمان اوەش نیە کە فیری لسانی عربی نەبین ، بلکو چونکە لەکل اوانا بە یکەوە ازین و هەمو

حقوق و منافعمان مشترکه ، و رهبر دینمان که قرآن عظیم الشأنه بو لسانه‌یه ـ لازمه کلی کوردیك هول بدا بو فیربونی ام لسانه و ربما له طلبه کانیشمان اکین له پیش همو درسیکی که‌دا له درسه کانی عربی‌دا سعی بکن به نوعیك له کل تواو کردنی تحصیل ابتدائی‌دا ام لسانیش فیر ببن .

الام بشر

له وماوه که من مدرك اندوهی بشر بوم ،
معلوم بو له‌لام هیچی و الام نهفته‌ی ،
تشریحی اکم منقبه حال و کذشته ی !
مأیوس و الیار و اسفناك کدر بوم ...

روزی نیه ام شاهی نجومه به جلالی ،
نه‌روانی به صد لوحه‌ٔ خونینی بشردا ،
شه‌وکار نیه لمعه‌ٔ نظری شاهی لیالی ،
زه‌رد هلنکری هالهٔ انواری له‌دردا ...

کاهی ایم صیحهٔ دلسوزی کسامی ،
بو دفع سفالت وکو اوازی ربابی ،
هروك تلی نالندهٔ تاری که شکابی ،
پر رعشه اپاریته‌وه بو پارچه پلامی !!

بعضاً یه‌ته بهر دیدهٔ نمناك حزینم ،
کریان و جزع فاجعه‌ی مرك مفاجات ،
آنا یه‌ته جوشش غضب کون و نو ینم ،
ام قطعه‌یه اوسا اکه‌مه شعر مجازات !! .

دنیا نه بهشته نه چمنزاری صفایه !
صحنیکی به‌لاشو به ژیانیشی جفایه !

رشید نجیب

**هوالی دره‌وه :**

سوریه‌کان له تورکیا

غزته‌کانی تورك الین حکومت قراری داوه که او سوریه‌یانه‌ی که تجنسیان کردوه انبرین بوولایه‌کانی شرقی اناطول له‌جی او کوردانه‌ی که بو غرب نیراون وهتا ایستا ۱۲۵۰۰ شخص له سوریه تجنسی کردوه به تورکه‌وه وله حکومت تورك طلبیان کردوه که‌وکو مهاجرینه کانی یونان اراضی و املاکیان باتی .

جلالت ملك حسین

غزته‌ی مقتبس نشری کردوه که جلالت ملك حسین ایه‌وی قبرس ترك بکات یا تشریف بری بو فلسطین ویا عراق فقط بنا له معلوماتیك که ور گیراوه ام شایعه‌یه اصلی نیه وجلالتی فرمویه‌تی قطعیا نامه‌وی قبرس بجی بهیلم وهیچ خیالم نکردوه بچم بو جیکاکی تر حتی فرمویه‌تی که اکر به اجل موعودی خوم وفاتم کرد نوصیه‌ی ملك فیصل اکم که له حجازا دفنم بکن .

به‌بی وستان ونیشتنه‌وه طیران هتا هند

کاپتان ماکنترش ومستر روبرت به شرطیك هیچ نه‌وستن وله هیچ کویك لا نه‌دن به طیاره له لونده‌ره‌وه حرکتیان کردوه بو هندستان .

جلالت ملك جورج نیشانیکی تبرعی امیر عبدالله فرموه .

او نیشانه‌ی که جلالت جورج خامس به امیر عبدالله‌ی تبرع فرموه مندوب سامی بالذات به‌رو کیا دوه .

قوة نظامیه‌ی بریطانیا له چین

لندن ــ وزیر حربیه‌ی بریطانیا له مجلس مبعوثانا بیانی کردوه که همو صنفیکی عسکره کانی که نیراون بو چین له پیش جون میلادا اکه‌رینه‌وه .

سیاحت وزیر مستعمرات بریطانیا

لندن ــ وزیر مستعمرات بریطانیا مستر ایمری که ایستا له سیاحتایه له مستعمره مستقله کان و له دوای وه که سیاحتی اوسترالیای کرد له ۲۷ تشرین ثانی‌دا کانه

نیوز لندا و لەو یوە اچیت بو قنادا تو لەو کانونی ثانی یەوە هتا ١٣ شباط لەوی ادبی تەوە و هفتەیك لە دوای ام تاریخە اگریتەوە بو انکلتەرە .

### قرض بریطانیا لە سەر دولتەکان

لندن ــ سکرتیر خزینەداری مالیەی انکلیز بیانی کردوە کە هتا ایستا لە قرضەکانی انکلیز ٥٤ ملیون لیرەی انکلیزی سندراوەتەوە و ایمیش لەو قرضەی امریقا کە لە سەر مانە ١٩٤ ملیون لیرەی انکلیزمان داوەتەوە .

### خلیفە سلطان عبد المجید

مخبر مقتبس خبر ادات الی غزتەکانی اوروپا اوسن . کە سلطان عبد المجید خریکە ژنیکی گنجی خلقی پارس مارە بکات . ودیسانەوە غزتەکان اوسن کە سالی ١٨ هزار لیرەی انکلیزی لە طرف حکومت تورکەوە بوی تخصیص کراوە . فقط وکو تحقیق کراوە ام شایعانە اصلی نیە . نە پارەیکی بو تخصیص کراوە لە طرف حکومت تورکیاوە نە آرزوی ژن هینانی کردوە .

### نفوسی تورکیا

وکو اجارە بە تواوی حساب کراوە نفوسی تورکیا عبارتە لە ١٤ ملیون ولەمەدا ٨٥٠٠٠٠ لە نفسی استانبولدایە .

### الکتریق لە طهران

بلدیەی طهران قراری داوە کە بعضی لە جادەکان بە الکتریق تنویر بکات وبو امە خریکی کرینی دو موطوری گورە وبە قوتە .

الین حکومتی ایران ری . بینی حیدر اباد جلدیان کە شش ساعت لە حدودی عراقەوە دورە چاکی کردوە وبە تواوی اوتومبیلی پیا اروا . و لە سەردشتیش قشلە یەکی بو عسکری درست کردوە .

### طیارە لە سەر دەماوند

طهران ــ شرکت طیران (جنکرس) المانیە طهران دستی کردوە بە گران بە سەر هەرە نقطەی بوزی شاخی دەماوەندا . و لە اهالیش اوی ایەوی ام سیرە بکات بە ( ١٥ ) تومان سواری اکن .

### لە بینی روس و ایرانا

او مفاوضەیەی کە لە خصوص تعیین حدودەوە جریانی اکرد لە بینی ایران و روسا اجارە بە سهلی تواو بوە و بم نزیکانە تودیعی مجلس مبعوثان اکری .

### حوال داخلی :

#### مستر جاردین

جناب مستر جاردین مفتش اداری لوای موصل تعیین کراوە بە مستشار وزارت داخلیە .

و لە جی او جناب میجر ولسن مفتش اداری دایم تحویل کراوە بو موصل .

چوار طیارەی بحری حکومت فخیمە بریطانیا لەم روژانەدا لە بغدادەوە حرکتی کردوە بو شرق اقصی و اوستراليا .

اجارە لە بغداد کتیبیکی قدیم و کون دوزراوەتەوە کە لە طرف مرحوم سید شکری الوسییەوە تألیف کراوە بحث لە تاریخ مزگوتەکانی بغداد اکات .

### هاتن و روشتن

سعادة مدیر عام نفوس جمیل بك العزاوی لەگل سعادة مدیر عام سجن رؤف بك الکبیسی و مدیر سجن کرکوك بو تفتیش معاملات نفوس و سجن روژی ١٩ مانگ تشریفیان هینایە سلیمانی لە دوای روژیك هودتیان فرمووە .

لە بکرادە و معاون جاف جناب حسین بك علی بك محمود پاشا بو ایشوکاری خوی لە حلبجەوە تشریفی هیناوەتە ایرە .

امه صورت تحریرات زماره ۳۸۳۸ و تاریخ ۱٦ تشرین اول ۹۲۷ (سکرتیر) مجلس وزرایه که بو وزارت مالیه‌ی تقدیم کردوه .

لپاش احترام ؛

اسرم پی کراوه که جواب بنوسمه‌وه لسر تحریرات زماره م ۱۳٦۸ و تاریخ ۵ ــ ۱۰ ــ ۹۲۷ جنابتان که له‌و تحریراته‌دا اقتراحتان کردبو به عطا کردنی معاشی تقاعدی به پی قانون به متقاعده‌کانی لوای سلیمانی له‌و اشخاصانه که له زمانی احتلالدا له عراقدا بون و یا له پیش تاریخی ٦ نیسان ۹۲۵ وه هاتنه‌وه بو عراق به شرطی اثبات استحقاقی خویان به اوراق رسمیه بکن و مساعده‌یان بو بکریت که قبولی مراجعت و عرضحالیان بکریت له تاریخ تبلیغ ام قراره به‌لوای . ای نی منا ه‌ ۳ ــ ۳ مانك .

و تبلیغتان اکم که‌مجلس وزرا له‌دانیشتنی مصادف به ۸ تشرین اول ۹۲۷ یاندا قراریان دا به قبول کردنی ام اقتراحی ایوه‌یه و جلالتماب نائب ملکی معظمیش اراده‌ی پی فرمو ایتر احترام .

له وزارت مالیه‌وه

زماره ــ ۷٤۹۳

تاریخ ــ ۳۱ تشرین اول ۹۲۷

صورتی ام تحریراته بو دائرهٔ تقاعد بو اجرای ایجابی و بو معلومات که استحقاقی او شخصانه انی بدریت له ابتدای تاریخ قراری مجلسی وزراوه که مصادف به ۸ تشرین اول ۹۲۷ ه صورت ام تحریراته بو متصرف لوای سلیمانی به‌سرعتی عکنه‌هرچی عرضحال لیك لم خصوصه‌وه تقدیم کراوه کوی بکنه‌وه وله‌کل اوراقی مثبته‌یاندا بینیرن بو دائرهٔ تقاعد و تبلیغی علاقه‌دارانی بکن که له تاریخی وصولی ام امره به لوای ایوه‌وه هتا ۳ مانك عرضحال وطلبیان قبول اکریت بو ام خصوصه وله‌پاش ۳ مانك ایتر هیچ نوع عرضحال وطلبیان بو ام جهته قبول ناکریت .

له جیاتی وزیر مالیه

اعلان

| نوعی | موقعی | دونمی | مقدار فروشتنی |
| --- | --- | --- | --- |
| دیم ترلا | زمینی پر اشکوت | ۱۸ | ۳ دربعی |
| « | « شیخ رضا | ۱۸ | « |
| « | « قادر جوتیار | ۱۸۰ | « |
| « | « بانی زرد و برده | ٦۰ | « |
| « | « داره کوره | ۷۲ | تمامی به اعتبار ۲۰۷۲ سهم ۱۱٤۳ سهمی |
| « | « بیران | ۳۰ | « |
| « | شیوی خیاران | ٥٤ | « |
| « | اشکوت قنبر | ۱۲ | « |
| « | امخیر | ۳۰ | « |
| « | داره کوره | ۱۹۲ | « |
| « | قره قاچاوی | ۳۱ | « |
| صولی ترلا | زمینی سرچاوه | ۱۵ | « |
| « | « ملك | ۱۲ | « |
| « | « کلاوه | ۱۲ | « |
| « | سرچشمه‌ی اسطیل | ۲۰ | « |
| دکرمان | اشورت | ۱۰۰ | ۳ دربعی |

او اراضیانه و اش که له بالادا نوع و موقعیان نوسراوه و له دی اسطبل تابع ناحیه‌ی قره‌داغ واقعه و عائد به شیخ قادر افندی کوری مفتی شیخ محمد افندیه مقابل طلبی میره کوری موشی که عبارته له ۱۸۰۳ روپیه و حوالرانه خراوه‌ته مزایده هر کس طالبه به صدی ده تامینات مراجعت به دائرهٔ اجرا بکات و دلال توفیق اغا . دائرهٔ اجرا

له‌چاپخانهٔ بلدیه‌ چاپ کرا .

بو همو شتیك

مخابرات : بەناوی اداره اکری

§

ادارەخانه : لە بنای لدیەدایه

مدیران : سلیمانی زیان

یکی بە انەیکه


# ژیان


همو شتیك انوسی هفتەی جاریك دردەچی غزتەیکی کوردیه

سکریار

بە شش مانك شه

بە سالیك شش روپیەدەدا

بو دردوه بدل ابونه
حوت روپیه و نیوه

له ٦ مانك کر ابونه قیمەکری

اعلانات

بەدیریك ٦ انه دەسپریت

یکی بە انەیکه

تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦

( سیشمه ) ٤ جمادی الاخر ١٣٤٥ ٢٩ تشرین ثانی ١٩٢٧


## [ تجنید اجباری ومندوب هولیر ]

لەم چندانەدا لە روژنامەیکی ( بغداد تایمس ) دا مقالەیك لە خصوص تجنید اجباریەوه بە امضای مبعوثیکی مقتدر کورد نوسرابو خوبندمانەوه ولەعین زمانا بعضی ردەی پرهیجان غزتەی العراق والعالم العربی شمان دی .

لەبر اوه مسئلەی تجنید اجباری عادتا قضیەیکی حیاتیەیه بو عناصر متحدهٔ عراق وبالخاصه لەم وقتەدا کە لەم خصوصەوه لە لندن مفاوضه جریان اکات . به لازمان زانی ایمەیش لم جهتەوه فکری خومان بیان بکەین . محرری العراق لە ردیەکەیدا الی مبعوثیك ناتوانی فکریکی ذاتی خوی بە غایەیکی ملی نیشان بدا فقط محرر اگر تحقیق زیاتر معنای کلیمەی ( نائب ـ وممثل )ی لیك بدایەوه وی اکیشت کە هرقسەیك لە دمی مندوبیك بیتە دەره عکس صدای خطاب بیست هزار شخصه کە مقدرات ومقررات حال و استقبال خویانیان تسلیم کردوه ، جدا شایان استغرابه ! کە مبعوثیك بتوانی بە ناوی وکالت ملیەوه لە مجلسا رفض ویا تصدیق همو نوعه قوانین و نظامانی بکا ، فقط نتوانی فکریکی خوی کە خلاصەی افکار عمومیەی موکلەکانیتی بە غزتە نشری بکات .

لە حالیکا مبعوثیك لە مسئلەیکی وا مهمدا صلاحیتدار بیان رای ملتەکەی نەبی . مجبا غزتەیك بو نشری افکاری ذاتی خوی چە صلاحیتیك ابنی وعکس ام فکری مندوبەی لە چیەوه درك کرد وحکمی پی اکات . صاحب ام ردیەیانه لازمه بزانی کە مبعوثیك شاررا رنی کیشەو وذی نفوذی وك رواندزی تاکو بە تواوی مضرت ویا منفعت تطبیق تجنید اجباری محاکه ولم خصوصەوه افکار و آرا وقابلیت ملتەکەی خوی تحلیل نکردبی سر بخو قسەی وا ناکات . وك لەسرەوه وونمان فکری رواندزی خلاصەی فکری کرای عمومیەی ملی کورده .

وام فکر وقراری ملی کورده وام ناشەمان هیچ امه نیه کە بی لیکدانەوه فکریك ویا ریکایەکی مخالفت بکری و ضدایەتیك تعقیب بکات ، بلکو ازانی کە لە تطبیق امەدا وکو منفعتیکی نابی بالعکس ضرریکی زوری ابی بو ملت و وطنەکه .

اگر بە تواوی ام مسئلە یە محاکە بکەین وا بزانم کس نیە حالی حاضر تطبیق ام قانونە مهمە بە چاك بزانی ، چونکە طبیعی واسطەی تطبیق تجنید اجباری بو اوەیە کە ملتەکە فیری خدمات و وظائف عسکریە بکات کەلە حالیکی تعرض و هجوما وطنەکەی لە استیلای اجانب و دوشمن محافظە بکات و بپاریزی فقط محافظە وطن بەوطن خوشویستنەوە ابی ، وطن خوشویستنیش بە نسبت ملتەکەوە لەکل عقل و علما یەوطا متناسبە .

ملتیك هتا عقل و سویەی بە درجەیك نکیشتبی کە بچی بزری تکاملی کردوە ام فکرە عالیەی نابی .

هرچند ناتوانم بلیم ملت عراق هموی جاهل و ام فکرە عالیەی نیە فقط اتوانم بلیم بە اکثریت و حتی قسمیکی زوری هیشتا کوچەرە ، بونی مدنیتی نکردوە ، عادتا لە وضعیت دنیا بی خبرە و هیشتا چونکە هیچ مکتبیکی ندیوە لە علم و معرفت بی بهرە ماوەتەوە حاصلی وحشیە . لە برامە لەمانە هیچ امید ناکری کە ام فکرە عالیەیان هبی و وطنەکەیان خوش بوی .

عجبا هیچ امید اکری کە معدی یك و یا شارەزوریك بو محافظەی وطنەکەی روحی فدا بکات و مقابل بە کوللە و بومبا رابوستی ؟

لە براوە هتا ام عشائرانەمان و جاهلەکانمان لە نور معارف بهرەمند ابن و حسی عالی محافظە وطن پیدا اکن و بە واجب ازانن و تعرض وطنەکیان بە تعرض ناموسیان ازانن ، باش نیە ام قانونە تطبیق بکری . و ام فکرە بهیتریشە حیزی امەلەوە ، چونکە وکو وتمان غیری امە استفادە لی ناکری و ابی بە واسطەی رنجیدە دلی ام نوعە انسانانەمان و تەشبی بە سبب اختلافات اهالی ، اینجا بو ایمە لازمە لە پیش امە دا سعی بکین کە تدریجا بە قدر قوت و اقتداری حکومتەکان عموم ملتەکان اتسابی معارف بکات ، جاهل نی نیتەوە ، فیری امیش هول بدین بو اکال او هموو نواقصانەمان کە لە اقتصادیات تجارت ، زراعت و معارف ... دا همانە .

اوماکە ملتەکان پیشکوت و حس محافظەی وطنی پیدا کرد و تعشق بە وطنەکیەوە کرد تطبیق ام قانونە لازمە و بلکە واجبە .

حتی امیش دابلە حکومت ایران درار نمیان کە هموو ابزانین حکومتیکی چند کونە و بە تواوی مستقلە فقط چونکو هیشتا ملتەکەی اکثریتی جاهلە لە دوای اویش کە قانون مکلفیت عسکریەی لە مجلس مبعوثانیا تصدیق کرا هیشتا ناتوانی تطبیق بکات .

کەوانە لە جیاتی تجنید اجباری اگر تطبیق قانونی تدریسات اجباری ، هیچ نەبی قسم ابتدائی بکری باشترە و نفعی زیاتر لی ابینین .

---

بو عموم اهالی لوای سلیمانی

بە ناوی حکومتەوە تشکر حسیات و اطاعتی هموو ملت لوای سلیمانی اکم کە وکو لواکانی عراق زیاتر اطاعتی هموو اوامر و قوانین حکومتی اکەن . بالخاصە لە مسائل تسجیلی نفوسا لە هموو کس زیاتر اطاعتیان کردوە . وبە صورتیکی باش بە نوعی کە ارضای دل حکومتی بکەن ام معاملەیە تسجیلە لە طرف مامورینەوە تحریر و اهالیش موافق امریان حرکت اکەن .

فقط وا تی کەم کە قسمی وا ظن ابن ام نفوس نوسینە بو اوەیە کە بکرین بە عسکر . وتأمینی ام نوعە شخصانە اکم کە ام تسجیل نفوسە بو عسکری نیە و بلکە امە اصولیکە کە لە حکومات کرە ارضا مرعی الاجرایە ، هموو حکومتی لازمە دائما مقداری نفوسی اهالی تابعە کەتوی بزانی . وداتا لەودوا هموو معاملاتیکی حکومتی وکو طاپو ، دعوای محاکم ، نکاح ، تقاعدی بو او شخصانە ناکری کە تسجیل نکرابن . حاصلی تسجیل نفوس هی بو عسکری نیە بلکە بو استاتستیق وبە رایین

مقـداری مانه‌که‌یه انجا رجا اکم له‌وانه‌ی که ام فکره‌یان هیه وازی لی‌بهینن و اطاعت بکن و ئه‌وتواوی حکومت له خویان رازی بکن .

متصرف لوای سلیمانی

## عراقی دره‌وه :

قرض اهالی بریطانیا

مستر شرشل وزیر مالیه له‌سر سؤالیك که لی‌کراوه جوابی داوه‌ته‌وه که قرض اهل بریطانیا هتا امسـال گیشتوه‌ته ده ملیار و ششصد و بیست و دو ملیون لیرهٔ انکلیزی و فائضه‌که‌ی عبارته له ٣١٦ ملیون لیره و اگر حسـاب بکری کل نفریکی بریطانیایی لام قرضه ١٦٨ لیره و ١١ شیلینك براده‌وی .

عشائر نجد تعرض نقطه‌یکی عراقیان کردوه

قسمیك له عشـائری نجد شـه‌و بدزیه‌وه هجومیان کردوته‌سر نقطه‌ی مخفر الابضیه‌و محافظه‌کانیان‌سربریوه له سـر اوه حکومت تدابیری لازمه‌ی اتخاذ کردوه بو ضرب و تنکیل ام جانیانه .

اتحادی جمعیتیك بو محوی بولشو یکیتی

لاهی — جمعیت اتحاد دولی ضد بولشـو یکیتی کشـاد کراوه و بو ام جمعیته زور اعضای دولته‌کانی اوروپا اشتراکیان کردوه و خریکی دانانی قانونیکن که‌بی به واسطه‌ی محوی افکاری بولشو یکیتی .

رفینی طیاره بی انسان

جمعیت تجارب هوائی له پاریس جهازیکی ایجاد کردوه بو طیاره که به بی سائق له خو یه‌وه بو او جیکا یه‌ی که مطلوب‌بی اروا و اجاره بو تجربه له مارسلیاوه حرکتی پی اکری بو پاریس .

هوال داخلی :

مفاوضه‌ی بینی عراق و بریطانیا

بنا له‌و تلغرافانه‌ی که له لندنه‌وه هاتوه : له دوای تواو بونی نقاط اساسیه‌ی تعدیل معاهده‌که له طرف هیئت طرفینه‌وه اجتماعیکی که کراوه له خصوص حل بعضی مسائل فرعیه .

مستشار جلالت ابن السـعود

شیخ حافظ وهبه‌ی مسـتشار جلالت ملك حجاز ابن السـعود به طیاره هاتوته بغداد له دوای روژی به طیاره حرکتی کردوه بو کویت .

مستر سمیث

مستر سمیث مسـتشار وزارة معارف چونکه مأذونیته‌که‌ی تواو بوه له بریطانیاوه هاتوته‌وه بغداد و مباشرتی کردوته‌وه به ایش .

وزیر مالیه

معالی یس پاشا الهاشمی وزیر مالیه بو تماشا کردنی ایشو کاری مالیه تشریفی بردوته بصره .

قاتل کولونل لجمن

شیخ ضاری قاتل کولونل لجمن دردست و سوق محاکمه کراوه .

مستر بوردیلون

مستر بوردیلون مستشار معتمد سـامی بریتانیا له عراق که چوبو بو جنیف . عودتی فرموته‌وه بغدا .

ربط عراق به بحر ناوه راسته‌وه

وکو غزته‌کانی لندن اینوسن او مهندسانه‌ی که له طرف حکومت بریتانیاوه تعیین کراون بو انشای خط شمندوفری بینی عراق و بحر سفید له حیفا دسـتیان کردوه به ایـش . وقرار وایه به ٣ سـال ام خطه تواو بکری .

جمعیت نهضهٔ کوردی له شام

العالم العربی — جمعیت نهضهٔ کورد له‌شام به‌ناوی [ کوردستان تمالی‌جمعیته‌وه ] احتجاجیکیان کردوه مقابل به حکومت عراق له‌سـر اوهٔ که زین العابدین بگی له مملحیق عزل کردوه .

سنا لەخبریك كە وەمان كرتوە اجارە وزارت معارف زین العابدین بك تعین فرموتەوە بە مدیریت مدرسۀ قامهٔ كركوك عاذا تشكر لطف وحسیاتی وزارت معارف وتبریكی مومی الیە زین العابدین بك اكەین ۰

[ ژ ]

وفات

نكی جلالت ملك معظم وخوشەویست عراق بە اجل موعودی وفاتی فرموە خدا لی خوش بی عموم ملت كورد اشتراك الم وتعزیهٔ لەكل قامایا عترمەیان اكات ۰

## هاتن و روبشتن

سعادت متصرف فعال وخوشەویست ملت روژی چوارشمە بو تماشاكردنی ایشوكاری اداری وعسكری لەكل آمر منطقهٔ شمرقیە جناب حمید بكدا تشریفیان چوبوە پنجوین لە دوای چوار روز عودتیان فرموە تمنای موفقیت ومساعی مشكورەیان اكین ۰

مفتش عام پولیس بەری خانقین دا لەهلبجەوە تشریفی هاینایەایرە وبەاوتوموبیل عودتی كردوە ۰

حفیدزادە شیخ عبد القادر افندی لە تنكیسرەوە عودتی فرموتەوە بخیر بینەوە ۰

اعلان

بو استیفای حق حكومتی بو جلتك امسالی قضای سلیمانی و شارباژر طنی بە ١ ــ ١٦٠ روپیە كە حقەیكی شش انە و شش پای و بو قضای هلبجە طنی بە ٧ ــ ١٣٥ روپیە كە حقەیكی پینج انە و شش پای اكات تقدیر و لە وزارتی مالیەشەوە تصدیق فرمووراوە پیویستە موافق ام قیانە عشری حكومتی استیفا بكن ۰

متصرف سلیمانی

اعلان

نصفی دو اش كەلەدی نوتی تابع ناحیەی قرەداغ واقعن او دو نصفە بە اعتباری سی پش حفدە پشی كە موروثا لە شیخ حمە علی كوری شیخ حسینەوە بوی بجی ماوە و عائد شیخ قادر كوری شیخ محمد مفتی یە اوا مقابل دینی حاجی احمد كوری حاجی كریم كەلە ذمتی متوفی شیخ حمە علی بوە خرایە موقع مزایدەوە لە تاریخ نشری ام اعلانەوە هتا سی ــ ٣٠ روژ اوانە كە طالبن لازمە بە صدی دە تامیناتەوە مراجعت بەدائرهٔ اجرای لوای سلیمانی بكن لە براوە كیفیت اعلان كرا ۰

دائرهٔ اجرا

لە محكمهٔ صلح سلیمانیەوە :

اعلان

خانویك كەلە كرەكی كویژە واقعە و بو ازالهٔ شیوعی لە طرف احمد افندی عزیز آغاوە لە محكمەیە ادعا واقع بوە ولبر اوە لە بشدار مدعی علیە غفور كوری حاجی صالح شوینی ونە وكس نازانی لەكوی بە بەپی اوقرارە اوا پی را اكەینری كە اكر ٢٢ كانون اول ٩٢٧ روژی پنجشمە سعات چوار عربی بو محاكمە خوی ویاخود وكیلیكی حاضر نەبیت محاكمەكەی بە غیابی یعنی بەبی او اكریت ۰

لە ریاست بلدیەوە :

اعلان

چایخانەكی ناو باغچەی بلدیە لە داخل شرائطی معینەدا بە وعدهٔ سالیك بە اجارە ادری هركس طالبە مراجعت بەدائرهٔ بلدیە بكات بو اكاداری اعلان كرا ۰

اعلان

تعمیر وهلكیرانەوە وسوغی سربانی سیازدە دوكانی بلدیە لەكل سوانمی سربان چایخانە وتارمە وقهوەوجاغی ناو باغچەی بلدیە بە ٢٤٠ روپیە لە عهدهٔ طالبیایە هر كسی طالبی تنقیصە مراجعت بە مجلس بلدیە بكات بو اكاداری اعلان كرا ۰

لە چایخانە بلدیە چاپ كرا ۰

سال ـ ۲ ژماره ـ ۹۳ (ژیان) لاپره ـ ۱

بو هەمو شتیك
مخابرات : بەناوی ادارەخانەوە اکری
§
ادارەخانە : لە بنای لدیەدایە
مدیر : سلیمانی زیان
یکی بەانەیکە

# ژیان

هەر شتیك ائوسی هفتەی جاریك دردەچی غزنەیکی کوردیە

کریار
بەشش مانك سە
بەسالیك شش روپیەدەدا
بو دەرەوە بدل ابونە
سوت روپە وئیرە
لە ٦ مانك کمتر ابونە قبول ناکری
اعلانات
بەدیریك ٦ انەدەسینریت
یکی بەانەیکە

تاریخ انتشار ۲۱ کانون ثانی ۹۲۶ (سیشمە) ۱۱ جمادی الاخر ۱۳٤٦ ٦ کانون‌ول ۱۹۲۷

## ملت و ملیت

زور بەوربای بی ریای بە طرفی خوماندا بروانین وتی بکاین ایمرو لە سر روی زمین هیچ شتیك نیەکەادیا وتی یشتوانی مال میدینە حالی تمهیج اکرە بە غیری بەرەکانی ملیت و قومیت نەبی . هەمو فردیك و هەمو ملتیك ایوی خوی و ملتی خوی برزتر بیات و مسعودتر بژی ! و نتیجۀ ام رقابتەیش هەمو ملتیکی بچوك و مردوی زندو کردوتەوە ، و لە حقیقتیشدا ام برەکانیە ملل دنیای قات قات برز کردەوە و بو بەسببی راحتی و سعادت و تمدنی اقوام .

کوابو بومان معلوم بو ایمرو ایمە لە عصر قومیتا ازین وژیانیشمان بە محافظەی قومیت و ملیتەوە بیك دیت ! ملتیك بەهەمو عزمیکی خویەوە اگر موجودیت و صنعتی ملیەی خوی محافظە نەکرد ابزانین کەاو ملتە لم عصر قومیتەدا حق ژیانی نیە ! و برەو بیری قلاکتی پاشەروژ اچی .

اگر رو بە روی وابوردو بەبینەوە ملتی کوردیش لم برەکانی و مجادلۀ ملیت و قومیتە نابی بی بش بمینیتەوە چونکە لەبیش کلی کسا ام حسەی لە ناودا بلاو بوتەوە وام حسە بیشکی هەمو افرادی ملتی کوردی بم روحە پروردە کردوە چونکو طبیعتا موقع و محیط کوردەواری مساعدهٔ کردوە کە بە نظر انقلابات زمانەوە سکنای قوم کورد برە بە راەرەوی ملل ، و لە هەمو ملتیکیش بە قدر خوی انقلابات سیاسی و فکری ورگرتوە کە امەیش بوە بە سببی خوناسینی خوی و ولاتی و قومیتی ! اگر چە ایمرو ملت کورد لم عصر تمدنەدا بە نوادی سعادت تمدنیتی ورنکرتوە بلام طبیعت وای بی بخشیوە کە ملتی کورد بە هیچ مانیك تمثیل و تخریب ناکری ، بە نظر اجیالەوە محیط مساعدهٔ کردوە وایکات کە الی الابد محافظەی قومیت و وطنی خوی بکات .

هەروکو خومان الین [ خوویە کە گیرا بە شیری ترك نادری بە بیری ] ، یعنی ملت بە پی تربیەیك و حسیك کە وری گرتووە ادارهٔ نفس و ابرازی لیاقت وحریتی خوی اکات . لەکل امەیشدا بو تمدن وترقی ملتی کورد ایمرو هیچ مانعیك نماوە چونکە ملتیکی وریا وزندو قابلە زو بی بکات و استعدادی معارفی برزبوەتەوەی بکات ! ابتر کوابو بوداگیرساتی چرای روشنایی مستقبل بە کرمی تی کوشین اری ام وظیفە مقدسە و واجبە بجی نەهینی لەم عصری مدنیتەدا بە غیرە انسان عد اکری .

ماریەتی
[ ژیان ]

## آفرەت

— ۱ —

لامواية كس نيه نزانى كه افرەت آفريدەى خوايه وەكو پياو . خوا بوچى افريده كردوه كەوەكو پياو له دونيادا بژى ورابويرى وهرچى خوا فرمويتى بيكا وهرچى نەى فرموه نەيكات يعنى جگه لەوەى كه ژنه و آفرەته هيچ فرقيكى ترى نيه لەگل پياوا . وپياويش جگه لەوەى كه پياوه هيچ فرقيكى ترى نيه لەگل ژنا پياو بوچى خلق كراوه افرەتيش بو اوه فريده كراوه .

واقعا پياو له عقل وبدندا فائقيتيكى هيه بەسەر افرەندا . بەلام ام فائقيته زادەى تقويه وپى گياندنى چند هزار سالهٔ ام قوتەيه . هروكو پياو ، اگر افرەتيش تا ايستا ، عقلا وبدنا له فعاليت و ايشدا بوايه فرقيكى واى نه امالەگل پياودا .

تو سيريكه ، بو بدبختى ايمه ، له پاش ام همو تجربه ورابواردنه ، بەم همو دلائل عقلى ونقليەوە وكو لەوپيش آفرەت هروا لەدوا وبى دس بى ، هروا بازيچهٔ پياو بى .

وكو چون پياو خويندن وتربيهٔ لازمه افرەتيش بەامرى خوايش ، ابى بخوينى وپى بگات . چونكه اگر ام حاله هروا دوام بكات ، هرپياو بخوينى وتربيه بدرى وتكامل بكا و افرەت هروا لەژيرەوەبى ، بى معرفت وزانست بمينيتەوە روژيك دى كه ايتر آفرەت له حياتدا ، غيرى بو دفعى لذت پياو زياتر بو هيچى تر قيمتيكى نامينى ولەبرچاو اكويت وبكى اكويت ، ابر اوه هر وكو خوايش فرمويتى ابى لەگل پياوا آفرەتيشمان پى بگەيەنين وفيرى صنعت ومعرفتيان بكەين .

ماويەتى

---

## هوالى دەرەوە :

### معاهدهٔ بينى فرانسه و يوغوسلاويا

پاريس ـــ مسيو بريان لەخصوص معاهدەى بينى فرانسه و يوغوسلافياوه لەگل مخبريكى غزتەدا قسەى كردوه وتويتى ام معاهدەيە كه كردومانه لەعليهى هيچ حكومتيك نيه و مطابق پروغرام جمعيت عصبة الامم كراوه .

### يونانيش خريكى معاهدەيه

بلغراد ـــ بنا لەگفتگويك كه له بينى يكى لەوزراى كونى خارجى يونان و وزيرخارجيەى يوغوسلافيادا كراوه وا دراكەوى كه حكومت يونانيش لەهولدانايه كه معاهدەيەكى ضمانت و صداقت لەگل فرانسەدا بكا .

### بودجهٔ توركيا

انقره ـــ حكومت توركيا بو سالى ۱۹۲۸ بودجه تنظيم كردوه و داويەتى بەمجلس مبعوثان و ۲۰۶۲۹۱۰۰۰ ليرەى توركياى مصارفات پيشان داوه .

### هدى خانم شعراوى

مصر ـــ هدى خانم شعراوى كه يكيكه لەتيكوشەر و پيشكوتوانى ژنانى مصر بواوەى اشتراك جمعيت ژنان بكات كه لەخصوص اتخاذى تدابيرەوە بو منعى حرب كوبونەوە بە ناوى ممثليتى مصرەوە حركتى كردوه بو امستردام .

### ملك افغان

غزتەى ( بوركشەر پوست ) نوسيويتى كه ملك افغان له ۱۲ كانون اول ۹۲۷ دا مواصلتى مصر اكات و ميوانى جلالت ملك فؤاد ابى .

### ايطاليا متاثره

روما ـــ مخبريانى معاهدەكەى بينى فرانسه و يوغوسلافيا هيجانيكى زورى داوە بە مقامات سياسيەى ايطاليا چونكه الين مادهٔ ٤ و ٥ معاهدەكه بە قرارى له

عایدی ایطالیایه و مغایر قرارات عصبة الامم .

### استرن بانق

استرن بانق له محکمه مختلطه‌ی استانبولدا له‌عایدی تورکیا شکاتی کردوه طلبی او خساراته اکات که‌له حرب عمومی‌دا تورکه‌کان له بغداد له شعبه‌یه‌کی بانقه‌کیان داوه .

### رفیق ادولف

رفیق ادولف که یکیکه له‌هره پیشکوتوانی پیاوانی فعال بولشو یك انتحاری کردوه .

### او طیاره‌ی که چووه بو هندستان

لندن ــ هیشتا هیچ خبریك ورنگیراوه له‌و طیاره‌ی که له لوندره‌وه حرکتی کردوه بو هندستان چونکه طیاره‌که بنزینی ۴۸ ساعت ری‌ی به و امده‌یش تواو بوه وهیشتا هیچ خبریکیشیان لی ورنگرتوه بووه به موجب مراق وغائله . وا در اکوی که له ختام بنزینه‌کیا له جیکایك نیشتوته‌وه که دوره له ری تلغراف و اسباب خبردان .

### مفاوضه له لندن به صورتیکی باش جریان اکات

بنا له‌و تلغرافانه‌ی که له لوندره‌وه هاتوه . له بینی هیئت طرفینا مذاکره به صورتیکی بی قیل وقال جریان اکات هیچ مشکلاتیك روی نه‌داوه و احتماله جلالت ملك وفخامت رئیس الوزراء له یکی مانکا بوعراق حرکت بکن .

### به تلفون له‌کل واپوره‌کانا قسه کردن

برلین ــ له طرف دوائر پوستة المانه‌وه بوتجربه له بینی استاسیون و واپوره‌کانی که له وسطی بحران به تلفون دست کراوه به مخابره . وله تجربه‌که‌دا موفق بون .

### ۷۲ شخص له استانبول حبس کراوه

انجاره حکومت تورك له استانبول ۷۲ شخصی حبس کردوه له سر اوه که به واسطه‌ی رئیسی قومپانیه‌کانی روسه‌وه دستیان کردوه به پروپاغانده بو بولشویکیتی .

### مخالفت له بینی کوره‌کانی بولشویکا

لندن ــ لو تلغرافانه‌ی که له موسکووه هاتوه وا درکوتوه و ام خبره له‌دوایشا به رسمی اعلان کراوه که زور له‌پیاوه کوره‌کانی بولشویك که له‌وظائف مهمه‌دا بون له وظیفه‌کیان انفصالیان کردوه .

وکو رفیق راکوفسکی اوی‌له پیشا سفیری روس بو له‌لندن و له‌دوایدا تحویل کرا بو پارس و له‌وبشدا لسر طلبی فرانسه جایی موسکو کرایه‌وه و رفیق کامنیف که یکی بو له‌رفیقه کوره‌کانی لنین و رفیق رادیك که زور واسطه انقلاب و دسائس و هیناته وجودی بولشویکیتی بو و زور اشخاص تریش که زمام ادارة حکومته‌کیان بدسته‌وه‌بو .

### جلالت ملك

لندن ــ جلالت ملك فیصل له‌لوندره‌وه حرکتی فرموه بو مانجستر و له‌وی زیارت عموم مصانع و فابریقه کانی و بالخاصه مصانع چنین کردوه له طرف اهالی و محافظ شاره‌وه به صورتیکی فوق العاده استقبال کراوه و محافظ مانجستر به ناوی عموم اهالی‌وه تشکری جلالت ملکی کردوه له خصوص معاونت کردنه‌وه له حرب عمومی‌دا

### هاتن و رویشتن

سعادت مفتش اداری روزی یکشمه بو تماشا کردنی ایشوکاری ناحیه‌که تشریف بردوته پنجوین .

جناب صادق بك که له لوای دیوانیه‌وه تحویلا تعیین کراوه به‌مدیر شرطهٔ سلیمانی چوار پنج روژ لوپیش مواصلت ایره و مباشرتی به وظیفه فرموه .

جناب حمزه بك معاون شرطه كه بو معاونيتى شرطه‌ى لواى موصل تحويل كراوه روژى يكشممه بو محل وظيفه كه ى حركتى كرد .

ناظرى دائرهٔ مكوس ومكور كركوك واجزافندى له كل مفتش كمرك مستر طوليجان و دو كتبهٔ كمركدا بو تماشا كردنى ايشـوكارى دائرهٔ كمرك ايره چوار پينج روژ له مو پيش تشريفيان هينابوه ايره و ناظر واجز افندى عودتى فرموه‌وه بو محل وظيفه‌ى .

باشكاتب بلديه جناب شيخ مجيد افندى كه به مأذونيت چوبوه بغدا چند روژى لمو پيش تشريفى هيناوه‌وه .
عرض بخيرهاتن و خوا حافظيان اكين .

---

بو مدير ژيان محترم :

لطفا ام چند كليمه تشكرنامه‌يم بو درج بفرمون .
بنده مـدهٔ دو سـاله نخوشيكم بو زور تاثيرى نكرد . اجباره مراجعتم به دوقتور شاد حمدى بك كرد حقيقتا اوتداويه كه كردمى بو به سبب شـفام واثريكى نخوشيه‌كم نما له‌براوه علنا تشكر ام دوقتوره سازقه اكم .

فخرى

---

تثبيت

باشكاتب محكمه جناب فخرى بك مجاره له‌وزارت عدليه‌وه ماموريته‌كه‌ى تثبيت كراوه . تبريكى اكين .

[§§]

قولكسيون

قولكسيون غزته پيشكوتن ، بانك كوردستان ، روژ كوردستان ، اميد استقلال ، ژيانه‌وه ، ژيان و ديارى كوردستان دفروشريت هر كس طالبه مراجعت به على عرفان افندى بكات .

قيات محصولات صيفى سال ۱۹۲۷ كه له مجلس اداره‌دا تصديق كراوه .

| نوع محصولات | حقهٔ ماليانى | روپيه | انه | پاى |
|---|---|---|---|---|
| هرزن | ۱ | | ۳ | |
| پياز | « | | ٦ | |
| سير | « | ۲ | | |
| پەمو | « | | ۱۰ | |
| خيار | « | | ۲ | ٦ |
| تروزى | « | | ۲ | |
| كالك | « | | ۳ | ٩ |
| شوتى | « | | ۲ | ٦ |
| باميه | « | | ۳ | |
| بادنجان | « | | ۲ | ٦ |
| تماته | « | | ۳ | ٦ |
| لوبيا | « | | ٦ | |
| كوله كه | « | | ۳ | |
| ترى سپى | « | | ٥ | ٦ |
| « رش | « | | ۳ | « |
| هنار | « | | « | |
| هنجير | « | | ٦ | |
| قيسى | « | | ۸ | |
| قوخ | « | | ۹ | |
| ىەى | « | | ٤ | ٦ |
| سيو | « | | ٦ | ٦ |
| بادام | « | ۱ | | |
| هلوژه | « | | ٤ | |
| ترش | « | | ۸ | |
| هرمى | « | | ۷ | |
| كوبجى | « | | ۱۱ | |
| بەھ | « | | ۸ | |
| كنەشام | « | | ٤ | |
| زرات | « | | ۳ | ٦ |
| كودر | « | | ۲ | |
| داش | « | | ۸ | |
| كوش | « | | ۲ | |
| شلم | « | | ۲ | |
| باقله | « | | ۲ | |
| كوز | عدد ـــ ۱۰۰۰ | | ١٤ | |

---

له چاپخانهٔ بلديه چاپ كرا .

# ژیان

بو همو شتیك
مخابرات : بەناوی ادارەخانەوە اکری
§
ادارەخانە : لە بنای بلدیەدایە
عنوان : سلیمانی ژیان
یکی بە انەیکە

کریار
بە شش مانك شە
سالیك شش روپیەدەدا
بو دەرەوە بدل ابونە
حوت روپە و نیوە
لە ٦ مانك کمتر ابونە قید ناکری
اعلانات
بەدیریك ٦ انە دەسینریت
یکی بە انەیکە

همو شتیك انوسی هفتەی جاریك دردەچی غزتەیکی کوردیە

تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦ (سیشمە) ١٨ جمادی الاخر ١٣٤٦ ١٣ کانون اول ١٩٢٧


## آفرەت

— ٢ —

پاشماوەیە

بزانن ادی افرەت ابی بزانی چیە ؟ کچیك بو اوەی لە حیاتدا موفق بیت وبی بکات وکە شوی کرد لەکل میردەکیا خوش رابوبری ومالەکەی بە ریکوپیکی ادارە بکا وکە منالی بو بە ویل و اصول بەخیوی بکات وبیان کات بە انسان ابی نخی عقل ومعرفت بیت کە اویش هر بەمکتب بوەوە ابی . کچیك لە مکتبدا بواصوی ایە ، نخی خویندن ونوسین ، اوەندە کە مجبور نەبی کاغذی میردەکەی ویا کسو کاریکی بە هرضعاجیك ویا ناعرمیك بخوینیتەوە ، نخی حساب فیربی ، فیری پاکی وخاوینی ، دورمان وچیشت لی نانیکی ریکوپیك ، فیری منال بەخیو کردن و ادارۀ مال بی وبتوانی لە دونیادا حیاتیکی خوش وبی نەکرە رابوبری . امانە همو ، امین بن ، بە علم ومعرفت نەبی ناکری .

ایوە هروا ایکی بدەنەوە : افرەتیك لە مالدا کە نەتوانی ادارە بکات ، چیشت ونانیکی بە لذت وپاك نەزانی ، دلی میردەکە وعائلەکە فرحناك وممنون نەکا ، نەزانی منالەکانی تربیە بدا وهرچی ایشیکی مالەکە هیە بکەویتە دەس هەتیو وکارەکر ودمر ودرامی بەوە وناو مالەکەی پرش وبلاو ویپس وپرخل بو بوچی چاکە ؟ اومالە ، اوحوشەیە چە خوش وفرحیکی تیایە ، او صاحب مالە دلی بەچی خوش بی وچون حز بەدانیشتن ورابواردنی ناو مالەکەی بکات ؟؟

خوا بویە آفرەتی خلق کردوە کە وکو پیاو ایش بکات ، بجولینەوە ، فیری عقل ومعرفت وهنر بی ، ادارۀ مال ومنال بکات و الحاصل وەکو مخلوقیکی تواو وکامل بژی وبژی ورابوبری ، بویە آفریدە نەکراوە بی بە آلتی بردستی پیاو بی بە چیشتکر وکسك دەری پیاو بی عقل ومعرفت بمینیتەوە ولذت وخوشی لە دنیا وحیات نەبینی .

افرەتیك بو اوەی بزانی چون اژی وچی اوی لە حیات ابی فیری تربیە وتعلیم بی ، هتا ایستا وازانراوە کە افرەت مطلقا محتاج ولی یەکە ، داماوی کورەیەکە . بلام اگر تا ایستە وایش بو بی لمولا افرەت نابی هر تماشای دەسی پیاو بکات وهرچی پیاو پی بکا قبولی بکا

له کل اوه‌یشدا زور افرت و ژن هیه ولی و که‌وره‌یك بو خو یان پیدا ناکن ، زور کچ که کس‌وکار یان نه‌ماوه و شو یان نه‌کردوه ، زوورژن که میرده کیان نه‌ماوه و بیوه‌ژن ماونه‌وه زور دایك که‌منالی کوری نیه و یا منالی ووردیان هه‌یه ، امانه همو بو اوه له حیاتدا بژین و نانیکی دم‌ی خو یان بخون ابی بخوینن ، فیری معرفت بین ، چونکه اکر ایشـیك نه‌زانن ، عقل و هنریك فیرنه‌بن اخری مجبور ابن یا دمتی مرحمت بکنه‌وه له کولانان یا بچنه مالان کاره‌کری بکن ، امانه حیفه وا رزیل و سفیل بمیننه‌وه ، بی کس و بی صاحب بسورینه‌وه ، لازم‌اکا فیری صنعت و معرفتیك و ایشیك بین خوا هربوشتی بیرو به کوی منالانی دوله‌مندکانی خلق نه‌کردون ! معاونت و مرحمت بم نوعه بدبختانه له‌سر همو مسلمانیك فرضه ، زور افرت هه‌یه که‌لی ایشـی طابو و محکمه‌یان ابی ، سند و خانوانی و استدعایان ابی زور جار هیچی لی‌نازانن و بخه‌ی مو‌ریان پیا این و تسـلیمی پیاویکی ناصباوی اکن بو یان چی بلا چی بکا به خبری خوی ! پشکو او ناصباوه خراپ و دل پیس بو اوسـا مالو یرانی ابی بو او افرته ! زور ژن که میردیان ، زور خوشك که برایان و دایك که اولادیان له دوور ابی و کاغه‌زیان دیت ابیه لای نامحرم و بیکانه‌یك ، لای ملایك و همو رازی درونی خو یان لای اوکسه بیکانه‌یه هه‌ل اریژن اوانیش وه‌کو ملا سیپاره پشیله نو یس بو یان‌رش‌اکنه‌وه و اکاداری همو فکر و اسـراری او افرته ابن ! ! امانه همو‌دردی نه‌خویندنه ، بی‌دقلیه ، اوافرته اکر توزیك خوینده‌وار بی بوچی توشی امانه ابی ! هرچی دینیك هیه ، هرچی قوانینیکی مدنیه هیه همو بو ژن و پیاوماتوه و کراوه ، عقل و فکر وه‌کو به پیاو دراوه دراوشـه به افرت پاوه‌ی که‌وکو انسان له‌دونیادا بژین‌ورا بو یرن .

ماوی‌یه‌تی

[§§]

عشق و خیال

اوقاتی ابی روحم اکا ترك مکانی ،

وه‌ك طیر جنانی ؛

هروه‌ك که‌وه‌رس بوبی له‌دیدار حقیقت ...!

یعنی که له‌ذات !

تسلیم خیالاتی اه‌کا دست عانی ،

قصداً اه‌یه‌وی ده‌رچی له‌دنیا و له خلقت !

او وه‌قته له‌سه‌ر بالی دل اویزی خیالات !

هینده ده‌فرم تا کو ده‌م خاوج عالم ..

ام عالمه معلومه که‌وا پربه له‌ماتم ... !

به‌و نوعه اکم طی مکان ، قطع مسافات ..

اوسا که مجرد له‌همو بند و علائق !

شوریده و شائق .!

اه‌و به‌رزیه بنیادی ابنیم قصر سعادت ،

تمثل لطافت ،

کاشانه‌یك اطرافی که‌ربی له حدائق ..!

ته‌ربی به ازهاری معطرا به نزاکت ،

له‌و کاشنه‌دا خوم و پرستیده‌ٔ حسم ،

تمثال اکه‌ن عشق وزیانیکی معلا ..

عشقیکی مقدس ، منور ، متبسم ،

ژینی نه‌بی وینه‌ی نه‌له دنیا ، نه‌له عقبا !

عشقی که پری خنده وکلبانکی سرور بی ،

عشقی ابدی‌بی له عدم خیلی به دوور بی :.

[ رشید نجیب ]

---

خوزکه

تعجب لو کسانه اکم که ادعای وطنیت اکن وهیچ تماشای اقتصادیات ناکن .

ملت تنها به‌پیاوی عالم ترقی ناکات تاعالمیشی ژن له‌کل نه‌بی .

عبادت کردنی که ئه‌مری پیری‌دا بکری هتر ئیه؛ حققت بو او کسه ناخوم که امریت حقت بو او کسه اخوم که له دیك ابی .

نابی بسـر له قائله‌ی اوه‌دابی که سعد زغلول له کیس چوه بلام ابی له‌قائله‌ی اوه‌دابی که سعدزغلولیکیتر پی‌بکه بئی .

اگر ناشیرن نه‌بوایه مزیبی جوان درنه اکوت .

تینم لو کسانه‌یه که توشی بلایك بون هه‌وی هل اکه‌نه سر قضا وقدر وناین خطای خومان بو .

خوزکه بو کسانه که صد سالی تر له دایك ابی .

اگر ائه‌وی بزنی اخلاق و اجتماعیاتی شاریك له چه درجه‌یکدایه بیانیان برو تماشای محکمه‌کانی بکه بوت معلوم ابی .

کاشـکی حوضه‌کانی مزکوت و مالانیش وکو خزینه‌کانی حمام بکیرانایه و بلوعه‌یان بو بکرایه .

ماویه‌تی

---

دنگو باس :

جلالت ملك عراق

بنا له تلغرافیك که له مقام وزارة داخلیه‌وه هاتوه تعدیل معاهده‌که ی بینی عراق و بریطانیا تواو بوه و جلالت ملك روزی پینجی مانك له لونده‌ره حرکتی فرموه و له‌بازده‌ی مانکا اکاته‌وه بغداد ، و فخامت رئیس الوزرایش له‌کل اوراق معاهده‌که‌دا عودت‌افرمویته‌وه .

مجلس مبعوثان

موافق مادهٔ ۲۳ ی قانون اساسی چونکه لازمه اگر غیبوبتی جلالت ملك له چوار مانك تجاوزی کرد مجلس مبعوثان کو بیته‌وه و له‌و خصوصه‌وه مذاکره و قراریك بدن و جلالت ملکیش چونکه سفره‌که‌ی له چوار مانك تجاوزی کرد ارادهٔ ملکیه صادر بوه که بو مذاکرهٔ ام خصوصه له حوتی مانکا مجلس مبعوثان کو به‌بیته‌وه و اجتماع بکات .

تعیین

اجاره له‌سـر تنسیب وزارة معارف له تیکیشتوانی وطن جناب سید عبدالقادر نوری افندی تعیین فرموواره به معلم اول مکتب دوم سلیمانی ، تبریکی اکین .

---

بناله اعلانیك که بومان هاتووه شرکتیکی اوتومو-بیل به‌ناوی « شرکت نقلیات،س، وغ، هویدی » وه تأسیس کردووه که‌له بینی سوریه ، عراق ، و ایرانا نقلیات اکات .

---

## هاتن و رویشتن

سعادت مفتش اداری که بو تماشاکردنی ایشوکاری ناحیه که تشریفی بردبوه پینجو بن روز پینجشمه عودتی فرموه‌وه .

خواهش وآرزوی اهالی وهابو که چند ذاتیك به‌ناوی ملته‌وه بو عرض خوش آمـدی جلالت ملك معظم فیصل اول بچن بو بغداد که له مراسم اسـتقبالدا حاضربن له‌بر اوه حضرات سیدآغای عبد الرحمن اغا ومحمود افندی رئیس بلدیه‌و عزت بك عثمان پاشا وحاجی ابراهیم اغا روزی ۱۱ مانك تشـریفیان رویشـت بو بغداد .

ممثل غزته‌ی « فتی العرب » محی الدین بك له بغداده‌وه بو چاو پـکوتنی لواکه‌مان تشریفی هینابوه ایره له‌دوای چوار روز عودتی فرموه ، خوای له کل‌بی .

---

اعلان

به‌پی قراریك که به ۸۸۳ ژماره‌و روژ ۲۲-۱۱-۲۷ له مجلس اداره لواوه صادر بوه بو مزایده و احالهٔ اجاره‌ی کان قضای سلیمانی له ۱ کانون اول ۹۲۷ ، تا ۱ شباط ۹۲۸ مدت مزایده‌و له ۱ شباط ۱۹۲۸ وه تا ۱۵ شباط ۱۹۲۸ مدت احاله تعیین و تخصیص کراوه بوامه‌ی همو کس بیزانی‌و له میعاد خویدا بتوانی ضمیات بکا اعلان کرا .

متصرف سلیمانی

لەوزارة داخلیەی عراقەوە :

ژمارە ١٧٥٩٨

روژ ٣ کانون اول ١٩٢٧

بو رئیس بلدیەی بغداد

و همو متصرفان

اوا تحریراتی ژمارە ٦٧٠٤ و روژ ١٦ تشرین ثانی ١٩٢٧ وزارت (ریوز راعت)ە بوایەی تقدیم کردبوبەپی مندرجاتی احکامی ایفای معامله بفرمون ، ثبت خوارەوە کرا .

وزیر داخلیه

صورتی تحریراتە :

موضوع : لەخصوص منع کردنی سەربرینی مەر و بزنی آوس :

معلومتان درارەتی کە اهالی هیچ فرق ناکەن لە سەربرینی مەری اوسدا و اوسیش سەرابرن و الحال امە ابی بە سببی قطع نسلی ام حیوانە اهلیە و ذاتا امە ضرر تولید اکات لەجیاتی او فائدەیە کە بو تکثیری نسلی ام حیوانە مقصودە و ایمە هیچ احتیاج نابینین مقابل بەو فائدە کە مقصودە ام ضررە اختیار بکریت . و چونکە قانون خالیە لەنصیکی قطعی بو منع کردنی سەربرینی مەر و بزنی اوس الا مادەی ٦٢ لەقانونناەمەی بلدیە نەبی کە لە زمانی حکومتی تورکدا بە تاریخ ٢٧ رمضان ١٢٩٤ نشر و تبلیغ کراوە و صریحە بو اوە کە بلدیەکان صاحب صلاحیتن بەوە کە منعی اهالی بکەن لە سەربرینی حیوانی نخوش و ضعیف و اوس کە عمری ( سکە ) ی درمانك تجاوزی نکردبی .

بناء علیه رجا اکەم امر بە همو متصرفەکان کە دارئا امری اداری اصدار بکەن بو منع اهالی لە سەربرینی مەری اوس و تجزیە بکەن بەپی مادە ١٢٦ لە قانوننامەی عقوبات بغدادی اوانەی کە اطاعت بەو امرە نەکن هتا تدابیری لازمە اجرا اکریت بو اتخاذی لایحەیکی قانونی بەپی اصول بو ام جهتە .

---

اعلان

لەلوا سەربرینی مەری آوس ممنوعە هر کس مخالفتی ام امرە بکات بە موجب مادە ( ١٢٦ ) قانون عقوبات بغدادی تجزیە اکری .

متصرف لوای سلیمانی

---

اعتذار

لەغزتە ژمارە [ ٩٣ ] لەصحیفة چوارا لە اعلانیکی مالیەدا کە لە خصوص قیاتی عشری صیفیەوە کرابو سهوا حقة تری رش بە ٣ آنە و هزار کوز بە چواردە آنە نوسرابو صحیحەکەی حقة تری رش بە ٣ آنە و نیوە و هزار کوز بە یك روپیە و چواردە آنەیە بوزانین همو تصحیح و اعلان کرا . ژ

---

لە محکمة صلح سلیمانیەوە :

اعلان

خانویك کە لە محلة جولەکان واقعە و عائدە بە ورثەی داودە کل کە سعید و سیون ناو انن لەبر اوە کە لە طرف مرتهنەوە لە محکمەیدا داوای ازالەی شیوعی کراوە و لەبر اوە کە قابلیتی تقسیمی نەبو اوا خرایە موقعی مزایدەوە اوانەی کە طالبن بە مدەی دە آمینانەوە مراجعت بە محکمة صلح سلیمانی بکەن کیفیت اعلان کرا .

اعلان

لە مطبعة بلدیە دیوانی محوی بە هشت آنە و کتیبی ( کورد لە کیەوە خریکە ) بە چوار آنە افروشرین . ژ

---

لەچاپخانة بلدیەچاپ کرا .

بو هەمو شتێك

مخابرات : بە ناوی ادارەخانەوە اکری

§

ادارەخانە : لە بنای لە بەدایە

مدیران : سلیمانی زیان

یکی بە انەیکە

کریار

بە شش مانك سە

سالیك شش روپیەدەدا

بو دوەوە بدل ابونە

حوت روپە و نیوە

لە ٦ مانك کمتر ابونە قید ناکری

اعلانات

بە یەك ٦ انە دەسیتریت

یکی بە انەیکە

هەمو شتێك انزمی هفتەی جاریك دردەچی غزتەیکی کوردیە

تاریخ انتشار ٢١ كانون ثانی ٩٢٦ (سێشەمە) ٢ رجب ١٣٤٦ ٢٧ كانون اول ١٩٢٧


بەمناسبتی عودتی جلالت ملك خوشەویست وفعال عراقەوە .

معلوم کاتانە کە عائلەی محترمە جلالت ملك معظم خوشەویست عراق . لە قطعۀ حجزدا مدتیك زور لەمو پیشەوە چند کوشش و سعیان فرموە بو نجات و خلاص اقوام ضعیفە وبالخاصە بوملت نجیبهٔ عرب کە لە او تاریکی جهالتا بە واسطۀ پنجۀ استبداد وقهارانۀ مضی اقوام زەوە محکوم مابونەوە . ولە رونـاکی مدنیت وحریت وسربستی محروم بوبون .

زمانیك کە ملت عراق لە حایکی اضطراب وپرە شانا بو بە واسطۀ قدومی جلالت ملك فیصلەوە وبە سبب یکانە تدبیرحکیانەی حایفمان حکومت بریطانیای عظماوە بە مدتیك کم لو هەمو احوالە خراپانە نجاتی بو . روژ بە روژ بوروناکی مدنیت هنکاوی هاویشت بە وتیك کە امرو وکو ملتیکی متمدن وحر وحقی لە رادیکانی زیاتر لە وضعیتیکی باشا ازی . ودیسانەوە بە فکرە عالیەوە پنج شش مانك لەموپیش دیسانەوە بە فکری خدمت ووطن وملتەکیەوە بو بعضی اکمال نواقص وبو تکمیل و تعدیل بعضی موادی معاهدەکەی بینی عراق وحامی ومنتدب ومشفقیا حرکتی فرمو بو اوروپا وبالخاصە بو لوندرە .

چونکە عائلۀ هاشمی جلالتی لە چند عصریك لەموپیشەوە لە اوروپادا ولە لای عموم حکومات متمدنە محترم ناسراوە حرمتیك کە لە هەمو جیکایکدا مقابل بە جلالتی کیراوە . طبیعی هەمو ملت لە جرائد متعددە خوینەویەتەوە احتیاج بە ایضاح ناکات .

لە کل مراجعات لوندرەی دا لەدوای سعی و هولدانیکی زور ولەپاش کلی مناقشە موافق امال متقدمەی جلالت ملك و ملت لە وزارةٔ مستعمرات بریطانیادا بە ارضای طرفین تعدیل معاهدەکە حل وفصل ولە طرف ممثلین طرفینەوە امضا و تصدیق فرمورا لە تأثیر وشرفیکی کورەی بخشی بە سرملت عراق دا .

طبیعی هەمو ابزانین کە جلالت ملك لم خصوصەوە صرف بو منافع و بو دەست کوتنی اسباب پیشکوتنی ملتە کە همت و سعیکی فوق العادەی فرمووە و کس ناتوانی انکاری بکات کە موجودیتی جلالتی لو مقامەدا تأثیریکی

کورۀ کردوە بە سرانديەی سیاسیەدا .

لەدوای تواو بونی معاهدەکە بو هاتنەوە پایتخت خوی عرض خوا حافظی لەلوندرەکردولەو ، مانگدا مواصلت بغدادی فرمووە .

چونکە دائما سعی و همەمات لەنظرملتا درك کراوە و خدمات مشکورەی همو انیك لەپیش چاوی ملتە بە شرفی قدومیەوە او روژە پایتخت عراق و عموم مال دوکان و دوائر رسمیە بە انواع تزیینات و تنویرات رازانرایەوە و روناك کرا و لەکل دابزینی لە طیارەکەدا لە طرف جلالت ملك علی برای ، وزرا ، رئیس مجلس اعیان مبعوثەکان و همو توابەکان و رؤسای دوائر و امرا و ضابطان جیش و وفد لواکان کە مخصوصاً بو اشتراك ام راسمەیە تشریفیان بردبوە بغداد لە محطەی وشاش استقبال فرمورا و لەویوە تا پلاط ملوکانە عساکر جیش افراد شرطە و عموم طبقات اهالی کومل کومل صف بستەی احترام بو بون و راسمەی تعظیمات و بخیرهاتنە وەیان بجی هینا و بە شرفی جلالتیەوە دست بجی ٢١ طوپ اکردرا .

طبعی ایمیش و عموم الویەی کوردستان چونکە لم سعی فوق العادەیەی جلالت ایکەدا حصەدار بین و استفادەی لی اکین ، بە دلیکی صاف بی غشەوە عرض بخیرهاتنەوە و دوعا و تمنای موفقیت و عمر دریژی جلالتی اکین ، هر بژی بو ام ملك و ملتە ، آمین .

---

جژنە پیروزە

روژی ٢٥ ـ ٢٦ مانك روژیك مقدس تصادف عمری تاریخ میلاد و تولدی حضرت عیسی علیه السلام اکات و جژنی ملت نجیبە و محترمە عیسوی بو بە مناسبتی اوە . وەکە امرو ملت ایمیش لەکل ام ملت نجیبە و محترمەدا وەکو برا ازی و اسرار حیات اکات و همو آمال و منافعمان مشترکە ، طبیعی بو ایمیش روژیکی مقدس و جژنیکی مبارکە ، لەبر اوە تبریکی هموملت نجیبۀ عیسوی اکین و امیدمان وایە کە لی‌الابد بە یکەوە همو سالیك تصادف ام روژە بکین و بە تمالی و موافقیت و بە دلیکی خوشەوە پیکەوە رایبوێرین . و جژنە پیروزە لە همو رفیقە خوشەویستەکانمان اکین .

[ ژیان ]

[§§]

اعتذار

چونکە هفتەی پیشو بە واسطۀ بعضی ایشوکاری فوق العادەی حکومتەوە مطبعەکەمان کیرا بو نمانتوانی غزتەکەمان دربینین ، تمنای عفو لە مشتریەکانمان اکین .

ژ

---

## هوالی دەرەوە :

ملك افغان

جلالت ملك افغان امان الله خان بو ارەی سیاحت اوروپا بکات لەکل جلالت ملکەدا روژی ١٥ مانك مواصلتی بومبای کردوە .

---

فخامت سرهاتری دوبس معتمد سامی حکومت عراق لەکل رفیقەی محترمەی لایدی دوبس لەلوندرەوە تشریفیان هیناوەتەوە عراق .

---

سعادة دکتور ( هر تسفیلد ) المانی کە یکیکە لە مستشرقین مشهور و صاحب تالیفات علمیە لە خصوص اثار و عتیقات شرقەوە بە مناسبتی ارەوە کە لە طرف حکومت المانەوە تعیین کراوە بە ممثل سیاسیە بو طهران اجارە مواصلتی بغدادی کردوە و لەویوە حرکت اکات بو مقر وظیفەکەی .

---

بعضی لە عشائر نجدی کە لە ابن السعود عصیانیان کردوە اجارە هجومیان کردوتە سر بعضی عشایر عراق لە

دوری ناصریه و دست بجی له طرف طیارەوە تعقیب کراون و له حدودی عراق دور خراونەتەوە .

غزیو له ایطالیا

روما ــ لەسر معاهدەی مراسه و یوغوسلاویا طلبه کانی مکتب روما ، ناپولی و بعضی شارەکانی کەی ایتالیا دستیان کردوه به غزیو و هجومیان کردوتە سرقونسلوسخانەی فرانسه و یوغوسلاویا .

ریکای هوائی له بینی مشهد و محمرەدا

شرکت طیارە ( جنکرس )له ایران دست کردوه به تجربه بو اوەی کە بالاخره لە بینی مشهد و محمره و طهرانا پوستە بری و له تجربه کەیا موفق بوه .

جمعیت تحدید سلاح

رویتر ــ جمعیت تحدید سلاح اجارە کو بوتەوە مندوب حکومت بولشویک رفیق ( لیتفینوف )اقتراحیکی کردوه و وتویەتی لازمە عمومی قوە تجربه ، هواشیو بریەی همو حکومتیک نەمینی و اتلاف بکری ، فقط غزتەکانی فرانسه و انکلیزله علیهی ام اقتراحه و الین تطبیق امه قابل نیه .

اعدام نامینی

استانبول ــ اژانسەکان انوسن کە حکومت سویت قراری داوه کە ایتر لە داخلی روسیەدا جزای اعدام هلکیری .

ابن السعود اوتومو بیل اکری

غزتەی مورننك پوست انوسی کە ابن السعود له فابریقەیەکی لوندرە بو خو یو عائلەکەی دو سه ــ ٣ اوتومو بیلی فوق العادەی داوه بە دروست کردن و بو ام اوتومو بیلانه دە هزار لیرەی انکلیزی داوه .

حوادثی داخلی :

استعفای دو وزیر

معالی وزیرداخلیه و وکیل رئیس الوزرا رشید عالی بك الکیلانی و معالی وزیرمالیه یس پاشا الهاشمی له ٢٠ مانکا استعفایان کردوه وله طرف جلالت ملیکەوە استعفا کەیان قبول فرمورواه . فقط ارادەی ملوکانه صادر بوه کە جاری موقتا لەبر وظیفەکەیان دوام بکن .

سعادت متصرف غیور روژی دوشمه ١٩ مانك بو تماشا کردنی ایش و کاری قضای کە تشریفی بردوه هلبجه وله دوای دو روژیك عودتی فرموه عرض بخیرهاتنەوه وتمنای موفقیتی اکین .

قائمقام هلبجه جناب حمید بك تشریف هیناوەتە سلیمانی .

سعادت رؤف بك جیبەچی زعیمی جیش محبوب عراق بە مناسبتی اوه کە تعیین فرمورواه بە آمری منطقەی شرقیه پنج شش روژ لەویش تشریفی هیناوەتە سلیمانی عرض بخیرهاتنی اکین .

سعادت مفتش اداری جناب کاپتان لاین بو خاطری جزنی میلاد لە بغداد رابویری لەکل رفیقەی محترمەی مسیس لاینەدا روژی ٢٣ مانك حرکتی فرمو بو بغداد .

لە غزتەی پیشودا له ستونی اخباراتا نوسیبومان کە جناب سید قادر افندی تعیین کراوه بە معلم اول مکتب سهوا نوسرابو موسی الله بە مدیر مکتب دوم تعیین فرمورواه .

بە واسطه فعالیتی لجنه و مامورین تسجیل نفوسەوه عموم معاملەی تسجیلیەی مرکزی سلیمانی خاتمەی پی‌هینرا ولەم روژانەدا بە تسجیل سکنەی نواحیەکانی ملحق لوا هینەکە تشریف ابنه دروه تشکر فعالیتیان اکین .

[ الی رحمة الله ]

لە مشایخ و علمای مشهوری سلیمانی و خوشەویست و محترم ملت ، شیخ صالح افندی قاضی شهوی جمعه مصادف ١٦ مانك بە تأثیری اونخوشیەوە کە اسیرفراش کردبو امری خدای بجی هینا . خدا لی خوش بی بیان تعزیه و تمنای صبری جمیل اکین بو عائلە محترمەکەی .

عودت

حضرات حه‌اغای عبدالرحمان اغا ومحمود افندی رئیس بلدیه وحاجی ابراهیم اغا که به ناوی اهالی لوای سلیمانیه‌وه بو مراسم استقبالیه‌ی جلالت ملك تشریفیان چوبو بو بغداد ایواری ۲٦ مانك عودتیان فرموه . عرض بخیرهاتنه‌وبان اکین .

تکا

رجا له مشتری کانمان اکین باخصوص له‌و انه که حقی ـ۳ـ سالیان لایه وله‌وانه که استعفایان کردووه وپاره‌یان لاماوه بوخاطری بیدنی بعضی معامله نمری مطلوبانه کیان بادیه بفرموێ.

رقم ـ ۱۲۲٦

امه نظامنامه‌یکه اصدار کراوه به ژماره‌ی ۱٦ بو سال ۹۲۷ و عطا کراوه بم نظامنامه‌یه معامله‌یکی مخصوص بو لوای سلیمانی له‌جهت معاملاتی مالیه‌یه‌وه :

له پاش اخذی اطلاع به احکامی فقرهٔ اوله‌یینی مادهٔ ۲٦ له‌قانونسامه‌ی اساسی و کذلك لپاش وقوف به احکام مادهٔ ( ۱۰ ) له ( قانون تسبیتی حصه‌ی حکومتی له‌اراضی زراعیه رقم ٤۲ بو سال ۹۲۷ ) رشته له‌وصلا. حیثی که‌جلالتی ملك فیصل یعنی بخشیوه به پی مادهٔ ۲۳ معدل له‌قانونسامه‌ی اساسی او ( نیابتا ) له جلالتی ۰اکه‌وه امرم به دانانی ام نظامنامه‌یه کرد ٥ له خوار یه‌وه بیان اکریت .

بنا له‌سر اوه‌ی که‌وزیر مالیه عرض کردبی و مجلس وزرایش به موافقیان بینی :

( مادهٔ اول ) معامله‌یکی مالیه‌ی مخصوص له‌کل لوای سلیمانیدا اکریت به‌و نوعه که له مادهٔ دوهمینی ام نظامنامه‌یه‌دا نصاً تصریحی پی کراوه به پی او صلاحیته‌ی که له‌مادهٔ ۱۰ قانونسامه‌ی تسبیتی حصه‌ی حکومتی له‌اراضی زراعیه‌دا بخشراوه نظر به‌وه‌ی که لوای سلیمانی له‌حدودی عراقدا واقعه و بعضی احوالی اداری مخصوصی پی وسته .

( مادهٔ دوهمین ) له واردات شتوی سال ۹۲۷ دا ( یعنی مرمحصولی امساله ) مقابل به‌حصه حکومتی و حصه‌ی مالکانه‌ی حکومتی لازمه له‌صد بیست کم بستینری له‌و نسبتانه‌ی که له‌ماده‌کانی ۳ ، ٤ ، ٦ ، ۷ ، ۸ و ۹ قانون تسبیتی حصه‌ی حکومتی له اراضی زراعیه‌ی سال ۹۲۷ دا بیان کراوه .

( مادهٔ سیه‌مین ) هر تحققاتیك له مو پیش به پی ام تنزیلاته له‌لوای سلیمانیدا بو محصولات زستانه‌ی سال ۹۲۷ کرابی لازمه بطال بکریته‌وه و سرله نوی بم صورته که له مادهٔ دوهمین سره‌وه‌دا نشان دراوه پی‌ویسته تحققاتی تازه بکریته‌وه و هر زیاده‌یك که سندرابی لم نسبته زیاتر واجبه بو صاحبی رد بکریته‌وه .

( مادهٔ چوارمین ) له‌سر وزیر مالیه پی‌ویسته احکامی ام نظامنامه‌یه تنفیذ بکات .

۱۲ تشرین ثانی ۹۲۷ که مصادف بو به ۲۸ جمادی الاول ۳٤٦ ام نظامنامه‌یه له بغداد نوسرا .

علی
نائب ملك عراق

رشید عالی
وزیر داخلیه و وکیل عدلیه

رشید عالی
وکیل رئیس الوزرا و وزیر خارجیه

عبد المحسن
وزیر زراعت و ری

نوری سعید
وزیر دفاع

یس الهاشمی
وزیر مالیه

علوان الیاسری
وزیر اشغال و مواصلات

امین عالی
وزیر اوقاف

اعلان

یانزه پارچه زوی دیم وچوار پارچه زوی براو ویك آش که له دی اسطیل تابع ناحیهٔ قره‌داغ واقعن وبه اعتباری ۳۰۳۲ سهم ۱۱٤۷ سهمی عائد به مدیون شیخ قادر کوری شیخ محمد مفتی به مقابل به قرضی داین میره کوری موشی حجز کراوه له نتیجهٔ مزایدهٔ اولیه‌دا که له غزته‌ی ژیان له تاریخ ۹ تشرین ثانی ۹۲۷ اعلان کراوه به ۱۸۵۰ روپیه له سر طالبی اخیری که داین میرهٔ موشی به احالهٔ موقته‌ی کیشراوه . بناءً علیه اوا له تاریخی ام اعلانه‌وه هتا یانزه روژ تر هر کس طالبه به‌سدی ده تامیناته‌وه مراجعت بدائرهٔ اجرای سلیمانی ومنادی توفیق بکات ، اکینا قراری احاله‌ی قطعیه ادری .

دائره یه ۱

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانیه .

بو همو شتیك

مخابرات : بهناوی ادارهخانهوه اکری

§

ادارهخانه : له بنای بلدیهدایه

مدیر : سلیمانی ژیان

یکی به انهیکه

کریار

بهشش مانك شه

سالیك شش روپیهدهدا

بو درهوه بل ابونه

حوت روپیه و نیوه

٦ مانك کمتر ابونه قید ناکری

اعلانات

بهدیریك ٦ انه دهسیریت

یکی به انهیکه

همو شتیك انوسی هفتهی جاریك دردهچی غزهتهیکی کوردیه

تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦ ( سیشمه ) ٩ رجب ١٣٤٦ ٣ کانون ثانی ١٩٢٨

## آفرهت

پاشماوه :

ـ ٣ ـ

چه پیاویك هیه که چاوی کویرنهبی و زرهیك عقلی پی‌ی‌نهکات که افرهتیش وهکو خوی خوا افریدهی کردوه بوجوتی او ، بو رفیق و خوشهویستی او ! بو عبد و نوکهر و چیشتکری اوی خلق نکردوه و اویش وکو پیاو عقل و چاو و زبان و هوش و شعوری هیه !!

لای ایمه افرهت هر بو یه هاتوته سهر دونیا که له مالهوه دانیشی و چیشت لی‌بنی ، کهنکو کو پاك بکاته‌وه که ایش نهبو غیبت بکا و بنیشست بجوی و تهشی بریسی ، لای ایمه افرهت نابی له مال بیته دهری ، وکو زمانی یونانی قدیم هر بو حمام و سرقبران بیته دهری ! فقط پیاو به هوسی خوی رابویری ، کیف بکا و بژی اگر مراجعت به ( قرآن ) و قوانین و وجدانیش بکهن ابینن که امه ظلمیکی یکجار کورهیه ، غدریکی زور زله پیاو له افرهتی اکات ، چونکه به واسطهی اوهی که افرهت له مالدا حبس اکهن و تنها بو ( چیشت لی نان و نوین داخستن ! ) امینن ، قسمیکی زور له مخلوقاته ، لم ملته محکومی مردن و مستی و ایش نه کردنا کن ، هرچونی

اوهیه که تا امرو له روز هه‌لاتدا ، و تا نیو عصرلویش له روز اوادا افرهت له مالهوه حبس اکرا ، لبرام حبسیه وکو هموضعیفیك ایتر افرهتیش ناچار دهبی‌کرد به فرو فیل له‌کل پیاودا و اونده له فرو فیل ، مکر و نازدا زور زان بو که ناوی افرهت بو به دلیلی مکر و فیل ، امیش بو اوه تیر بون که یکجاری‌خو یان نهدهن به دس پیاوهوه و به تهواوی اسیریان نهبن ، شیت که حبس‌کرا هار ابی لبراوه افرهت لم فیل و مکرانهدا معذوره ، که پیاو حبسیان بکهن امانیش مجبور بون وایکهن ، امهیش دیسان هر عیب و تصوریکی زله بو پیاو ، ظلمیکی کورهیه درحق به افرهت .

### ازدواج

له قرآنی کورهدا له لاین ازدواجهوه نصوص و آیات زور جوانی تیایه ، وکو افرموی ( ان خلق لکم انفسکم ازواجا لتسکنوا الیها وجعل بینکم مودة ورحمة ) که لم آیتهدا به تواوی دیاره که آفرهت بو عبدایتی نا ، بو اوهی ببی‌به رفیق وخوشهویستی پیاو خلق کراوه ، کجی اگر انسان بروانیته معاملهی پیاوی ایستا درحق به آفرهت و ام آیته کورهیه بخوینیتهوه له

معامله وبی وجدانی پیاو هروا متأثر وشرمزار ابی چونکه لای ایمه وا زانراوه که افرەت هر بو دفی لذتی پیاو ، و ایشکردن وچیشت لی‌نان هاتوته سر دونیا ، موافق او آیته مبارکه رابطه‌یك که به محبت ولطف وجودیدیر ابیت له بینی ژن ومیردا بەواسطه‌ی هذی له ملا جاهله‌کانه‌وه هاتوته سر اوه‌ی افرەت بی به آلتی بردستی پیاو وبوچشته هرچی خراب بی درحق به افرەت روا ابیتری .

ماوتی

—[ ]—

طلب عفو

له غزته‌ی ژماره ۸۷ و ۲۵ تشرین اول ۹۲۷ دا به مناسبتی کوبونه‌وه‌ی مجلس مبعوثانه‌وه له خصوص ذاته محترمه‌کانمانه‌وه مقاله‌یکمان نوسیبو ، وکو زانیومانه ام مقاله‌یه بوه به‌سبب اکثری قسمیك له‌مندوبه‌کانمان .

ایمه همو وتمان ام ذاتانه ، مقدس وه دتا چونکه وکیلمانن به کوره خومان و به محترم و عالی همو قومه‌کان اوانین .

معلوم همو شخصیکه امرو ملت کورد له همو قومیك بالخصوص له دراوسیه‌کانمان زیاتر دوا کوتره و امروش عصر ترقی و هولدان و پیشکوتنه ، ماتیکی دوا کوتر طبیعی نازی و اگر هروا بی نیته‌وه حق ژیان وحتی نان خواردنی نابی و به بشر ناناسری ، له‌بر اوه ایمەش مجبور بوین بو خاطری تلافی مافات بکین و هر بهم نوعه تمینی‌نه‌وه وکیله محترمه‌کانمان تشویق بکاین که له خلقی که زیاتر سعی‌مان بو بفرمون ، که خیراتر بو ساحه‌ی مدنیت هنگاو بهاوین .

ایمه قدر ابکاری سعی و فداکاری ام ذاتانه اکین و مندوب و وزیریکی وکو معالی امین زکی بك که علم و عرفان و فضیلتی امرو فوق همو کسیکه و به‌امید خدمت وطن وملته‌که‌ی له دیاریکی دوره‌وه طی مسافه‌ی کرد له حالیکی وا ایمه‌دا که ملت زور لزومی به ذات وشخصی وا فعال بو تشریفی هیناوه ، وله‌وه ایشه‌وه همو آنیك به‌همو قوتیه‌وه بو ترقی و پیکهینانی همو مالزمه‌یك و نقصانیه‌تی ملته‌که هول وتقلای دا . و امرو که همو ای بینین زور نقصانیکی بو اکمال کردین . که دائما له پیش چاوی ملته وله فکر ناچیته‌وه عجبا چون ابی له‌علیهی بوین . حاشا ایمه قدرجسارتی وا ناکین ذات عالی وشخصی وامقدس دائما تقدیر وتقدیس و الی الابد تمنای موفقیت وتشکری خدمات مشکوره‌ی اکین استرحام اکین که به نظریکی خراب تماشای مه له‌که نفرمون چونکه له‌غیر اوه که زیاتر بو هولدان اکمال نقصانیکی ملته‌که تشویقیان بکین هیچی تر نالین وهیچ حقیکمان نیه بیلین وداکما تمنای موفقیتیان اکین . هر بژین .

---

تشکرات ملی مقابل به انسانیت و معارفپروری

به کمال سروزه‌وه بیستمان که امسال دو طلبه‌ی کورد وخلقی کویه که له صنف ششمین کویه تشتیان کردوه بو اکمال تحصیل بواره‌ی له صنف یکمی ثانویدا قید بکرین و بخوینن چونه‌ته هولیر ، هر چند قید بون فقط چونکه طلبه‌کان منسوبی عائله یه‌کی دوله‌مند نبون اداره‌ی ژیانیان له هولیر ممکن نه‌ابو به نوعیك که خریك بون وازله تحصیل بهینن ، حضرت عالی معارفپروری منلا افندی که ناوبانکی سماحت و سخاوتی و معارفتی معلوم همو عالمه ، له‌کل بیستنی ام مسئله‌یه‌دا طلبه‌کان بانك اکات و تعهدی همو نوعه اداره‌یك به رفاهیت و تامین وهمو مالزمه‌یکی تدریسیه‌یان افرموی ، طلبه‌کان صدقات له جاران زیاتر به حسیاتیکی جدیه‌وه بو خویندن و تحصیل امیدیان اداتی و تسریریان افرموی .

هرچنده له موبیش اکرام ، سخا و همات حضرت عالی منلا افندی له طرف هموشخصیکه‌وه تقدیر کراوه

فقط ام انماەی چونکە ابی بە سەبب پیشکوتن و پیکیشتنی و طایەی کورد و بو استقبال ام ملتە دوکنج عالی و ئمال پ راکەبنی - ایمیش بەناوی همو ملتی کوردە وە تشکری لطفی ام ذاتە و کورە محترمەمان اکین و تمنای موفقیت و سعادتی اکین هەربژی ٠

-[ ]-

### کوردستان شمالی و ادارهٔ مخصوصه

لە جرائد پوستەی اخیردا وا دەر اکەوی کە حکومت تورکیا سیاست خوی لە خصوص ادارەی کوردستانی درەوە قسماً کو بی ٠

وەك ( مجلەی شرق ادنی ) انوسی حکومت تورکیا ولایت معمورة العزیز ، اورفە ، بتلیس ، حکاری ، دیار بکر ، سعرد ، ماردین و وانی کردوە بە ( مفتشیتیکی عامە ) و مفتشیکی عام کە لە پایەی ( نائب الحکومە ) دایە ادارەی ام منطقەیە اکات ، مفتش مذکور هیئتیکی استشاریەشی ابی کە عبارتە لە معاون مفتش و مستشار عدلی ، مستشار مالی ، مستشار عسکری ، مستشار اقتصادی ، مستشار معارف و مستشار صحی ، چکە لەمانەش مدیریتیکی عمومی استخباراتیشی ابی ٠

دیسان بە پی نوسینی مجلهٔ مذکورە ام مفتشە عامە صلاحیتیکی فوق العادەی هیە ٠

١ ــ مفتش عام عند الحاجە همو قوە ژاندارمە و عسکری منطقەی خوی اتوانی استعمال بکات ٠

٢ ــ مفتش عام صلاحیتی نظارت امنیت و اسایش ەی هیە ٠

٣ ــ مفتش عام اتوانی تطبیق همو نوعە مشروعیك بکا کە پیویست بی بو ترقی اقتصادی ، صحی ، اجتماعی عصری و مدنی و ابی ادارەیکی مکمل و منتظم دابمزرینی و نظارت انتظام و ترتیب ام ادارەیە بکات ٠

٤ ــ مفتش عام حریت شخصی اهالی لو منطقەیە تأمین و محافظەی احوالیان اکات ٠

لە باقی موادی ام احوال ادارەیە وا دەر اکەوی کە حکومت تورکیا سیاست جبر و شدت تخفیف کردە بیتەوە ولە حیاتی احوالیکی ملایم و موافق روح ملت تنظیم بکات .. لە سەر ایە لازمە دوعا بکەین اگر تورکیا بە سوء قصد کردبیتی خوا بو برا کوردەکانمان بی کیری بە حسن قصد ٠

---

### هەوالی دەرەوە :

#### زیپلینیکی ٨٠ کسی

رویتر ــ المانەکان زیپلینیکی تازە ریان دروست کردوە کە هەرە گەورەترین زیپلینی دنیایە ٣٧٥٠٠٠٠ قدم مکعبیتی و ٨٠ شخص هل اگری غیری امەیش دائماً ٢٦ کس مرتباتی خوی تیاداپە ٠

---

#### انتخابات بلدیهٔ لوندرە

لوندرە ــ لە انتخابات بلدیەدا پارطی عملە موفق بون لە پارطی عملەدا ١١١ اعضا لە محافظ کار ١٠ و لیبەرالا ١٣ و لە پارطی مستقلەکانا ١٧ شخص بون بە اعضا ٠

---

#### گویا لە امریقادا مسکرات منع کراوە

بنا لە استتیستیك کە لە طرف مامورین عائدەیەوە کراوە سال پار لە امریقادا چل و پنج ملیون لیترە مسکرات استعمال و صرف کراوە ٠

---

#### هدی خانم شعراوی

امستردام ــ هدی خانم شعراوی مؤتمر مصر لە جمعیت اسباب دوزینەوە بو منعی حرب دا لو اقتراحیا کە داویەتی و توبەتی لازمە عموم دولەتەکان امتیازات اجنبیە لغو بکەنەوە چونکە زور ابی بە واسطەی محاربە لە دوای مناقشەیکی زور اقتراحەکەی بە اکثریت قبول کراوە ٠

## فلسطین قرض اکات

رویتر ــ لەخصوص او ٤٤٧٥٠٠٠ لیرهٔ انکلیزی کە بە فائض صەدی پنج حکومت فلسطین قرض اکات مخابره تواو بوه وحکومت فلسطین قراری داوه .

---

## هاتن و رویشتن

سعادت متصرف اکرمی روژی جمه مصادف ٣٠ مانك بوتفتیش و ماشاکردنی وضعیتی ناحیەکە لەکل مدیر محترم پولیسدا تشریفیان برده مرکز ناحیهٔ ماربان و ایواری او روژه تشریفیان هینایەوه خدا موفقیان کا .

سعادة مفتش اداری و رفیقەی محترمەی مسیس لاین کە بو وابواردنی جژن بینیك لەو پیش تشریفیان چو بوه بغداد ایواری روژی دوشمەی مصادف دوی مانك تشریفیان هینایەوه ؛ عرض بخیر هاتنەوه و تمنای موفقیتیان اکین .

قائمقام قضای شاربازیر جناب رضا بك بو ایشو کاری حکومتی دو سه ـــ ٣ روژ لەو پیش تشریفی هینا. وەته سلیمانی عرض بخیر هاتنەوەی اکین .

جناب عزت بك عثمان پاشا کە بو واسطەی استقبال جلالت ملك بەناوی سلیمانیەوه لەکل وفده کەدا تشریفی بردبوه بغداد روژی جمعه ٣٠ مانك تشریفی هینایەوه بخیر بیتەوه .

جناب اربستاکیس افندی ضابط بیطری کرکوك تحویل کراوه بە ضابط بیطری املوایە . چوار پینج روژ لەمو پیش تشریف هیناوه بخیر بیت .

---

برائت

جناب سعید افندی مامور کرك هلبجه کەمدتیك لەمو پیش دەستی لەایش کیشرابوەوه اجاره لە نتیجەی محکمەدا عدم مجرمیتی تبین و برائتی کرد , تبریکی موی الیه و تشکر عدالت محکمه اکین .

---

تعمیم
بو مدیر پولیس سلیمانی
بو قائمقام قضاکان
« مدیران نواحی

به امر وزارت داخلیه بو سال ١٩٢٨ رسم پاسی او سلاحانه کەسال ١٩٢٧ مسجل بون و امسال پاسی تازەیان بو ور اکیری عبارته لە یك روپیه و رسمی پاسی او سلاحانه کەلەسال ١٩٢٧ دا مسجل نەبون و لەسال ١٩٢٨ دا ور اکیری عبارته لەدو روپیه .

مدت ورکرتنی پاس سلاح بو سال تازه عبارته له مانکی کانون ثانی شباط و مارت ولەپاش نهایتی مارت هر سلاحیکی بی پاس بکیری بە موجب قوانین موضوعه مصادره و صاحبی تجزیه اکری .

متصرف سلیمانی

---

اعلان

بەپی تحریرات زماره ١٣٣٢ روز ١٤ ـ ١٢ ـ ٩٢٧ قائمقام هلبجه لەمجلس ادارهٔ قضادا بو انهاره کاری املاك امیریهٔ قضای هلبجه لە ١٥ کانون اول ١٩٢٧ وه تا نهایتی مانك کانون ثانی ١٩٢٨ مزایده ولە ١ شباط ١٩٢٨ وه تا ١٥ شباط ١٩٢٨ مدت احاله تەمن تخصیص کراوه پی ویسته ام مدتانه نشر و اعلان کرا .

متصرف لوای سلیمانی

---

اعلان

اوانە کە پارەیەکی زوری آبونە تیان کان قرضدارن چونکە لەسر ماوەی طلبه کە لیان کرا . مطلوبانه کیان تسلیم نەکرد . مجبور بوین لە اعتبار ام نسخەیەوه بە ترقینی قیدیان وطیبی بوسەندنی پارەکیش لە علیهیان اقامهٔ دعوا اکری . لازم بو عرضیان بکین .

[ ژیان ]

---

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانیه .

سال ـ ۲ ژماره ـ ۹۷ ( ژیان ) دوره ـ ۱


بو همو شتیك

مخابرات : به ناوی اداره‌خانه‌وه اکری

§

اداره‌خانه : له بنای لد یادایه

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی به انه‌یکه

مکرباو

ده شش مانك سه

مانك شش ره‌پیه‌ده‌دا

بو دره‌وه بلك ابونه

حوت روپه و نیوه

٦ مانك کمتر ابونه قبد ناکری

اعلانات

یك ٦ انه‌ده‌سیریت

یکی به انه‌یکه

همو شتیك انوسی هفته‌ی جاریك درده‌چی غزته‌یکی کوردیه

تاریخ انتشار ۲۱ کانون ثانی ۹۲٦ ( سیشمه ) ۱٦ رجب ۱۳٤٦ ۱۰ کانون‌ثانی ۱۹۲۸


به مناسبتی تأسیس و مواصلاتی تلغرافه‌وه :

معلوم همو عالمه که تلغراف ، تله‌فون و تلسز تلغراف واسطه‌یه‌کی فوق العاده و سریعترینی مخابره‌ن و سبب مربوطیه‌تی عموم بلاد دنیایه به یکتری و بو معاملات تجاریه و حکومت و همو مسائلیك واسطه‌یکی باش و سریعترن ، شاریك که لم واسطه‌یه محروم بی قطعیا تجارتی ترقی ناکات و معاملات حکومتی تأخیر وابی به‌سبب ضرر و زیانی مله‌کی و عدم ترقی شاره‌که ، حاصلی تلغراف التیکی وایه که قسه و گفتگو و معاملات دو شخص به مده‌تیکی کم حتی له‌ایکا به یك اگه‌ینی و پیك اهینی .

مده‌تیکی زوره به واسطه‌ی انقلاب و بعضی حرکات‌ه‌وه ام لوایه لم واسطه‌یه محروم مابو و بم سببه‌وه صکته‌یکی زور کوره له تجارت و له معاملات اهالی و حکومتی کوتبو .

تجاریك بو مسئله‌یکی مهم اقتصادی به هفته‌یك و بعضا له‌زستانا اوهسا ایتوانی له شاریکی نزیکی وکو بغدادا شریکه‌که‌ی و یا وکیله‌که‌ی به مانکیك حالی بکات و مقصده‌که‌ی تی بکه‌ینی .

بیتیك له مو پیش چونکه له لواکه‌مانا له اداره‌دا

تبدلاتیك بو به واسطه‌ی تدابیر حکیمانه‌ی حلیفه‌مان و یکانه به‌سبب قدوم متصرف غیور و فعالمانه‌وه له‌کل مواصلتی بو سر وظیفه و که زمام اداره‌ی حکومته‌که‌ی به دسته‌وه کرت به‌مده‌تیکی کم لم همو انقلابه ملته‌که نجات درا ظلم و تعدیك که‌له سرمان بو رفع کرا و ملت کوته حال استراحته‌وه .

دیسان وه عامل وفا داله مشغله‌کانیان باخصوص معالی امین زکی بك که صرف آمال وه‌سعی خدمت ملت و دوزینه‌وی اسباب ترقیه بو وطنه‌که‌ی .

بو اکمال ام نقصانیته که هران بو ـ یعنی واسطه‌ی مخابره که تلغرافه له‌لواکه‌مانا موجود نه‌بو . له حالیکا که وزارة ـ د ... اشغال ومواصلات اشغال کرد بو درك ام نقصانیت مانه‌ی کرد . ویو تمدید ام خطه به‌همو نوعیك له‌کل حکومت به انواع تشبثات امری اصدار وه‌بلغیکی له بودجه‌دا بو تخصیص فرمو وبه مده‌تیکی کم ام خطه‌ی به نوعیکی فوق العاده سه هزار قات له جاران چاکتر تمدید وکیانیه سلیمانی .

بم‌سببه‌وه او مالعه‌یه و او نقصانیته‌ی که لواکه‌مان هیبو اویش اکمال کرا . وطبیعی له‌مودواچونکی ملت

واسطه‌یه‌کی تجارهٔ فوق العاده‌ی وسریعتری بواحضار ودرست کرا طبیعی روژ به روژ تجارت وهمو معامله‌ئان پیش اکه‌وی وترقی اکات .

له‌بر اوه ایمه به دل وبه گیان تشکرات ام زاته مشفقانه‌مان اکین ودعا تمنای موفقیتیان اکین .

و امیدمان وایه به واسطه‌ی تمادی سعی فوق العاده‌یانه‌وه به‌مده‌تیکی کم ام خطه به مراکز قضاکانیشمان ربط بکری .

---

پاشماوه :

— ٤ —

آفرت

ازدواج

به همو مذهبی ، به همو قورآن و احادیث دواکه‌ویت که لازم اکات له وختی ازدواجدا ده‌سگیرانه‌کان یکتری ببینن . بعضی‌شتی زور جزئی وهیچ هیه که زوو اهمیتی ادینی ربلام اوی که پیویسته بیکه‌ن به هیچ ناهیلین ! چونکه جاهل ونادان ، کر وبی‌عقل هر شتی خراپ وبی‌معنا اکن .

توخوا بابوتان وصف وتعریف بکم که لای ایمه ژن هینان چونه . نا ، استغفرالله ژن هینان نا ژن کرین چونه . چونکه ایره کیچ وکو نروزی وخیار الفروشی نادری به شو ، بلام باسی ژن هینانی‌لای‌عشائر ودیهاتی ناالیم . چونکه شو کردن اوان ، موافقی عقل و وصرف وعادت سیایان به یکتری اکه‌ویت ، هر له‌منداڵیه‌وه له‌کل یکدا هل اسن ودا انیشن و ایش وفرمان اکن . ماریه‌تی

---

### هوالی دره‌وه :

ملك افغان

جلالت ملك افغان امان‌الله خان له‌کل ملکه‌دا موا صلتی مصریان فرمووه وله‌طرف ملك فؤاد ، هیئت وزارهٔ مصر ، وعموم سفراکان چنیه‌وه به صورتیکی محتشم استقبال فرموراون ولای جلالت ملك مصر میوانن .

---

نشان

رویتر — جلالت ملك فؤادی مصر له‌قاهره‌دا به مناسبتی زیارتی ملك افغانه‌وه نشانیکی اهدا فرمووه به ملك افغان .

---

له‌قیصری معدن خلوز وآسن

دوزراوه‌ته‌وه

دوغرو یول — له تورکیا له شاری قیصری دا معدنیکی کورهٔ خلوز و اسن دوزراوه‌ته‌وه ، بنا له‌افادهٔ مهندسه‌که‌ی الی له‌اول حفریاتا قابله‌که ده ملیون طون اسنی لی بهینریته دری .

---

( سفیری تورکیا له‌امریقا )

مختار بك که له‌طرف تورکیاوه به‌سفیر امریقا تعیین کراوه ، له‌کل مواصلتی نیورق ، له همو لایکه‌وه غیر رسمی له‌طرف اهالی‌یه‌وه ، کومل ، کومل تظاهر کراوه ، حتی له‌و اثنایه‌دا موسیو ژه‌راری امریقایی که‌له پیشا سفیری امریقا ابی له برلین نطقیك ادا الی ام مختار بکه له سالی ١٩٢٠ دا بوه به سببی قتل بوی — ٣٠ هزار ارمنی و دیسانه‌وه الی هر به واسطه‌ی تشبثات ام شخصه‌وه حکومت بولشویك هجومی کرده سر ارمنستان و اشغالی کرد ، له‌برامبری امذاته ابر دا زور عسب و عار تشکیل اکات بو حکومت امریقا که همو امالی خذمت کردنی بشره .

اوذاتانیش که معاهدهٔ لوزانیان به اکثریت قبول نکرد . له‌مجلس مبعوثان امریقادا دیسانه‌وه زور له‌عامی هاتنی ام سفیرون ، وله‌برامبه حکومت امریقا مجبور

بوه که به رابطه‌ی پولیسه‌وه محافظه‌ی ام مقبره بکات
و بەم نزیکانه ام مسئله یه له مجلس شیوخی امریقادا
موضوع بحث ابی .

تونیلیکی کوره

له امریقادا له بینی شاری نیورق و نیوژرسه‌ی‌دا
تونیلیکی کوره حفر کراوه که هره کوره‌ترینی تونیله کانی
دنیایه و بو درست کردنی ( ۱۲۱ ) ملیون فرانق صرف
کراوه .

استاسیونیکی قوة هوائیه

له لوندره استاسیونیکی عجیب معظم بو قوة هوائیه
درست کراوه و دو صد و پنجا هزار لیره‌ی انکلیزی تیا
صرف کراوه .

سرما

لندن ــ له استانبولدا بفریکی زور باریوه و قورطنه
یکی سرمای کوره روی داوه و خساره‌یه‌کی زوری مادی
داوه .

المانه‌کان حمایه‌ی چین جنوبی اکن

حکومت بولشویك له المانیا طلبی کردوه که حمایه
مصالح چین جنوبی بکات و اویش قبولی کردوه ، و
امیش بین الدول بوه به مسئله یکی سیاسی ، چونکه
هیشتا هیچ حکومتیك اعترافی نکردوه بەم حکومته .

خبری نجد

لو خبرانه‌ی که له نجده‌وه هاتوه بیانی اکات که
جلالت ملك ابن السعود عموم اهالی ، رؤسای عشیرت
علما ، اشراف حجاز و نجدی دعوت کردود بو اوه‌ی که
له ایستاره بیعت بکن به کوره کوره که‌ی که بەولی عهد
قبولی بکن و له‌دوای خوی بیکن به ملك حجاز و نجد .

یونان قرض اکات

لم روزانه‌دا وزیر مالیهٔ یونان اچیته لوندره
بو قرض کردنی او شش ملیون لیره‌یهٔ که له انکلیز و
امریقا ایکات و بو ام قرضه‌یش جمعیت عصبة الامم
موافقت کردووه.

معاونت عمله بی ایشه‌کانی فلسطین

لندن ـ (سیر الفرد موند) له لوندره‌دا سعی اکات
که مبلغیکی زور پاره کوبکاته‌وه بو او عملانه که له فلسطینا
بی ایشن و هتا ایستا مقداریکی زور پاره‌یان بوناردون
وخوی بالذات هزار لیره و صاحب فابریقهٔ (جکره‌کا-
براسی) پشینج هزار لیره‌ی تبرع کردووه

تکا

له‌موظفین دائره‌ی مطبعه طیب افندی بو کوکردن
نه‌وی بدلات آبونه‌ی ژیان نیرا بو لوای کرکوك ،
هولیر ، قضای چمچمال تکا له مشترکه‌کان اکین بدلات
ته‌که‌ی به تواوی تسلیم و معاونت لازمه له حق اجرا
بفرمون.

[§§]

هوالی داخلی :

تحویل

اجازه له‌سر تنسیب صعادة متصرف اکری مدیر
ناحیه‌ی سرجنار جناب محمد فؤاد بك بو مدیریت ناحیه
قره‌طاغ و حسین فوزی افندی مدیر ناحیه‌ی قره‌طاغ
بو مدیریت ناحیه‌ی سرجنار تحویل کراون .

تثبیت

جناب سعید ادیب افندی وکیل مدیر مال ماویه
بو سر وظیفه که‌ی به اصالت تثبیت و جناب رفیق
واردات نوری بك فتاح بك بو مدیریت مال قضای
شار بازیر تعیین کراون و جناب محمد بك مدیر مال قضای
شار بازیر موقتاً تا نتیجه‌ی محاکمه‌ی دستی له ایش کیشرا-
وه‌ته‌وه ، تبریك و تمنای موفقیتیان اکین .

سعادت متصرف خوشه‌ویست روژی ـ ۹ ـ مانك به مأذونیت پازده روژ تشریفی بردەوه هولیر. خوا حافظی بی.

---

مستعجل

لەوزارة داخلیەی عراقەوه :

ژماره — ۱۸۶۰۳

روژ — ۲۱ کانون اول ۱۹۲۷

بو هەمو متصرفان

ام وزارته معلوماتی حاصل کردوه ( قونسلوسی ) حکومتی تورکیا که له عراقدایه تذکرەی جنسیت و تابعیتی حکومتی تورکیای اصدار کردوه و داویه به بعضی اشخاص که ایستا که حق اوەیان نەماوه که اختیاری جنسیت و تابعیتی مذکور بکەن چونکه او مدەیەی که بو ام جهته دانراوه و پیوستە لو مدەیەدا بیان و طلبی او جنسیته بکری تواو بوه و چونکه ام معاملەیه مخالف به نصوص و صراحتی معاهدەی لوزانه و کذلك مخالف به قانوننامەی جنسیت عراقیه به واجب بیزرا که بیاننامه یکی رسمی به مطبوعاتی محلی لم خصوصەوه نشر و اعلان بکریت بو توضیح کردنی ام معاملەیه اوا لەکل ام تحریرا تەدا صورتیکی او بیاننامەیه که به مطبوعاتی ایرانه اعلان کراوه بو ایوەشمان نارد که جنابیشتان بو اوانەی که لازمه تبلیغیان بکریت تعمیمی بفرمون .

و زیر داخلیه

---

اعلان

کیشتوه به حکومت که بعضی اشخاص که حال حاضر به پی ماده ۳۰ له معاهدەی لوزان و ماده ۳ له قانون جنسیتی عراق اکتسابی جنسیتی حکومتی عراقیان کردوه اشتباه و سوء تفاهمیان هیه له فهم کردنی معنای اختیار جنسیت کردندا .

بناء علیه لازمه معلوم همو کسیك بی او مدەیه که وضع کراوه بو اوەی که لو مدەیەدا جائز اختیار کردنی اختیار جنسیت و تابعیت اجنبی تیا کردن تواو بوه به پی احکام ماده ۳۱ له معاهدەنامەی لوزان و به پی ماده چوار له قانوننامەی جنسیت عراقی سال ۱۹۲٤ که معدله به مرسوم قانون جنسیتی عراقی سال ۱۹۲۷ و کذلك به پی نصوص مادەی چوارەمین له معاهدەنامەی حکومت انقره .

بناء علیه رعیتی عراق که لو تاریخه به دواوه اختیار جنسیتی اجنبی بکەن به بطال ازمیرری مکر ئەو صورتانه واقع بو بی به پی قانوننامەی جنسیتی عراقی و نظامنامه کانی متعلق بەو قانوننامەیه که له تاریخ ۱۷ تموز ۹۲۷ و پیش تاریخ ۹۲۷ دا اصدار کراون .

او اشخاصانەی که له تاریخ ۱۷ تموز ۹۲۷ و یا له پیش او تاریخەوه به پی نصوص او مادانه که لەسرەوه اشاره‌تیان کرا ، اختیار جنسیت و تبعیت حکومتیان کردبی هتا مدەی اوه که عراق بجی اهیلن و لی اروِن هر به تبعەی حکومت عراق ازمیررین و پیوسته لەسریان لە پاش قبول کردنی او حکومته که اختیاری تابعیتی کردوه به وعدهٔ سالیك اکالی معاملەی خوی بکات و عراق بجی بهیلیت .

---

اعلان

بو کاروان و اوتوموبیل و آرابه و انسان هاتوچو کردن به جیکای طیارەدا که له غرب شاری سلیمانی و له قلعه ممنوعه و کاروان و صاحب بار نابی نه به شو و نه به روژ باری لی بخات . هر کسی خلاف ام اعلانه معامله بکات به موجب ماده (۱۲٦) قانون عقوبات بغدادی مجازات اکری .

متصرف سلیمانی

---

اعلان

بو خستەخانهٔ ملکی سلیمانی مانکی به چل ـ ٤٠ ـ روپیه متمدیك پیویسته ابی خوندەوار بی و کەمیکیش اکلیزی شارزا بی و عمری له سی ـ ۳۰ ـ سال زیاتر نەبی اوی طالبه مراجعت به خستەخانه بکات .

---

اعلان

ایستا خطی تازەی تلغراف و تلفون تواو بوه و حاضره بو استعمال .

ئەکرێ له مرکز تلفونەوه که له دائرهٔ پوستەدایه به هر پنج دقیقەیك لەکل چمچمال دا به روپیەیك و لەکل کرکوکدا به دو روپیه به تلفون قصه بکریت .

تلغراف ایستا به اکلیزی و به لسانی عربی زور زو اروات . بو داخلی عراق کلمەی بەدو آنه یه و له روپیەیك کمتر تلغراف نییه .

ادارەی تلغراف و تلفون سلیمانی

---

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانیه .

# ژیان

غزنه‌ی

بو همو شتیك

مخابرات : به ناوی اداره خانه‌وه اکری

§

اداره‌خانه : له بناى لد به‌دایه

مدیر : سلیمانی ژیان

یکی به آنه‌یکه

کرێو

به شش مانك مله

سالیك شش روپیه‌ده‌دا

بو دره‌وه ئلل ابونه حوت روپه و نیوه

٦ مانك کمتر ابونه قید ناکری

اعلانات

دیریك ٦ آنه‌ده‌میتریت

یکی به آنه‌یکه

همو شتیك انوسی هفته‌ی جاریك دره‌چی غزنه‌یکی کوردیه

تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦ ( سیشه‌مه ) ٢٣ رجب ١٣٤٦ ١٧ کانون‌ثانی ١٩٢٨


## اهتمام له خصوص فلاحته‌وه

همو ابزانین که لوای سلیمانی پنج شش ساله له انقلاب و له‌ناو تنها که‌یه‌کی عظیمابو و به‌و واسطه‌یه‌وه اهالیکه‌ی ، زراع و فلاحه‌کانی متفرق و هر یکه بو جیکایه‌کی تر له تاو بی اداره‌یی و ناامینی دور کوتبونه‌وه و قسمیکیان محو بونه‌وه ، غیری امیش هر چند ایستا امنیت و اسایش اعاده بوته‌وه فقط اهالیکه‌ی هیشتا هر له سفالتایه ، عموم دیهاته‌کان چول‌تاك و توك مالیان تیا ماوه ، غیری امیش شاره‌زور ، سرچنار ، تانجرو ، عموم قضای هلبجه ، بازیان که منبعی فلاحت و زراعتی ام لوایه‌ن و به تواوی عموم دغل و دان و خوارده‌منی لم منطقانه ور اگرین ، اوانیش به واسطه‌ی ام انقلا. به‌وه و به سببی کولله ، سن ، مشك و ام نوعه حشرا. تانه‌وه ام چند ساله غیری امه محصولیکیان نابی خویشیان مجبور اببن به پارهٔ اشیای ناومال و حیواناتیك که ایفروشن له خارجه‌وه ذخیره تدارك و بم نوعه قوتیکی لا یموت تامین اکن ، یکانه غدایان که ماوربو او یشیان وون کرد همو ابزانین که پار و پیرار به نسبت سالانه‌وه جزئیك و امسالیش هاوتا امنکه کم که به هیچ ازمیرری تورییان کردوه به زوری‌یه‌وه ، شاید امسالیش وکو سالان ام حشراته و یا افاتی تر عوری بکاته‌وه به صورتیکی طبیعی لوای و فلاحه‌کان محکوم مردن و سفالت ابن .

جاران که حکومت فخیمه تازه تشریفی هینابوه ام لوایه به واسطه‌ی دانی قرضه‌ی زراعته‌وه ام اهالیه تواو بوژابونه‌وه .

ملم و قرض و قوله‌ی خارج که فضیکی فاحشیان وراگرت نمابو ، فلاحیك اگر سالیك بوی نهاتایه به واسطه‌ی ام قرضه‌وه که له حکومتی اگرد جبری مافاتی اگرد ، ناشکری نبی او یش نما .

هرچند ام قرضه‌یه له لواکانی تری عراقیشدا نه‌ماوه فقط له همو شاریکا شعبه‌یه‌کی بانق هیه اهالی به تامینات اتوانن پاره‌ی لی‌ورگرن و احتیاجیان دفع و فلاحته‌کیان ترقی پی بده‌ن .

غیری امیش چونکه بو استفاده و تحقیقاتی حصه حکومت له دغل و دان ممکن نه ابو تعشیر بکری مجبوراً تخمین اکرا اویش بعضاً ابو به‌واسطه‌ی ضرر و زیانیکی زوری فلاح و یا مغدوریتی حکومت .

امسال ام اصوله تازه‌یه که (جوتانه) به‌اگر به‌تواوی تطبیق بکری و مامورکانی منصف و بی‌طرفانه معاملاتی لازمه جی به جی بکن اصولیکی زور باشه به راستی ابی

بەسەبی بوژ انەوی اهالی و فلاحت •

ائجابو خاطری اهالی لەسلم وپارە ورکرتن بەفائضیکی فاحش کەالی الابدبوی نادریتەوەو ابیات بەقورا مجانی بی •بو هینانی شعبەیەکی بانق•و بو امەی کەام اصول جوتانەیە بە تواوی تطبیق و قونترولیکی تو او بکری •بوخاطری ام حضراتانە نەبوزنەوە بەواسطهٔ مامورین کوالەوە اهتمامیکی تواو پی دانی • رجا لە ایشی بدستەکانمان اکین • والا سفالتیکی ابدی طبیعی ابی •

عطار : محمد

—[]—

بو جناب سماحتماب مەلا افندی

روژنامەی ژیان کە زبان حالی ملتی کوردە بەرامبەر بە چاکی ایوەبو دولاوی کویی چند کلمەیەکی نوسیبو بەمە زور دلخوش بوین •

ایمە کە قوتابی هابجەین بە دل تشکری انسانیت ونجابتتان اکین • چونکە ریکای خدمتی حقیقی بو پیشکوتن ملت هەلیا نیشان ئەدن وئەی خدە پیشچاوی عالی کورد • ایتر هەر بژین ای دوژمنی نەزانین ونەشتی زانستی •

قوتابیانی قوتابخانەی هابجە

---

## هوالی دەرەوە :

### ملك افغان

جلالت ملك افغان لە قاهرە زیارت مکتب هندسە ثانوی و مجلس مبعوثانی کردوەو لە هر جیکایکیانا خطبەیکی خوبندوتە وە و قراری داوە ئە لەمودوا زوو طلبەی افغانی بو تحصیل بنیریتە مصر •

جلالت ملك افغان لەدوای زیارتی اسکندریە لە مصر مفارقتی کردوە و بحراً حرکتی فرموە بو ایتالیا •

جلالت ملك افغان لەکل ثروت پاشای رئیس الوزرای مصردا ملاقات و کفتکوی کردوە و فرمویەتی پەجدی ارزوم هیە کە لەکل مصرا معاهدەیکی ابدی بکم •

---

### لوید جورج

لندن ـــ بەمناسبتی صفری میستر لوید جورجەوە بو امریقا حکومت بەرزیلیا دعوتی کردوە و حرمتیکی لە حد بدری کرتوە •

---

### مسرای امریقا

شیکاغو ـــ امسال هتا ایستا بە مرما ٧٥ کس لە امریقا مردوە •

---

### موریە لە مجلس فرانسەدا

موسیو (بونجیە )ی فرانسەوی لە خصوص وضعیتی موریەوە نطقیکی داوە و وتویەتی هتا ایستا حکومت فرانسز بە ملیار پارە و چند هزار عسکری لە موریەدا لە علیهی سوریەکان صرف کردوە ، ایتر بسە لازمە ایمە اعتراف بکین بە استقلالیتی ام ملتە •

---

### قنصل ایطالیا لە اودەسا کوژراوە

لندن ـ قونسلوس ایطالیا (سنیور کوتزتو) لە اودەسا لە طرف دزەوە کوژراوە و لەدوای کوشتن روت کراوەتەوە و حتی دانە آلتونەکانیشیان لەدما درهیناوە •

---

### لە امریقاوە آلتون ابن بو اوروبا

پاریس ـ واپور (روشامبو) لە نیویورکەوە حرکتی کردوە بو اوروپا ودە ملیار دولار آلتونی پی یە •

### تورکەکان لە امریقا پارە قرض

استانبول ـ حکومت تورك خریکە لە امریقا پارە قرض بکات بو تمدید خطوط شمندوفری اناطولی بە مقابل بە بعضی امتیازات معادن •

ایطالیا و تورکیا

روما — غزتەی بو بو دیتالیا مقالەیەکی نشرکردوە لە عاەی او غزتە اجنبیانەی کە نشریات اکن بو اوە کە ایتالیا تشویق بکن بجرت بە کز حکومت تورکیادا و قسمیك لە غربی اناطولی اشغال بکات ، الی قطعیاً ایتالیا ام فکرەی نیە و هیچ ناخوشیك نیە لە بینی ایمە و تورکیادا و دائما امانەوی ایمە وکو ایستا دروست بین لە کل ام حکومتەدا .

شمندوفری الکتریق

بومبای — سیر ( لزلی ) بە مناسبتی تواوبون و رسم کشادی او خط شمندوفرەی کە بە جهاز الکتریقیە حرکت اکات لە بینی بومبا و پارودا دا احتفالیکی کردوە و بو ام خطە دو ملیون و پینجصد هزار لیرە انکلیز صرف کراوە .

فورطنە لە لندن

لندن — لەم بینەدا لە لوندرە بە واسطەی زور بارینی بفرەوە و روزکاری بە شدت و لاادارەوە فورطنە یکی زور کورەوەی داوە و خسارەیەکی زوری لە اهالی و اشیا داوە .

مسئلەی تسویەی قرضەکانی حکومت عثمانی

پارس — اجارە مسئلەی قرضەکانی حکومت عثمانی لە پارسا حل کراوە و بم زوانە بو تصدیق تردیەی مجلس میبوثانی حکومت تورکیا اکری .

حدود بینی تورکیا و سوریە

اعضاکانی تحدید حدودی بینی تورکیا و سوریة هاتونەتە حلب لەوی اکال بعضی نواقصات اکن .

قانون اساسی حکومت شرق اردن

حکومت شرق اردن لەم روژانەدا قانونە اساسیە. کەی کە دای ناوە رسماً نشری اکات و لەمانکی شباطیشا دست اکات بە انتخابات مبعوثان .

پارەی تورك

وزیر مالیەی تورك لائحەیەکی قانونی نشر کردوە بو ارەی کە لم بینەدا پینج ملیون لیرە تورك مسکوکات لە ( برونز ) لە ضرب بدا .

بحرین و ایران

جونیف — حکومت ایران لە اسر معاهدەی بریطانیا و ابن السعود لە خصوص بحرینەوە لە جمعیت عصبة الامم دا پروتستوی حکومت بریطانیای کردووە

ملك افغان

جلالت ملك افغان دو اصلی ایطالیای کردوە وکو شایعە ادن لە ٢٩ـك ـ ٢ ـ دا زیارتی روسیا اکات .

زلزلە

لندن — ١٢ ـ ك ـ ٢ ـ لە رصدخانەی اشینغتون وقاهرە و بعضی جیکای تردا کشفی بونی زلزلەیکیان کردوە کە لە روژی — ١٣ — ام مانکەدا وانع ای وحقیقتا لە عینی روژدا زور کس حسین کردوو .

حکومت روسیا مامورەکانی نفی اکات

روسیە قراری داوە ـ ٣٠ ـ شخص کە لە عایی حکو متی نفیان بکات و لە مانەدا رفیق تروتسکی ، زینوفیات ، و راکوفسکی ئاپادایە وحق قراریان داوە کە رفیق راکو فسکی بو جیکایك نفی بکن کە ـ ٣٠٠ ـ میل لە هر محطەیەکی شمندوفر دوربی .

هوال داخلی :

تأدیب اشقیا و یاخیەکانی نجد

حکومت عراق قوەتیکی کافی منتظم ، مسلح و مجهزی کوکردوتەوە و حاضری کردوە کە اجارە ضربەیکی زل لەو اشقیا و یاخیانەی نجدیانە بدات کە هجوم اکنە سر عشیرتی عراق .

## سقوط و تشکیل قابینه

لەبراوەی فخامت رئیس الوزرا جعفر پاشا لە ریاستی قابینە استعفای کرد و استعفا کیشی لە طرف جلالت ملکەوە قبول فرمورا ، ارادهٔ ملوکانە صادر بو کە فخامت سیر عبدالمحسن بك السعدون رئیس الوزرایتی درعهدە و قابینە تشکیل بفرمویت ، لە طرف فخامتیەوە قابینە لەم ذاتانە کە لە خوارەوە اسمیان درج کراوە تشکیل و کرسی وزارتیان اشغال فرموە :

رئیس الوزرا و وزیر خارجیە و وکیل دفاع — سیر عبدالمحسن بك السعدون

| | |
|---|---|
| وزیر داخلیە | عبد العزیز بك القصاب |
| وزیر عدلیە | حکمت سلیمان بك |
| « مالیە | یوسف غنیمە |
| « معارف | توفیق بك السویدی |
| « زراعت و ری | سلیمان البراك |
| « اشغال | عبدالمحسن الشلاش |
| « اوقاف | الشیخ احمد داود |

### لە بغداد سرما

لەم روزانەدا لە بغداد سرمایەکی بە شدت روی داوە حتی میزان الحرارە کیشتوتە ـــ ٤ ـ تحت الصفر .

---

بە مناسبتی اوەوە کە معلم اول مکتب حلبجە جناب حمدی بك رشید پاشا لە وظیفەکەی استعفای کردبو و استعفا کیشی قبول کرا ، لە معلمین مکتب دوم سلیمانی جناب محمد زهدی افندی تحویلا تعیین کراوە بە معلم اول مکتب حلبجە .

---

### مبعوث هولیر

اجارە لە نتیجەی انتخاباتا کە لە هولیر کراوە جناب معروف افندی علی اصغر کە حاکم منفرد بو بە اکثریت ارا انتخاب کراوە بە مبعوث هولیر .

---

بو ادارەخانۀ محترمهٔ ژیان :

رجام هەیە بە ناوی خدمتی وطن وملتەوە کەوە ام چند کلیمەیەم لە ستونی فخیمەکەتانا بودرج بفرمون .

بیستم لەم روزانەدا لە سەر اشعار سمی ، وهمتی فوق العادەی سعادت مفتش اداری کە احتیاجات حس کردوە بە موجودیت بونی شعبەیکی بانق لیرەدا مدیر ( استرن بانق ) بو امەی شعبەیك لە بانقەکەی لیرەدا گشاد بکات بو تحقیقات وتەکو کردن لەگل اهالی و طبقهٔ سرمایەدارانا تشریفی هینایە ایرە . فوائد بانق چونکە ازانم لە هەمو کسیکەوە معلومە احتیاج بە ایضاحی ناکات . چونکە لامان معلوم بو کە بکانە مقصدی مفتش اداری رفاە حال ملتە بیچارەکە بە عرض تشکرات لایقە تقدیم جناب مفتش و تمنای موفقیت وسعادتی اکم هەر بژی .

حفیدزادە
عبدالقادر

---

## هاتن و روشتن

جناب قائممقام حلبجە ... بك کەماوەیەك لەمە پیش چو بوە بغداد لەم روزانەدا عودتی فرمووە و لە دوای روژی استراحت تشریفی بردەوە حلبجە .

لە کرادهٔ جاف جناب حسین بك محمود پاشا و احمد مختار بك عثمان پاشا بو بعضی کاری خصوصی خویان لە حلبجەوە تشریفیان هینا و لە دوای سەرەم روژ احمد مختار بك عودتی فرمووە .

جناب راجز افندی مدیر کرك و ریژی منطقەی کرکوك بو تفتیش تشریفی هیناوەتە ایرە .

---



مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانیە .

بو همو شتیك

مخابرات : به ناوی اداره خانه‌وه اکری

§

اداره خانه : له بنای بلدیه‌دایه

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی به انه‌یکه

# ژیان

جریده‌یه

کریار

ده شش مانك مه

سالیك شش روپیه‌ده‌دا

بو دره‌وه بدل ابونه

حوت روپه و نیوه

۶ مانك کمتر ابونه قید ناکری

اعلانات

دیریك ۶ انه ده‌سیریت

یکی به انه‌یکه

همو شتیك انونی هفته‌ی جاریك دره‌چی غزته‌یکی کوردیه

تاریخ انتشار ۲۱ کانون ثانی ۹۲۶ ( سیشمه ) ۳۰ رجب ۱۳۴۶ ۲۴ کانون ثانی ۱۹۲۸


## تی کوشینی بشر بو ورگرتنی حریت

له پیش امه‌ی که بچینه موضوعه‌وه با بزانین حریت چیه ؟

یعنی کردنی کشت ایشیك وتنی همو قصه‌یك به سربستی به شرطیك که خراپه‌ی نه‌بی بو کس . انسان دائما ئه‌یه‌وی حربی چونکه له اسارتدا خوشی له ژیانی خوی نابینی ، له‌بر امه له یکم روژی تاریخ بشره‌وه تا ایستا هیچ انقلابیکی وکو انقلاب دینی لوتر وکالفنی که ضدی پاپا حرکتیان کرد و مذهبیکی تازه‌ی حقیقی وکو پروتستان پی‌هاته دی لنبوه له تاریخدا له پیش انقلاب مشروطیت له انکلتره و فرانسه ... الخ و انقلابی علمی عصری رابوردو و ایستا ، مؤرخان اقوام ئه‌توانن روژیك دابنین که بلین بشر له‌و روژه‌وه عملیاً عاشقی حریت بوه و بو نجات و ازادی تی کوشاوه کوابو له انقلابی لوتر زیاتر نیه . با بزانین انقلابی لوتر چیه ؟

انقلابی لوتر که له تاریخدا شرفیکی کوره‌ی هیه زور سببی هیه .

پاپا ایوبست حاکم سیاسی و دینی اوروپا بیت ، پاپای محو کرده‌وه .

یکم هنکاوی اوروپاییه‌کانه بو محو کردنه‌وه‌ی نفوذ پاپا و استبدادی

منشا حریت حقیقیه بو پیشکوتنی عالم .

له‌بر امه پاپا زوردار بو و غایه‌ی سببی یکه‌مین بو امرا و حکداره بچوکه‌کانی اوروپا شاره‌زای فکری بون ، که‌لی بهانه و که‌لی مسائل حقیق یان کردیه الت بو محو بونه‌وه و شکاندنی نفوذی پاپا تا لوتر هاته میدان بووبه اکر بونه‌هیشتنی پاپا .

حتی به‌و فکره اوتوی کرد اوروپا کورا و پروتستانی داهات به بشر حس کرد که اوانی یکه یکه‌ی تی بکوشی به‌و شرطه که بی ضرربی بو خلق یعنی حریتی شخصی داهات .

بره‌ بره حریت زور بو وزیادی کرد تا ایرو همو عالم کوررا سیاسیتا ، علما ، اقتصادا زیاد‌بوه و پیشکه‌وت .

وبشر تی کیشت که بی حریت نازی چونکی لذت له ژیان نادی بی او ه ملتیك بیه‌وی سربست بی ام شرطانه تطبیق بکا چونکی همو اقوام بم‌قاعدانه حر بون .

۱ — سفاهت نه‌کردن چونکی حریت وسفاهت

شەدن .

٢ — منداڵ بەخێو کردن لسەر اصولێکی باش بو محافظەی حریت دائما .

٣ — بە عزم بون .

٤ — هەو فردێك امین بو هەو حرکتێك نداکا. رێی ولە حق خوی توزێك بێتە خوارەوە .

لاوێکی کورد

[ تشکراتێکی عالی ]

چونکە لە بدلات غزتەکەمان تراکاتێکی زورمان مابو لەلوای سکرکوك وهولێردا . بو جمع وجبایتی ام تراکاتە لەموظفین مطبعە جناب شیخ طیب افندی‌مان نارد . لە دوای چند روزێك بە موفقیتێکی گورەوە عودتی فرمووە او تراکاتە کەمان بو موافق اودفترەی کە درابوی‌ین تحصیلی فرمو بو . طبیعی ام موفقیتە واسطهٔ لطف و انسانیت ومطبوعاتپرستی مشتری کرامەکانمانە . باخصوص لە لوای هولێردا لە طرف عموم مامورین اشراف وطبقات سائرهٔ اهالیەوە حرمتێکی لە حد بدری کیرا بو .

لو لوایەدا غیری امە کە مشتری پیشووەکانمان عموم بدلات غزتەکەیان تادیە کردوە . زور صاحب حمیت وعرفانپروری تریش خوی بە آبونە قید کردوە وحق قسطیکیان لە پیشەوە بدل آبونەکیان تسلیم کردوە و عومی وعدیان داوە کە بە هەو نوعێك معاونت غزتەکەمان بفرمون .

لە بر اوە تشکرات عالیمان تقدیم اوحیتمندانە و تمنای موفقیت وسعادتیان اکین . هربژی پیاوی حمیتمند ومعارفپرور .

صورت و نص معاهدەنامە تازەکەی بینی حکومت عراق و بریطانیای گورە

لە طرفێکەوە : جلالت ملك بریتانیای عظمی و ایرلاندە و مستملکات ما وراء البحر و ایمپراطوری هند .

لە طرفێکی ترەوە جلالت ملك عراق .

لە وقتێکا کە طرفین ویستیان بو تأییدی رابطەی صداقت و محافظەی هردولا و چونکە زانیان کە او دو معاهدەیەی کەلەلایێ طرفینەوە لە ١٠ مانگی تشرین اول ١٩٢٢ مصادف ١٩ صفر ١٣٤١ و لە ١٣ کانون ثانی ١٩٢٦ مصادف ١٨ جمادی الاخر ١٣٤٤ دا کرابو بە نظر احوالەوە بو پێشکوتنی عراق بە تواوی خدمت ناکات بە لزومیان زانی تعدیل بکن .

لە برامە بو ام معاهدە تازەیەی کە اکری :

لە طرف جلالت ملك بریتانیای عظمی و ایرلاندە و مستملکات ما وراء البحر و ایمپراطوری هندەوە جناب کاپتان و . ج . ا ( اورمزبی غور ) ی معاون وزیر مستعمرات بریطانیا .

و لە طرف جلالت ملك عراقەوە ، فخامت جعفر پاشا العسکری رئیس الوزرا و وزیر خارجیەی دولتی عراقە .

لەدوای امەی کە هردوکیان اوراق اعتمادیان تودیع کرا و بە مطابقی تعیین کران دستیان کرد بە معاهدەیە کە لە خوارەوەیە .

مادە ١ — جلالت ملك بریطانیا اعتراف بە حکومتی عراق اکات و بە دولتێکی مستقلی صاحب حقوق اَزانی .

مادە ٢ — جلالت ملك بریطانیا و جلالت ملك عراق تعهد اکن کە محافظەی رابطەی دوستیەتی بە صورتێکی جدی بکن و منعی او بی قانونیە بکن کە ابی بە سببی اخلال نظام داخلی مملکت طرفین .

مادە ٣ — جلالت ملك عراق تعهد اکات کە

تأمین تنفیذی او تعهداتەی بین‌الدوله نکات کەجلالت ملك بریطانیا تعهدی کردوه و اوانەی کەمختصه بەعراقەوه ، و جلالت ملك عراق تعهد اکات او مادانەی که لەقانون اساسی عراقا ،وجودە لەخصوص حقوق مصالح اجانبەوەو اقوام مختلفەی عراقەوه که قد تعدیل نکری و خلاف معاملە نکری کەنقصانێك بیکە بنی بەوحقوقە

ماده ٤ ــ بو خصوص مسائیکی خارجی کەتأثیر بکاتە مصالح مشترکە لازمە لە بینی طرفینا مفاوضه و مشاوره بە تواوی و صراحة جریان بکات .

---

## هوالی دەرەوه :

جمعیتیکی سری لە استانبول

استانبول ــ غزتهٔ اقشام انوسی جمعیتیکی سری کە خدمت ئەکری پرنس ( کارول ) رومانیایی اکات لە استانبول کشف کراوه ورئیسەکیان کولونیلیکی رومانیایی‌یە . وا درکوتوه کە پرنس کارول بەم زوانه بیتە استانبول لەویوه حرکت بکات بو دوبریجە .

---

قونسلوس بریطانیا لە تورکیا

مستر سیر جورج کلارك سفیری بریطانیا لەتورکیا کە ماذونا چوبووە لوندره اجاره عودتی فرموتەوه استانبول .

---

قبرستانیکی عصری لە انقره

انقره ــ بلدیهٔ انقره قراری داوه کە قبرستانیکی عصری بە اصولی تازه لە انقرەدا احداث بکات . وبو امە صدوپنجا هزار لیرەی تخصیص کردوه .

---

اتفاق مصر وبریطانیا

قاهره ــ اجاره معاهدهٔ انکلیز ومصر بە ارضای طرفین تواو بوه غیری‌دو ماده نەبی کە یکیکیان‌مسائلی نقلی عسکری انکلیزه لە قاهرەوه بو شرق قنال‌سویس و اویتریان مسائلی سودانه .

---

سقوط قابینەی حکومت لبنان .

رویتر ــ لەمراستعفای رئیس الوزرای لبنان قابینە سقوطی کردوه ، وبە امر رئیس جمهور قابینە یکی تازه تشکیلی کردوه ، هرچند جاران عبارت‌بو لە حوت وزیرابستا اقتصاداً کراوه بە سه ــ ۳ وزارة .

---

مجلس عمومی لوندره

لندن ــ اجاره مجلس عمومی مناقشەئی کردوه بو اوەی وزارت مواصلت‌ومعارف لغو بکانەوه ، فقط مستر بالدوین وتویەتی هتا لە طرف مجلس ملیەوه قانونیکی مصدق ترتیب نکری جائز نیە ام وزارتە الغا بکریتەوه .

---

ملك افغان

لندن ــ جلالت ملك افغان ئە مواصلاتی ایطالیای کردوه لە طرف قرال ایطالیا ، موسولینی و هیئت وزراوه بە صورتیکی مطنطن استقبال کراوه و رسماً میوانی حکومت بوه .

جلالت ملك ایطالیا نشانیکی هره بە قیمتی تبرع کردوه بە ملك افغان اویش مقابلتاً نشانیکی افغانی اهدا فرموه بە ولی عهدی ایطالیا .

وا درادەوی کە ملك افغان زیارت عموم پایتختەکانی اوروپا بکات .

---

ایران روپیە منع اکات

طهران ــ حکومت ایران امری داوه بە عموم موظفین حدود و مأمورین پوستە کە موافق قانونیکی مصدق لەطرف مجلس مبعوثانەوه منعی روپیە بکن کە داخل طهران ببی .

---

فقیره‌کانی ایرانی لە بغداد

حکومت ایران امری داوه بە مأمورین پساپورط بغداد کەلەودوا بوا ایرانیه فقیرانەی کە لەبغداوەعودت اکنەوه ایران مجاناً پساپورطیان بدەنی .

هوال داخلی :

معالی نوری پاشای زعیم اجاره به ارادهٔ ملوکانه تعین کراوه به وکیل قوماندان عمومی جیش عراق .

---

معالی صبیح نشئت بك که تعین کراوه به ممثل عراق له تورکیا حرکتی کردوه بو عمل وظیفه‌که‌ی ــ انقره

---

اجاره له مقام عالی متصرفیه‌وه امر درا به عموم قضا ونواحیه‌کان که دست بکن به انتخابات تازه .

---

هاتن

له رؤسای پشدر جناب عباس ئاغای سایم اغا و احمدبك توفیق بك یك دو روز لهوپیش بو ایشوکاری خصوصی خویان تشریفیان هیناوته سلیمانے

---

صورت مترجمه‌ی تلغراف ژماره ۱۰٦۷ و روژ ۱۹ ــ ۱ ــ ۲۸ وزارهٔ داخلیه :

بو متصرف سلیمانی

له براوه‌ی که اساس مشروطیت ایجاب به موازنه‌یکی قوی اکات له بینی قوای اجرائیه و قوای تشریعیه‌دا و ام موازنه‌یش منوطه به موجودیتی شعبات پارلمنتو که صاحب مقاصد معینه و غایه‌ی معلومه‌بن . و لبراوه‌ی که اوضاع اثباتی کردوه مجلس امت له وضعیت حاضریدا او فرقانه‌ی تیا نیه تامینی موجودیتی ام موازنه بکا و لبراوه‌ی حکومت مسائلی زور مهمی بدسته‌وه‌یه که منافع اهم ملتی تیایه وکو معاهدهٔ انکلیز و عراق و اتفاقنامه‌ی مالی و عسکری و مسئله‌ی دفاع وطنی که ایجاب اکات له همویان ملت خبردار بکریت که حسیات خویان نیشانه بده‌ن و فرصتیان بدریتی که لم خصوصاته‌وه به واسطه‌ی ممثلین یانه‌وه خواهش خویان بیان بکن ، بو فسخی مجلس امت و مباشرت به انتخابات بو مجلس تازه موافق ماده (۲٦) قانون اساسی اراده‌ی ملکی صادر بو ، امرو مجلس فسخ بووه‌ ، بو معلومات بر اوهٔ فوراً موافق قانون دست به انتخابات بکریت نیررا .

---

اعلان

له دائرهٔ پولیس باس سلاح بو سال تازه موجوده هر کسی لازمیه‌تی مراجعت به دائرهٔ پولیس بکات . باس سلاح بو قضاکان وناحیه‌کانیش نیرراوه اصحاب سلاح له خارج شار اتوانن مراجعت به قائمقام و مدیران بکن بو ورگرتنی .

متصرف سلیمانے

---

له ریاست بلدیه‌وه :

اعلان

| قیمت مقدره | | مقدار | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| انه | روپیه | اولك | دونم جدید | نوع ملك | موقع | اصحاب ملك |
| | ۷۵۰۰ | ۲۲ | ۵٤ | اراضی | کانی‌اسکان | حاجی ملا سعید و احمد اغا و فارس افندی ورثه‌ی حاجی عبد الرحمن بك |

موافق خریطه‌ی مرسمه عبارت له ٥٤ دونم جدید و ۲۲ اولك قطعه‌یك اراضی که له غرب مملکته‌وه واقعه ز به اراضی کانی اسکان مشهوره و عائده بو اشخاصانه که اسمیان له بالاوه نوسراوه بو بنای قشله‌ی عسکریه بدن استملاکی به ۷۵۰۰ روپیه له طرف هیئت مخصوصه‌وه تقدیر کراوه هر کسی له علاقه‌داران لم خصوصه‌وه افاده و اعتراضیکیان هیه موافق قانون استملاك لازمه له ظرف هشت روژدا مراجعت بکن به دائرهٔ بلدیه و بیانی بکن بوا کاداری اعلان کرا . ۲۱ کانون ثانی ۹۲۸

---

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانے .

سال ـ ۳ ژماره ـ ۱۰۰ (ژیان) لاپره ـ ۱

# ژیان

بو همو شنبیك

مخابرات : بە ناوی ادارەخانەوە اکری

§

ادارە خانە : لە بناى لدیەدایە

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی بە انەیکە

کرێ‌ی او
بە شش مانك سە
سالیك شش روپیەدەدا

بو دەرەوە پول ابونە
حوت روپە و نیوە
٦ مانك کەر ابونە قید ناکری

اعلانات
دیریك ٦ انە دەسیئرێت

یکی بە انەیکە

همو شنبیك انوسی هفتەی جاریك دردەچی غزتەیکی کوردیە

تاریخ انتشار ۲۱ کانون ثانی ۹۲٦ (پنجشنبە) ۱۱ شعبان ۱۳٤٦ ۲ شباط ۱۹۲۸

معاملات تسجیل نفوس بو ملتیکی متمدنە و بو همو حکومتیك لازم و بلکە واجبە :

وکو حسمان کردوە وابین لە خارج مرکز ام لوایە، دا اهلی دیهات مقابل بەو هیئەیەی کە بو تسجیل نفوس چوتە دەرەوە عصبیت انوینن و کریا بەو فکرەوەکە چوتە ذهن و دماغیانەوەکە واتی گیشتون ام معاملاتە و تسجیل نفوسە بو تطبیق کوکردنەوەی عسکر اجباریە ـــ یعنی لە دوای ام معاملاتە اوی ناوی خوی قید کردبی حکومت بە زور و بە جبری ایکات بە عسکر لەبرارە خویان و منالیان اخفا اکن و تسجیلی ناکن .

هرچند پێشێك لەمو پێش حکومت رسماً ام مسئلەیەی اعلان کردبو و نصایح و توصیەی اهالی فرمو بو کە ام فکرە صحیح نیە و ام معاملاتە بو عسکری نیە .

چونکە بومان معلوم بو کە ایستاش بعضی کس بە واسطەی نەزانین و تی‌نگیشتنیەوە هروا تی‌اکات کە ام معاملەیە بو عسکریە ، بە لزومان زانی ایمیش بحث لەم معاملەیە بکین و بە دلائل معقولەی ملتەکە تی‌بگەینین کە ام فکرەیان غیرە صحیحە .

امرو و چند سال لەمو پیشەوە لە ناو حکومتی متمدنەدا ارانەی کە تطبیق قانون مکلفیت عسکریەیش ناکن دیسانەوە ام اصول و معاملات تسجیلیەی نفوسە تطبیق اکن و همو فردیکی ملتە لە لای حکومتە کە معلوم و ناوی ثبتدە .

چونکە حکومتیك ، ملتیك و حتی شاریك فرداً فرداً همو موجودیتیکی تسجیل و قید نکردبی بوی معلوم نابی کە مقدار و موجودیتی حکومتە کە چندە .

ذاتاً امرو ایستاتستیق حکومتیك و هی همو کورە ارض بەم واسطەیەوە زانراوە و ازانری .

غیری امە ابی ملت بیزانی کە حکومت انکلیز امرو لە همو مستملکەیکیا وکو هندستان آوستralیا .. قانون مکلفیت عسکریەی تیا تطبیق ناکری و بە ارضای خوی و بە اجریکی مقطوعە نەبی ناتوانیکات بە عسکر بگری لەو جیگایانیشا دیسانەوە معاملات نفوسیە هیە . و دیسانەوە فردیك تسجیل نکرابی بیەوی بچی بو حکومتیکی خارج پسابورطی نادرێتی و لە هیچ جیگایەکا حقوقی محفوظ نابی .

وجگە لەمانەیش شخصیك اگر خوی تسجیل نکردبی و لە دفاتر نفوسیەدا مقید نەبی هیچ معاملاتیکی

حکومتی وکو مناکحات طاپو ، التزام ، له محکمه‌دا دعوا کردن ، اشتراك انتخاب مبعوث وکلی معاملاتی تری بوناکری و ابی به واسطهٔ مقدورتی وله هموحقوقیك محروم ابی .

له بر امه استرحام اکین بوخاطری مانه‌کەی ابێش موجودیتیکی معلومه‌ی بزانری ولای هەو حکومتیك تحقق ومعلوم‌بی وله معاملاتی حکومتیدا محروم ونوشی جزا نه‌بی موافق اوامر حکومت لای مامورین مائده‌ی خویانو افراد مائه‌یان تسجیل بکن . ودیسانه‌وه به جدی تأمین اهالی اکین که ام معامله به بر عسکری نیه .

پاشماوه‌ی معاهده‌نامه تازه‌که‌ی بینی عراق و حکومت بریطانیا :

ماده ٥ ــ جلالت ملك عراق موافقت اکات که له وکالت جلالت ملك بریطانیاوه مندوبیکی سامی له‌عراقا به‌بی بو اوه‌ی که‌همو وقتیك له خصوص ترقی واقتصادیات ومسائل‌مشروعه‌وه که‌فتکر له کل حکومت عراقا بکات و تبلیغی حکومته‌که‌ی خوی بکات و بو تبلیغ و تماشا کردنی او مسائلانه‌ی که جلالت ملك بریطانیا تأثیریکی چاك تیا اینی بو خصوص ترقیات و مصلحت عراق ویا مخالف او تعهداته‌بی که له‌کل یکتریدا کردوبانه .

٦ ــ جلالت ملك عراق تعهد اکات له حالیکا که عراق قابلیت قبول‌کردنی بی همو اتفاق دولی ایستا قبول بکات ، اوانه‌ی له مستقبلا له خصوص تجارت مخدرات ، تجارت صلاح و ذخیره و عبد حبس و منال فروشتن ومساوات له تجارت و حریتی بحری‌دا و پوسته و تلغراف ، بی تل ، پوسته‌ی هوائی و حمایه‌ی صنایع بشرطیك که موافقتی عصبة الامم له‌سربی قبول بکا و جلالت ملك عراق چکی لانه تعهد اکات به تنفیذی مواد ام وثیقانه‌ی خواره‌وه که علاقه‌ی هیه به دولتی عراقه‌وه ایمش : عهد عصبة الامم ، معاهدهٔ لوزان ، معاهدهٔ فرانسه و انکاره له خصوص حدوده‌وه و معاهدهٔ ( سان ریمو ) له خصوص نوته کانه‌وه .

٧ ــ جلالت ملك عراق تعهد اکات به‌قدر اونده‌ی که احوال اجتماعی ، دینی و غیره مساعده بکات و اشتراك بکات له‌خصوص تنفیذ همو تدابیریکی عمومیه‌وه که جمعیت عصبة الامم قراری ادا له خصوص مکافحه‌ی امراض نباتیه و حیوانیه‌وه .

٨ ــ جلالت ملك بریطانیا تأییده او وعده‌ی اکره‌وی که ترشیحی عراق بکات بو اوه‌ی که‌له‌سال ١٩٣٢ دا داخل عصبة الامم‌بی بشرطی عراق وکو ایستا دائما برو ترقی بروات .

٩ ــ لازمه له عراقا هیچ تفضیلی شخصیك به سرشخصیکی‌ترا نکری لو شخصانه‌ی که آهی‌دولتیکن له دولته‌کانی که داخل عصبة الاممن و یاخود منسوبی دولتیك‌بی که جلالت ملك عراق موافقتی کردبی به معاهده‌یکه‌وه که اگر عضویك‌بی له عصبة الاممدا بو نوعه استفاده له حقوقی‌خوی اکات ، و او شرکتانه‌ش که به موافق قانونی او دولتانه تشکیل کرابی که ایمش شمولی به سر تجارت ، فلاحة ، ضرائب ، صنعت و معاملهٔ مراکب ، تجاریه ، طیاره ، به پی اومعاهده‌یه هروها فرقیك و تفضیلیك نابی بی له اشیای تجارت صادره و وارده لوه‌وه و یا بواو دولتانه‌ی که بحثیان کرد .

١٠ ــ جلالت ملك بریطانیا تعهد اکا که له‌سر رغبت ملك عراق حمایه‌ی او عراقیانه بکات که‌له ولاتی اجنبین و ممثلی عراقی تیا نیه .

١١ ــ لم معاهده‌یه‌دا هیچ شیئك نیه که‌تعرض عقود محرره‌ی بین حکومت عراق و مرطفین بریطانیا

احمد زوغوی ملك ارناوت

غزته‌ی دیلی اکسپریس تلغرافیکی نشر کردووه الی احمد زوغوی ملك ارناوت دین اسلامی ترك کردوه وچوته سر مذهبی قتولیکی ــ دین عیسوی . والی ام ترك دینه‌ی بو اوه‌یه که زن بنی .

هوال داخلی :

جلالت ملك معظم

جلالت ملك‌معظم بیانی روزی ١٤ ــ ١٠ ــ ٢٨ حرکت فرمووه بوزیارت کربلا ونجف ودیوانیه و مدهٔ وقاره وله ٢٦ مانکدا عودت افرموبته‌وه بغداد .

تکذیبیکی رسمی

مدیر مطبوعات رسما تکذیبی او حوادثه‌ی کردوه که گویا بصریه‌کان ادعاوان کردوه که له عراق جیا ببنه‌وه .

معالی مستشار قضاو ناحیه‌کان ئه‌درا

معالی کورنوالیس بیانی ٢١ ــ مانك له کل سعادت مفتش اداری دا به اوتوموبیل تشریفیان برده ناحیه‌کان مووداش وایواری عین روز عودتیان فرمووه و بیانی ٢٢ ــ مانك دیسانه‌وه حرکتیان فرموو بو قضای حلبجه وناحیه‌ی خورمال وایواری روز ٢٣ ــ مانك تشریفیان هینایه‌وه وله‌هموو موقعیکا فوق العاده راسمه‌ی استقبالی بوایغا کراویانی ٢٤ ــ مانك ساعت چواره‌نیوی عربی به‌ری کرکوکا عودتی فرمووه وله طرف سعادة متصرف وکری ومفتش اداری ومفتش پولیس‌وه تشییع فرموورا .

مشارالیه له‌هموو تشریف هینانیکیا بوام‌لوایه‌اساسیکی ترقی وتعالی بوتامین کردوین واجاریش به‌سبب قدوم مبارکیه‌وه امید اکین زیاتر نائل سعادت ببین . عرض حوا حافظی وتمنای سعادتی اکین

ژ

اعلان

رسمی قائی [ شکمیدان ] که تازه له قضای حلبجه‌دا انشا کراوه خراوته مزایده‌وه مدهٔ الزام له ١ تشرین ثانی ٩٢٨ وه‌به حتا نهایی مارت ٩٢٩ هر کس طالبی اجاره‌به لازمه له‌کل تامینات نظامیه‌دا مراجعت به مجلس ادرهٔ لوا ویا قضای حلبجه بکات .

متصرف سلیمانی

اعتذار

له‌بر نخوشی یکی‌له موظفه کانمان دوهفته غزته که‌مان نه‌کرا بو درچی استرحام عفو له‌قارئین کرام اکین

ژیان

له ریاست بلدیه‌وه :

بدل تخمینه

بوهر یك متره مربعی

| روپیه | نوع ملك | اوه مقدارهٔ که‌لی ئه‌بری ساتیم | اوه مقدارهٔ که‌لی ئه‌بری متر مربع | ناوی صاحب ملك |
|---|---|---|---|---|
| ١٠ | عرصهٔ دوکان | ٥٠ | ٢٤ | ورثه حاجی عبد الله کیابجی ملا کریم ملا اورحمن محمد ، آمینه وعنبر خان |
| ٨ | عرصهٔ خانو | ٠٠ | ٩٥٣ | احمد بك توفیق بك |

بواکالی جاده‌ی صابونکران او ملکانه که لازمه وتقرری کردوه استملاك بکری نوع وجنس واسمی صاحب واو مقداره‌ی که استملاك اکری له‌کل بدلی که له طرف هیئت تخمینه ومجلس بلدیه‌وه بویان تقدیر کراوا له‌بالاوه نشان دراوه هر کس له‌داخل قانوندا اعتراضیکی هیه له تاریخ ام اعلانه‌وه حتا نو روزی ئه‌لازمه درمیانی بکا بو کاداری اعلان کرا .

بو هەمو شتێك
مخابرات بەناوی ادارەخانەوە
اکری
§
ادارەخانە لەبینای بلدیەدایە
عنوان : سلیمانی ژیان
یکی بە آنەیکە

هەو شتێك آوسی هەفتەی جارێك دردەچی غزتەیکی کوردیە

کریار
بەشش مانك مە
بەسالیك شش روپیە دەدا
بو دەرەوە بدل ابونە
حوت روپیە و نیوە
شش مانك کمتر ابونە قیدناکری
اعلانات
دیریك ٦ آنە دەسینرێت
یکی بە آنەیکە

۱۸ جمادی اول ۱۳٤۷ ۱ ت . ثانی ۱۹۲۸ [پنجشمە] تاریخ انتشار ۲۱ کانون ثانی ۹۲٦

## چاك لە فکر ناچیتەوە

لە غزتەی پیشومانا بحثی قدوم و تشریف هینانی معالی مستشار وزارة داخلیە کورنوالیس‌مان کردبو وام سیما عالی‌یە چونکە بو عراق و خاصتا بوام مملکتە کلی خدمتی سبقتی کردوە ، امانەوی بە مناسبتی تشریف هینانی امجارەیەوە بحث لەو خدمات عالیانەی کە بوی فرمو ین و مقابل بەوە درجەی حسیات ملتەکە برامبر بە مشار الیە عرض قارئین کرام بکین .

مشار الیە لە رجال سیاسیە و مشهورۀ حکومت فخیمەی بریطانیایە ، لە اوائل حرب عمومی دا بو نجات دان و سربستیت و حریت اقوام ضعیفەی جزیرة العرب ، عراق حتی بو کوردستانیش لە سعی کردن و کو قصوری نکردهەو فداکاریەکی اختیارکردهتا نتیجە لە نهایت حرب عمومیدا ام ملتانە نجاتیان بو و او پردە تاریکەی وحشت و جهالتە کە بەسریانا راکیشرابو لابرا هاتنە ناو روناکی مدنیتەوە بە نوعیك کە امرو هەمو صاحب حقوق و حریتیکی کاملەیان هیە و طبیعی هەمو ایزنین امە بە واسطەی تشبثات حکومت فخیمە و بالخاصە بە واسطەی چند رجال سیاسیون و متشبثین وکو معالی کورنوالیس‌وە بوە .

دیسانەوە معلومە و هیشتا لە فکران نەچوەتەوە کە لەوقتیکا عموم ملتەکانی دواوسیمان لە رحتی و استراحتا بون یکی ایمە بە واسطەی بعضی اسبابەوە لەناو وروطە یکی فلاکت و انقلابا کیژمان اخوارد و ام فلاکتە مدەیکی چند سالی دوای کرد و حتی کە حکومتیش تشریفی هینایەوە دیسانەوە بە آوای امنیت و اسایشیك تامین نکرا هەتا درجەیکی وەهات کە ثروت مملکتەکەمان ضایع و و درگای نجا تمان بستراوات بی‌قوت دست و اژنو دانیشت و کە حکومت فخیمە زانی ایتر یە بەو یەوە نەماو و ملتەکە متنبە بوە و او معاملە خراپانەی لە فکری خوی دەرهیناوە و پشیمان بوەتەوە .

ایتر بە جدی بو رفع ام حالە قراری قطعی دا . معالی کورنوالیس وتوکی مسائل مهمتری عراقی حل فرمووە بو حل ام مسئلەیش بە جدی سعی فرمو . وتشریفی هینایە سلیمانی ولیرەیشەوە چووە خورمال ولەوی لەگل شیخ محمود افندیدا ملاقات فرمو ولە داخل بعضی شرائط موسی الیە عفو فرمو

ونتیجه ام انقلاب وفلاکته‌ی به ابدی رفع فرمو .

وله‌وساوه به واسطهٔ او همت عالیه‌یه‌وه وبه سبب تدابیری حکیمانه‌ی مامورین اداریه‌کانمانه‌وه لواکه‌مان وکو امنیت و آسایشیکی ابدی بوتامین کراوه روز به روز زیاتر بو ترقی وتعالی هنکاو اهاوی به نوعیك که امیدمان هیه به نظر ام دو ساله‌وه که بهم درجه‌یه گیشتوین به مده‌تیکی کمی‌تر فوق العاده ترقی وتعالی بکین .

وله‌بر اوه که موجدی ام امنیت و آسایش و سعادته‌مان یکانه مشار الیه کورنوالیسه الابد برای‌یه‌هم سپا عالیه ومشفقه متشکر و لابد ام انسانیته‌مان له فکر ناچیته‌وه‌ومدیون او انسانیته فوق العاده‌یه‌ن. امید اکین هروکو سابق دائما ام مملکته که اتوانین بلین موسس ثانیه‌تی له فکری نه‌چیته‌وه . وله هرو تشریف هیناتیکیا هربه‌و لطف وشفقته‌وه سعادتیکی زیاترمان بوتامین بفرموی .

—✻✻—

پاشماوه‌ی بیاناته‌که‌ی معالی امین زکی بک — له خصوص معارفه‌وه .

٥ — منهاج تدریس — نظر مجلس عالیتان جلب اکه‌مه سرمنهاج تدریس مکتبه ابتدائی و ثانویه‌کان من شخصی خوم تدقیق ام منهاجه‌م کرد و له‌خصوص درجه‌ی تاثیری بهره له مکتبه‌کانا معلوماتم پیدا کرد و له‌کل ارکان وزارتدا معلوممان بو که‌لازمه ام منهاجه به عجله تعدیل بکری و تودیعی لجنه‌ی خاص خوم کرد .

٦ — مبادی مکتبه‌کان .

٧ — کله‌ی لیلیه — نظر عالیتان جلب اکه‌م بو کردنه‌وه‌ی کله‌یکی لیلی له شکلیکی زور چاك و تازه‌دا که‌به‌بی به سببی اوه‌ی که استغنا بکین له‌وه‌ی مناله‌کا نمان بنیرین بو کلیه‌ی بیروت و مبادی یه‌کی عبارت بی له صنفان ثانوی و قسمیکی له طرف استادان تدریس اجانبه‌وه‌که ممتاز و متخصص بن له علم تدریس و تربیه دا ، اداره بکری به نوعیك فوق العاده اهتمامی پی بکری که له‌همو خصوصیکه‌وه مستجمع بی به سر کلیه‌ی بیروتا که همو سالیك سه‌ سه‌لك روپیه له‌ثروته‌که‌مان جلب اکات و من اتوانم به صراحت بلیم که ام مصرفه زوره و ام اذیته که له خصوص ناردنی مناله کانمانه‌وه صرف اکری نه له جهت علومه‌وه و نه له اخلاقا فائده‌یکیان پی اکه‌نی له‌بر اوه به عجله واجبه بوتاسیس ام کلیه لیلیه اهتمام و مباشرتی پی‌بکین و ام مسئله‌یه بو اصلاحی معارفمان تاثیریکی تواوی ابی .

چاوم به بعضی مکاتب لوا وقضاکان کوتووه که له حالیکدان انسان متاثر اکات، و او ابنیانه‌ی که‌مکتبه‌کانی تیادایه نه به عملی مکتب ونه به‌بی به مسکنیش وحتی به نوعیك ممکن نیه شخصیك که معلوماتیکی بسیطی بی له فن بیطاری‌دا او حیکایه بکات به تویله‌یك . و ام ابنیانه له خصوص صحت طلبه‌کانه‌وه تاثیریکی خراپ اکات وبو مکتب استفاده‌یه‌کی لی ناکری . له‌بر اوه امه به وظیفه‌یه‌کی مقدس اینیم بومجلس وحکومت که به عجله معالجه‌ی امه بفرمویت، وتیه‌دان ام مکتبانه لم نخشه‌یه‌دا بلیته‌وه . وکو نقصیکی کوره‌یه بومعارفمان وکاملتیکی کوریشه بوخزینه که ام همو مصارفه له خصوص بدل ایجاری ام مکتبانه‌وه اادرینه کات وسال به‌سال زیاتر ابی به نوعیك که بدل ایجاری مکتبه‌کان بغداد امسال گیشتووه به ( ٦٠٠٠٠ ) هزار روپیه بلکو زیاتریش .

ومکتبه مکتبه‌کان تقسیم بکرین به دو قسم : [١] مکاتب اولی [ ٢ ] مکاتب ابتدائی وثانوی .

ماویه‌تی

## حوال دره‌وه :

ایران بو اوروپا طلبه انیری

طهران — وتی له مجلس ملی دا قرار دراوه که هر ساليك ایران قسمێك طلبه بنیری بو كلیه‌تانی خارج له سەر اوه امسال ( ۱۰۰ ) طلبه‌ی ناردوه بو كلیه‌كانی اوروپا بو تعلیم ، و حکومت موافق مقررات مجلس ابی شەش سال وا دوام بكات

---

موجود عمله بی ایشه‌كان له بریطانیادا

لندن — له‌سەر او احصائیه‌ی كه اجاره كراوه معلوم بوه‌ته له تاریخ ۸ — ۱۰ — ۹۲۰ دا ۱۰۳۱۹۰۷۰۰ عمله‌ی بی ایش له بریطانیادا موجوده و ( ۱۰۶۶۷۹۰ ) عمله‌ی له پیش ام تاریخه‌دا كه می ردبوته‌وه فقط به نسبت سال پاره‌وه ( ۲٤٦۷۰۰ ) زیاده .

جژن خلاص استانبول

به مناسبتی روژ جژن خلاص استانبوله‌وه والی استانبول محی‌الدین بك تلغرافیكی تبریكی بو رئیس جمهوری توركیا نوسیوه و رئیس جمهوریش مقابلتا جوابی داوه‌ته‌وه .

استعفای لورد بركنهد

لندن — به رسمی معلوم بوه كه ( لورد بركنهد ) وزیر هندستان له وظیفه‌كه‌ی استعفای كردوه و له جی‌او ( فایكونت پیل ) وزیراشغال هند تعیین كراوه .

و كو معلوم بوه له تلغرافیك كه لورد بركنهد بو رئیس‌ الهیئه‌ی حكومت بریطانیا مستر بولدوینی نوسیوه ام استعفایه‌ی هر بو اوه‌یه كه ایتر اشتراك حیات تجارت بكات و واز له وظائف حكومتی بهینی .

---

سفری امیر عبدالله

عمان — امیر عبدالله حركتی كردوه بوقدس وروانان اكری ام سفره‌ی هر بو تنقیدی او قوانینه تازه‌یه كه له قدسا معامله‌ی پی بكری .

## حوال داخل :

﴿ ولی عهد عراق ﴾

هم هفته‌ده‌دا ولی عهدی خوشه‌ویست عراق‌مان له لوندره‌وه گرایه‌وه بو عراق بو اوه‌ی بچیته مكتب حربیه‌ی عراقه‌وه چونكه باوكی ارزوی افرمویت . وهتا‌كو ایستا له كلیه [ هارو ] دا تحصیل افرمو .

---

( جلالت ملك معظم عراق )

جلالت ملك معظم حركتی فرموده بو خانقین ورنگه روژی دوشمه‌ی پیشو گرایته‌وه بغداد .

---

قونسلوسخانه‌ی عراق له مصر

ممثل عراق له مصر رشید بك الخواجه مواصلت قاهره‌ی فرموده وله جاده [ برجاس ] دا له قصری ( جی وبارد ) د منی بو استئجار كراوه .

## هاتن و روشتن

معالی وزیر اشغال

بو تماشا كردنی طرق مواصلات و اتصالات امرواية وزیر اشغال و مواصلات معالی حسن بك لشلاوش روژی ۲۸ — ۱۰ — ۲۸ تشرینی هیناية سلیمانی . بو سەر تازه‌كه و او ابنیه‌نه‌ی كه درست كراون تماشای فرمو وه طرزی درست كردنه‌كه‌یان ممنون بوو له مالی سعادت مصرف اكرمی میوان بو له دوای روژیك عودتی فرموده . عرض خوا حافیظی وتمنای موفقیت اكین .

سعادت متصرف اکری و مدیر پولیس و محاسب لواء بوتماشاکردنی ایشوکاری قضاکەیانی روژ جمعەی مصادف ٢٦ — ١٠ — ٢٧ تشریفی بردە هلبجە و بو صبحی ایواری عودتی فرموەوە .

---

مدیر طاپوی منطقەی موصل محترم رفیق بك تشریفی هینایە سلیمانی و بواوەی دائرەیکی طاپو لە الیجە تشکیل بکات تشریفی بردە هلبجە و لە دوای دو روژ بو موصل عودتی فرموەوە .

---

معاون مستشار وزاة مالیە بو تماشاکردنی معاملات مالیە تشریفی هینایە سلیمانی ولە دوای روزیك عودتی فرموەوە .

---

مفتش عام پوستە وتلغراف میجر کاملی بو تماشا کردن ایشو کاری پوستە و تلغراف لە ٢٨ — ١٠ — ٢٨ دا تشریفی هینایە سلیمانی و لە دوای روزیك عودتی فرموە

مبعـ ث محترم سلیمانی جناب محمد صالح بك بە مناسبتی اـ ع مجلسەوە دوینی حرکتی فرمو بو بغداد .

---

محترم آمر منطقەی سلیمانی حضرة علی رضا بك العسکری بو بعضی تطبیقات عسکری تشریفی بردە موصل و دوینی ایواری عودتی فرموەوە .

---

قائمقام شاربازیر محترم رضا بك بو بعضی ایشو کار لە مرکز قضاوە تشریفی هینایە سلیمانی و لە دوای چند روزیك عودتی فرموەوە .

---

حاکم منفرد سلیمانی محترم کریم بك و فضیلتاب قاضی و باشکاتب محکمە کریم بك بو تشکیلی محکمەی کبری تشریفیان بردە هلبجە و لە دوای دوروز عودتیان فرموە .

## کاملی رفیقی ئوفیقی

مرکزی لە کرکوکە ، ابرەنش لە دائرة بلدیەی سلیمانی شعبەیکی کردوتەوە هەمو نحوە دعوی و دعاوی استدعایە قبول و مسائل تمیزیە تعقیب اکات ، لە کرکوك بەحوی و ایرە بە واسطەی معتمد علی کمال افندی یاپیر اغارە مراجعتی پی اکری .

---

## اعلان

هیچ نانوایك او نانەی کە درستی اکەن نابی گنمەشام ونوك وجو ومواد سائرەی تیکلاو وناوکا. تیان لە هوبر فطیر درست بکەن هر نانەوایك اگر بە خلاف ام اعلانە حرکت ونانی خراپی بو فروشتن درست کرد ویا بە صورتیکی تر غشی تیدا کرد بەپی مادە ١٢٦ قانون عقوبات بغدادی تجزیە اکری . بو آگاداری عموم اعلان کرا .

رئیس بلدیە

## آخر رجا

هتاکو ایستا بو تراکم بدلات ابونەغزتەکمان متعدد دفعە رجامان لە مشتریکانمان کرد کەوانە کە هیشتا ... ق ٣ وچوار سـلیان لای . رجا کین بوئما بنیرن و الا وکو غزتەکیان بونانیرین مجبور ابین بە مراجعت قانونی ولە غزیتا ناویان درج اکین .

زیان

---

مطبعة بلدیة سلیمانیە

بو همو شتیك
مخابرات بهناوی ادارهخانهوه
اکری
§
ادارهخانه لهبنای بلدیهدایه
عنوان : سلیمانی ژیان
یکی به آنهیکه

ئابونه
بهشش مانك پینج
بهسالیك ده روپیه دهدا
بو دره‌وه اجرت
پوستهی علاوه ئهکری
شش مانك کمتر ابونه قبول ناکری
اعلانات
دیریك ٦ آنه دهسیتریت
یکی به آنهیکه

هو شتیك آزادی سیاسی و اجتماعی دو جار دردهچی غزته یکی کوردیه

٢٢ جمادی اول ١٣٤٧ ٥ ت . ثانی ١٩٢٨ [ دوشمه ] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦

بهمناسبتی مفارقتی فخامت مندوب سامی عراق سیر هنری دوبس و تعیین فخامت کلبرت کلایتونهوه :

وه کو مدیریت مطبوعات رسما اعلان کردوه معلوم بوه کابم زوانه فخامت سیر هنری دوبس له عراق مفارقت اکات و له جی مشار الیه فخامت کلبرت کلایتون تشریف اهینیته عراق و او مقام عالیه اشغال ائرموی .

چونکه فخامت سیر هنری دوبس لهو مدهیهی که له عراقا تشریف ماوه تهوه کلی خدمتی سبقتی کردوه به لازممان زانی ترجمهی حالی فخامت مندوب سامی حاضری عراق و خیر الخلفی عرض قارئین کرام بکین

مشار الیه له ٢٦ اغستوس سال ١٨٧١ دا هاتوته دنیاوه و لهکلیهی ( دینیشتر ) دا تحصیل فرموه و لهویدا لقب ( ادیب ) ی وهرگرتوه و لهکلیهی ( برازنوز دا ) و ( اوکسفوردا ) تحصیل علومی تواو کردوه وله سال (١٨٩٢)دا چونه سلك مامور یتهوه و تشریف بردوته هندستان و له سال ١٨٩٦ دا تعیین کراوه به سکرتیر خاص حاکم ولایت غرب شمالیهی هندستان و هتا سال ١٨٩٩ دا هر لهم وظیفهیهدا ماوه تهوه و

ولهم تاریخهوه هتا سال ١٩٠١ له بلوجستانا خدمتی کردوه وزور مناصب سیاسیهی گورهی اشغال کردوه وله دوایی‌دا بو اوهی به تواوی وضعیت جغرافیا وتجارت وفلاحت نهر فرات له دجلهوه هتا کو اراضی عراق تی بکات تشریفی بردوه سوریه و له دوای سالیك له سال ١٩٠٢ دا تعیین کراوه به قونسلوسی سائستان وهری بغدادا چووه بو ایران ولهویشهوه له دوای سالیك تعین کراوه به قومیسر حکومت بریطانیا بو لجنهی تحدید حدود روسیا و افغانستان . ووکو الیعن له اثنای ام وظیفهیهدا له بین « هرات » و « کابل » و « هزاراجات » دا ریهکی دوزیوهتهوه که پیش اودا کس پیانهرویشتوه وله دوای ختام ام وظیفهیه تعیین کراوه به سکرتیر ادارهٔ خارجیه • وبه مناسبتی زیارت ملك افغانهوه بو هندستان مشار الیه بو اوهی ملاقات لهکلا غیر ری ممثل حکومت بریطانیا بووه • له دوای ئهمه بووه به قومیسر قضائی بلوجستان وله تاریخ ١٩١١ دا بو

عین وظیفــه نقل کرارە بو ولایت حــدودیهٔ غرب شمالی هندستان ولەویدا هتا ســال ١٩١٤ ماوەتەوە لەدوایی‌دا تعیین ڪکراوە بە قولــلوس دائمی بلاد بریستان وتورکیا •

و له اوائل حرب عمومی‌دا تعیین کراوە بە حاکم سیاسی بو سر ادارەی عراق لەگل اوردوی حکومت فخیمەدا وله دوایی‌دا دیسانەوە نقل کراوەبوبلوجستان ولەوید زور مقام عالی اشغال کردوە ولەسال — ١٩١٧ دا بوە به وکیل عام رئیس قومیسرە کان بلوجستان و له سال ١٩١٩ دابوە بەوزیر خارجیەی هند ستان وله ویشەوە تعین کراوە بە رئیس او وفدە کەلە هندستانەوە چون بو افغانستان بو حل بعضی مسئل و لەوظیفەیەیشدا هتا سال ١٩١١ ماوەتەوە . ومشارالیه لەتنظیم و اصلاحات ممالك مختلفەدا وقوفیکی تواو و یدیکی طولای هیەودو تألیفی بە قیمتی هیە یکیکیان له خصوص صنایع شوشەي هندستانەوە واوی تریشیان رومانیکي مهمە .

مشار الیه نیوی عمری خوی لەممالك شرقیەدارابواردوە و له ســال ١٩٢٢ نرراوە بوعراق و تعین کراوەبه معتمد سامی حکومت بریطانیا له عراقا

ماوتی

---

بو زانین همو قارئین کرام

معلوم همو قارئین و مشــتریه کرامەکانمانە کەله کوردستان جنوبی‌دا سلیمانی کە ماددتاوە کومری بکی عمومیەتی تنها ام غزتەیەی تیاانتشار اکات و چونکە اســباب و ادوات مطبعەکەمان ــــ نقصان بو لە هفتەی دفعەیك زیاتر قابل نەبو غزتەکەمان انتشار بکات لەبراوە ممکن نەبو همو حوادثیك و معلوماتیك لە وقتی خویا درج بکری .

حکومت محلیەو بالخاصە معاونت متصرف اگرمی مدرکی‌ام حالەو ام نقصانیتەی فرمو و بواستکمالی همونواقصاتیکی مطبعەکەمان لەگل بلدیە دامشورت فرمو و بە واسطەی همت مشارالیەو بلدیەوە بومان اکمال کرا و لە یکی امانگەوە هفتەی دوکرەت دەتوان دفعەیك و پینجشمو ان دفعەیك غزتەکان انتشار اکات . و طبیعی لەمودوا مطبعەکەمان مصرفیکی فوق‌العادە زیاتر بەناوی خذمت ملت و وطنەکەوە اختیار اکات لەبراوە رجا اکین لەمشتریکانمان کەمعاونتمان بفرمون ولە وقت و میعاد خویدا بدل ابونەی غزتەکە بەناوی بلدیەوە بومان روانە بفرمون و رجا یش لەمنورو عالم و فاضلەکانی کوردستان اکین کە لە خصوص ناردن مقالەی مفیدەوە معاونتمان بفرمون .

﴿ زیان ﴾

پاشماوەی بیاناتەکەی معالی امین زکی بگە — له خصوص معارفەوە •

ومکتبەکان قسم اولی ممکنەلە طرف وزارة معارفە وەانشا بکرین لەسر شکلیکی بسیط وبە مدەتیکی کم اگر کل سالیك نیو لك روپیەی بو تخصیص بکری وبە نظر تدقیقاتیکي خصوصی خومەوە کە لە بعضی اماکن‌دا کرد دومە اتوانم بلیم کە بو انشاء مکتبیکی اولی ممکنــە وزارة معارف له هزار روپیەوە تا ندو هزار صــرف بکات واگر بەواسطەي دائرەي اشغال عمومیەوە بکری اوسا مجبور ابی بو هر مکتبیك لە پازدوە هتا بیســت هزار روپیە صرف بکات و امل هیە وزارة اشغالیش لەمە ممنون بەبی چونکە ایشــە زورەکانی تخفیف اکات

فقط بو انشاء مکتبه کان قسم دوم وکو عادەتەهیچ باز تیك نیه له طرف دائرەی اشغاله وه بکوی بەشرطیك هەموسالیك لەلك ونیویك روبیه کتری بو تخصیص نکری به غیر امیش بو خزینه امه به صالحتر ازانم که بو تعمیرات مکتبه کان مبلغیکی مناسب له میزانیەی اشغال عمومیه ( لەفصل ــ ٩ ماده ــ ١ لەبو محافظەی ابنیەکان مبانی امیریه تخصیص کراوه ) توديي وزارەت معارف بکری خوی صرفی بکات . و اعتقادم وایه اکر ام مسئله بەنوعەی ئی بکری خزینه قازانجیکی زور اکات وایشی دائرەی اشغالیش کم ایتەوه .

واو وقتەی منلەمعارفا بوم طلب تخصیص چل هزار روبیەم کردبو بو انشاء مکتب دیهاتەکان بلام له میزانیه دا هیچ اثریکیم نەدی وادرا کەوي وزارة مالیه قبولی نکردبی ومحقق ام قبو نکردنەی زکو ضرەریکی کوره له معارف ادا ضربەیه کي زلیشه بو خزینه .

ماویتی

–١–

نەخوشی اجتماعیان ؛

سلسلەی مصاحبەیك :

منال بەخیو کردن و به رەسم هینان

مقدمه ، ایمه قوم بدبخت کورد له اثر مظاهر حیاتدا نەخوش ، ناتەواو ونقصانین یکون عموی ام نواقصه به یك کلمه قابل ادایه : تدنی ... هەروەك قوت عمومیەی ملتیك مجملەی قوای فردیەی افرادە. کەبی ، ضعفیت ملتیش نتیجەی بی‌هیزی ، کم و کوری افرادیتی . لەکل اوەی معترفم به کم قدرتی خوم فقط دیسان به وجیبەیکی ملی ازانم . اوەی باشه لام و به خاسو ، ایلیم به صورت مصاحبه عرض هاوخوینه محترمه کانمی بکەم :

مشکلەی نفوس ، بی کیالدنی منال تربیەی نسل اتی امرو یکیکه لەمشاکل حیاتیه .

لەوساوه بشر له ماضی خوی برداوه ورو به استقبالی تی اکوشیت ، تکثیر نفوس ، تربیەی اولاد بەبی بی کیاندنی دایك وباوك وبی علت سبه‌ بی — بوه به یکی له عمدة اساسیەی ژیان وبه هدف جهد و تی کوشین .

به کال اسفەوه ایلیم که ام مسئله حیاتیه هیشتا له ناو ایمەدا موقعیکی مخصوصی پی نەدراوه وهاوتا جلب دقت ابوی هیچ نەکردوه .

هرچند ایستاتستیکی منتظمیه فقط به تواری که به شرعیش دلیلیکی مقبوله — بومان معلوم ایبت سلیمانی ، لەوساوه له دول وجەی قلاچوالان مرکز حکومت کواستراوەتەوه وهینراوەته ام دشته بەاعتبار عمرم هیچ زیادیکی محسوس لی نەبینراوه .

له احتلال تورکیاوه هتا ایستا که نزیکی عصریکه به نسبت جیکایان تەوه ایجابی اکرد سلیمانیش اقلا امرو شصت هزار نفوسی بوایه والحال نتیجەي تسجیلی سال — ٩٢٧ حقیقا موسف وعبرة آوره بەهمو مسافرین و عسکرەوه نفوس شارعبارت بو له ( ١٧٠٠٠ ) وکسور

ماویتی

## هەوالی دەرەوه :

### تاهل ولی عهد ایران

طهران — به تایید معلوم بوه که جلالت رضا خان خوازبینی یکی له کچەکان ملك افغان کردوه بو کوره کەی که ولی عهده و ناوی ( رضا خان صغری ) به و ملك افغانیش موافقتی کردوه . و دائرة بلاط ایران

خریکی تدارکاتن و ام تاەلەلەم بوارەدا ابی وکیج و کو ره کە هردوکیان عمریان لەچوارده سال زیاتر نیە .

حرب یمن

حدیده ــ کوران امام یحیی کە احمد و محمد سیف الاسلامن بە قوەتیکی زورەوە چونە سر قبیلەی زرانیق کە اغتشاش و نورەیان کردوە مقابل بە ملك یمن و لەدوای شریك بەشدت مشارەکەفراریان کردوه و رئیسەکیان کە شیخ احمده خوی خستوتە ناو وایورە یکەوه و اوانی تریان همو دخالتیان کردوه بە ملك ابن السعود . و لەم حربەدا احمد بن قیس کە یکیکە لە کورە اردوی متوکل کوژراوه .

ولی عهد عراق

ولی عهد خوشەویست عراق امیر غازی بە طیاره موصلت عراق فرموه و لە محطەی طیران بە صورتیکی فوق العاده استقبال کراوه .

تکذیبیکی رسمی

مدیر مطبوعات رسما اعلانی کردوه کە او خبره دروە کە غزتەی العراق نشری کردوه و الی ایستا لە بین حکومت عراق و بریطانیادا مفاوضه جریان اکا .

تنفیذ قانون اساسی چین

نانکینك ــ تانیکای رئیس سلطەی تنفیذیەی چین لە گل دە وزیر رفیقیا سوندیکیان خواردوه کەلە همو خصوصیکەوە رعایت قانون اساسی بکن فقط ( شیانغ کاشیك ) رئیس جمهور چین امری داوه کە سوینکەکە بە عباراتیکی جوان وجدی بخون کە همو معنایەکی استقامت و شرف و ناموسی تیا دەرکەوی .

بین نجد و عراق

بغداد ــ وا در اکەوی کە علاقات بین عراق و نجد لە چاك بونایە ومعلوم بووه کە طرفین میلیان پیدا کردوه بوحل او مسألانەی کە بوە بە سبب ضدایەتی بین .

حکومت حجاز

جده ــ لەسر اوەی کە طیارە حکومت بریطانیا بەبی مأذونیت بەسر حجاز ( ونیك ) دا آمدوشدی کردوه حکومت حجاز پروتستوی حکومت بریطانیای کردووه .

منع بولشویکەکان

لە وظائف حکومتی دا

لندن ــ مجلس اتحاد عمال اجتماعی کردوه لە سر مسئلەی یکی لە مهندسە میکانیەکان بریطانیا کە لە اسکلەی [ وولویك ] ایش اکات ولەبر اوەی مسلکی بولشویکی گرتووه حکومت لە وظیفەکەی استغنای . ولە دوای اوە کە مجلسەکە تماشای مسئلەکەی کردووه بەرسمی بوی معلوم بووه کەحکومت بە رسمی قراری داوه کە اوانەی مسلکی بولشویکیتیان هیە لەخدمات حکومتیدا استخدامیان نکن .

الا وقتیك استخدام اکرین کە واز لم مذهبە بینن . ومجلس اتحاد عمال قراری داوه کە حقیقت مسئلەکە لەگل حکومتا تحقیق بکات .

رویشتن

سعادة مفتش اداري و رفیقەی محترمه میس لاین تشریفیان بردوتە بغداد .

مطبعه بلدیه سلیمانیه

بو همو شتیك

مخابرات بەناوی ادارەخانەوە

اکری

§

ادارەخانە لەبنای بلدیەدایە

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی بەآنەیکە

# ژیان

هەمو شتیك اوسی هفتەی دو جار دردەچی غزتەیکی کوردیە

کریار

بەشش مانك پێنج

بەسالیك دە روپیە دەدا

بە دروەوە اجرت

پوستەی علاوە ئەکری

شش مانك کمترابونە قیدناکری

اعلانات

دیریك ٦ انە دەمیزیت

یکی بەآنەیکە

٢٥ جمادی اول ١٣٤٧   ٨ ت ٢٠   ١٩٢٨   [پنجشمە]   تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦

پاشماوەی ترجمەی حالی نخامت مندوب سامی

مشار الیه کە لە سال ٩٢٢ دا تشریف هیناوەتە عراق هر چند حکومت عراق تازە تشکیل کردبو فقط هیشتا لە حالیکی ابتدائی و غیر مربوطابو بەواسطە دهای خارقە و معلومات مشار الیەوە ئە لە تشکیلات و لە انتظام پی دانی ادارەدا هیەتی بە مدەیکی کەم عادتا عراق وکو حکومتیکی مدنی هزار سالەیی لی کرد لە خصوص ادارە و اقتصادیاتەوە اصلاحاتیکی تواری تیا فرمو و لە خصوص تشکیل مجلس تاسیسی و تنظیم قانون اساسی عراقەوە همتیکی فوق العادەی نواند و هم سەبەرە معاهدەیکی دوستانەتی و مشفقانەی لە بین حکومت بریطانیا و عراقدا عقد فرمو و بوتاسیس و تمدید خطوط تلغرافیە و دانانی پوستەی منتظم و ارتباط همو انحای عراق بە یکەوە و تمدید خط شمند وفرلە اکثر محیط عراقا و امتیاز و کشف معادن و تشکیلاتیکی واسع صحیە و تشکیل غرفەی تجاری و هلی اماماتەوە کە هموی بوە وایی بە سبب ترقیکی فوق العادەی عراق بذل مساعی فرمو .

وهم سەبەرە محبتیکی صمیمی مقابل بە حکومت فخیمة بریطانیا ومسایە مشفقەکەیان خستە دلی همو عراقیەکەوە و او اغتشاش وتجاوزاتەی کە لە اثنای تشریف هیناییا لە حدود شمالیەی عراقا موجود بو بە مدەتیکی کەم رفع و امنیت واسایشیکی کاملەی لەویدا تاسیس فرمو .

ومشار الیە غیر ام همو خدمتانە بو تامین دوستایەتی بین عراق وحکومتە مجاورەکانی زورهمتی فرموە ولە وقتیکا کە ولایت موصل لە طرف تورکاکانەوە موضوع بحث بو و ایان گوت لە داخل میثاق ملی تورکیادایە . بو مدعە انفصال ومربوطیتی ام ولایتە بە عراقەوە بە واسطة حکومت مربوطەوە لە عصبة الامەدا سعی فرمو ونتیجە بو اوی تماشای وضعیت جغرافیا ، تجارت ، عنصر ، طرق مواصلات واستفتا لە ملتەکەی ام ولایتە بکن . جمعیت عالی عصبة الامم لە وکالت خویەوە هیئتیکی تعیین وناردی بو ام ولایتە بە قیمتە کە طبیعتا ولە همو خصوصاتیکەوە بە جزئیکی لایتجزی عراق خلق کراوە . لەگل مواصلات هیئتە

کەدا بو اوەی حق وحقیقت تظاهر بکات و ام ولایتە بە قیمتە لە عراق جیا نەکریتەوە . وزوری بو اوی حقوق کوردەکان جنوبی محافظـە بکری وبکەونە ناو محیطیکی حر وسربستەوە . بوحصول ام غایەیە بەهمو قوەتیەوە جهدی فرمو .

ماریەی

نەخوشی اجتماعیمان ؛

مسالەی مصاحبەیك :

منال بە خیو کردن و بە رەم هینان

پاشماوەیە

نفـس شـار کە تقریبا بە نظر لادیوە مدنیت و علمیکی هیە بەم نوعە لە ظرف ام مدتە مدیدەدا — عصریك !! — لەحال جوددا مایتەوە آخو لادیبە هزارەکان چی بن وچیبان بەسـر هاتبیت . ایتالیا بە سـبع ام مدتە نفوسـی تضاعف کرد . لوندرە بە ٣ چوار سالیك دو ملیون زیادی کرد . لە همو اوروبا تنها فرانسە مردن وزانی لە نسبتیکی متساویەدایە .

محتملە ، گرانی ، غاربە ویا زن نەهینان ورشاد نەوە بە سبب زیاد نەبونی نفوس پیشان بدریت . فقط مسئلە امە نیە . چونکە گرانی ومصـائب سائرە عادتا عمومیە وهمو ملتیك بشـدارە لی . امینیتەوە سـر زن نەهینان ، همو ازانین حتی حمالیك کە واردات روزانەی عبارتە لە هشت انە موافق حال و اوضاع مالوچکەیکی پیکەوە ناوە بوخوی وصاحب خیزانە .

بناءعلیه عامل اسـاس کم بونەوە ویا فرە نەبونی نفوس امانە هیچی نیە . اول و اخر منال بەخیونکردن برهم نەهینانە . بومقایسە تولدات ووفیات نفس شار

لە ٣ سالی رابوردو بروجهی آتی پیشان ادەین .

| سال | تولدات | وفیات | وفات یك هتاچوارساله |
|---|---|---|---|
| ٩٢٥ | ٥٣٨ | ٣٠٤ | ١٧١ |
| ٩٢٦ | ٤١٩ | ٣٥٣ | ١٥٨ |
| ٩٢٧ | ٤٦٧ | ٢٠٣ | ٦٤ |
| | ١٤٢٤ | ٨٦٠ | یکون ٣٩٣ |

بەم ارقامە بومان معلوم ابیت کە نسبت تولدات بە اعتبار نفوس شار لە صدا ٤ ، ٨ ، وفیات لە صدا پینجە و کذا بومان معلوم ابیت روز بە روز تولدات لە تناقصدا یە فقط وفیات هر عین نسبت خوی محافظە اکات .

اصل نقطەی مهم اوەیە کە لە وفیات عمومیەی ام سە سالە ، صدی ٢ ، ٤٣ ی منال یك سالان هتا چوار سالانە . معلومە طبیعت بە قانونیکی ازلی ، اختیاری محکوم مردنی طبیعی کردوە فقط منال ، کە حق ژیانیکی ٦٠ سالەیە — علی العادە — نابی بەم نوعە نیوەیان بی اوەی بە چاویکی هوشیارانە دنیا ابینن ، بمرن بناء علیه مردنی امانە بە قوەتیکی طبیعی ناقصدیە و بەم ایستاتستیقە جزئیە بومان معلوم ابیت کە برامبر بە منالان چندە بی قیدین ، علاوتا لازمە بیانی بکەین ملیانی نابی بکریت بە واحد قیاسی بو لادی ، چونکە احوال منال لادی همو ازانین چیە و چون پی اکەن بە قطعیتەوە اتوانم بلم منالیکی لادی پی هتا نەبی بە هزدە سال و شرعا مجبورنەبیت بەرفع جنایت وجودی او نایەنیت .

زور جیکەی اسفە منالیك کە باوك بەم همو هیوا وامله ودایك بەهمو اذیت فقط مشقە وەیهیناتە دنیاوە ؛ پیش پی کرتن بی بە قوربان جهالت بەین ویا داو ودرمانی پروپیرتر

دایك لە جیاتی ئەوەی پاش ناشتنی وجود گور بە
و پی نە گەیشتوی منالەکەی بکری و بیلاریتەوە و باوك
لە جی ئەوەی بو هول شەوەی جیاتی اهلی تاز هل بکیشیت
لازمە لە حین حیاتیدا تەختی زیاتر بە دقت بن بو محا.
فظەی صحتی و امیالی بەسەر و بن ، ملاویای بە ترسان
زحیری بە بون کوتن نەوانن ، یعنی اقلا باخەوانیك
چەند لە کل چنار و یا دار هنار یکدا خریك ابیت دایك
و باوکیش اونده لە کل امنمامە جوانەیاندا مشغول بن .

لە خاتمەوە : واجبە همو بزانین کە لم عصرەدا پی.
گیاندنی فردیك ملت وەك دانانی بردیکی کورە و محکی
بناغەی بنایك وەهایە .

ر ، ن

---

## هەوالی دەرەوە :

### وزیر مفوض بریطانیا لە حکومت ایرانا

لندن ــ جلالت ملك بریطانیا مساعدە فرموە کە
سر روبرت کلیف وزیر مفوض بریطانیا لە حکومت
ایرانا ، بە مناسبتی سفریەوە بو ایران ملاقاتی لە کلا
بفرموی .

### شهزادە محمد شوکت بك

بغداد ــ لە نەتەوەی خاندان ال عثمان شهزادە
محمد شوکت بك کوری سلطان رشاد لە کل دو افرت
ال عثماندا تشریف هیناوەتە بغداد .

چونکە معلوم بوە ام شهزادانە فلاکتزدەن صاحب
حمیتەکان بغداد خریکن میوانداری و معاونتیکی فوق
العادەیان بفرمون .

### طاعون لە چینا

پکین ــ بنا لە تلغرافاتیك کە وارد بوە معلوم بوە
کە علت طاعون لە بیست شار چینا موجودە ، و لەبر
اوەی حکومت ناتوانی بە تواوی چارەی بکات زور
تاثیری کردوە .

—)§(—

### ضابط اوردوی افغان

استانبول ــ لەو طلبانەی کە حکومت افغان بو
تعلیم عسکری ناردونی بو استانبول هنا کو ایستا پنجا
ضابطیان بە تواوەتی تحصیلیان تواو کردووە . و
لەمانە قسمیکی زوریان لەکل آفرت تورکیادا تأهلیان
کردوە وگراونەتەوە بو افغان .

### ریاست جمهوریەتی امریقا

واشنطن ــ لە انتخابات رئیس جمهوریت امریقادا کە لە ٦ تشرین ثانیدا اکری وا دەرکەوی کە
مستر هوفر اکثریت احراز اکات و ابی بە رئیس
جمهوری امریقا .

---

### مستر بولدوین

لندن ــ مستر بولدوین انتخاب کراوە بە رئیس
جامعەی (کلاسکو) ولەم انتخاباتەدا ٦٦ رای لەهەو
کس زیاتر ورکرتووە .

---

### لە ایطالیادا حفلە

روما ــ بەمناسبتی شەشەمین سال نظام فاشیستی-
یانەوە لە ایطالیادا حفلەیکی فوق العادە کراوە . بنا
لە نطقیك کە سنیور موسولینی داویەتی دەرکەوتوە کە لەم
شش سالەدا لە جاران زیاتر ٢٨٠٢ مشروع مهم کە
خدمت وطن ایطالیا بکات تأسیس کراوە .

**حوال داخلی :**

ارادەی ملکي

بغداد ـــ ارادەي ملکي صادر بوە بو سوق تقاعدی قاضی محکمەی کوی جناب ملا محمد افندی و قاضی شرعیەی زاخو جناب محمد خالد عبد الحکیم افندی و حاکم صلح هلبجه محمد عارف افندی .

ارادەی ملکي صادر بوە بو تعین شیخ مصطفی افندي قرەداغی قاضی کرکوك بو حاکمیتی صلح و شرعیەی محکمەی زاخو .

ارادەی ملکي صادر بوە بو ترفیعي محترم صالح زکی بك حاکم صلح سلیمانی بو حاکمیتی حاکم مدنیه .

محترم توفیق افندی حاکم صلح چمچمال نقل کراوە بو حاکم صلح محکمەي هلبجه .

مستشار عدلیه

بغداد ـــ معالی مستر درآور مستشار وزارت عدلیه به مناسبتی تواو بونی مأذونیتەکەیەوە عودتی بغدادی فرموتوە .

مجلس مبعوثان

له ١ کانون تشرین ثانی ٩٢٨ دا مجلس مبعوثان به صورتیکی اعتیادی اجتماعیان فرموە .

له بین عراق و سوریەدا

بغداد ـــ له بین عراق و سوریەدا هیچ غائلەیك نماوە و امنیت و آسایشیکی تواو هیه و قافلەی اوتوموبیل سربست آمدوشد اکات .

رحمت

چوار پنج روژ لەمەو پیش وەکو ایرەدا له اطراف خواوە رحمتیك باری و پلەی دا له اکثر انحای عراق قیشدا ام بارانە باریوە وبالخاصه له بین کرکوك و خورماتو ، کفری وقرەتپان و اوشنەدا به صورتیکی مدهش ام بارانە باریوە هرچاند له جادە وریکاکانا بعضی تخریباتی کردوە فقط چونکه له میعادی خویایو بو فلاحت نعمتیکی گورە و رحمتیك بو .

—)§(—

## هاتن و روشتن

سعادت مفتش ادارەکان و رفیقەی محترمەی میسس لاین کەنوسیبو مانتشریفیان بردوتە بغداد دوینی ایواری بەسلامتی عودتیان فرموەوە .

محامی رفیق توفیق افندی بو رؤیت و تماشاکردنی بعضی دعاوی له کرکوکەوە تشریف هیناوەتە سلیمانی .

لەبگزادە و معارف جاف محترم حسن بك کوری علی بك له هلبجەوە تشریفی هینایه ایرەو له دوای سه ـ ٣ روژ حرکتی فرمو بو بغداد .

له سادات سرکلی محترم شیخ عبدالله عسکر بو ایشو کاری خوی له قامەسیوکەوە تشریف هیناوەتە سلیمانی

له رؤسا و بگزادەی لەعون محترم قادر بك جعفر سلطان بو ایشو وکاری خوی لەطویلەوە تشریفي هیناوەتە سلیمانی .

## محامی رفیق توفیق

مرکزی له کرکوکه ، ایرەش له دائرة بلدیەی سلیمانی شعبەیەکی کردوتەوە همو تحریر دعوی و دعاوی استئنافیه قبول و مسائل تمیزیه تعقیب اکات ، له کرکوك بەخوی و ایرە به واسطەی معتمد علی کمال افندی بابیر اغاوە مراجعتی پی اکری .

مطبعة بلدية سلیمانی

بو هەمو شتیك
مخابرات بەناوی ادارەخانەوە
اکری
§
ادارەخانە لەبنای بلدیەدایە
عنوان : سلیمانی ژیان
یکی بەانەیکە

کریار
بەشش مانك پێنج
بەسالیك دە روپیە دەدا
بو دەرەوە اجرت
پوستەی علاوە ئەکری
شش مانك کرابونە قیدناکری
اعلانات
دیریك ٦ انە دەسیتریت
یکی بەانەیکە

هەمو شتیك اوسی هفتەی دو جار دەردەچی غزتەیکی کوردیە

۲۹ جمادی اول ۱۳٤۷ ۱۲ ت ۲ ۱۹۲۸ [دوشمه] تاریخ انتشار ۲۱ کانون ثانی ۹۲٦

ترجمەی حالی نجابت مندوب سامی

پاشماوەیە

* * * *

لەگل مواصلت موصلیاا غیری اوەی کەلەگلیانابن و بو اوەی تمثیل حکومت عراق و بریطانیا بکن چند رجالیکی سیاسی و مقتدر و شارەزای وکو معالی میجر ادمونس ، میستر جاردین ومعالی صبیح نشئت بکی تعیین فرمو . و نجابتیشی بالذات بو اوەی هیئتەکە تنویر بکا و هەمو وضعیت ولایتەکە و فکری ملتەکە یان تی بگ بنی تشریفی بردە موصل هر وکو هیئتەکەی تنویر فرمو بو خاطری وقوعات و معاملەیکی خراپ روینەدا و بو اوەی هیئتەکە لە هەمو محیط ولایتەکەدا سربست بگرین تحقیقات و تدقیقات بکن لە هەمو قطر یکی ولایتەکەدا بو ترتیبات لازمە اجرا کردن امری اصدار فرمو .

نتیجە ـ لەدوای تدقیقاتیکی دور و دریژ لە رئیس و اعضایان محترمەی عصبة الامم‌وە ( چون روژ اشکرایە ) وا مسئلە تحقق کرد ر بە قرار جمعیت عصبة الامم ام ولایتە کە وکو اعضایکی مهمی لشی عراقە اولا بە واسطای حق و حقیقتەوە و دوم بەواسطەی مقرراتی مصیبەی مجلس عالی عصبة الامم‌وە سیم بە واسطەی سعی فوق العادە و دهای خارقەی مشار الیەوە جیا نکرایەوە و ربط کرایەوە بە حکومتەکەی خویەوە کە عراقە .

غیری امیش بو اوەی کوردەکانی جنوبی لە ترقیات محروم نەبن و عنعنات ملیەیان باقی بی بە واسطەی ام مسئلەیەوە بە قراری عصبة الامم بە واسطەی تشبثات و همتی مشار الیە سیر هنری دوبسەوە بعضی امتیارایان درایە کەلەگل عراقا بە یکەوە بژین .

مشار الیە لەدوای مقررات عصبة الامیش بەمە اکتفای نکرد بو خاطری مسئلە هر بە دوستایەتی بەبرینەوە و لە بین تورکیا و عراقا هیچ دشمنایتیك نەمینی و ام دو حکومتە اسلامە وکو برا دوست بن لە خصوص ام مسئلەیەوە بو عقد اتفاقیکی دوستایەتی بە واسطەی ( سفیر عالی حکومت بریطانیا لە تورکیادا ) سعی فرمو وخوی بالذات تشریف بردە انقرە . نتیجە بە قطعی و بە رضای تورکەکانیش ام ولایتەی مربوط عراق

فرمو و دوستایتیکی ابدیشی له بین تورك و عراقدا تأمین فرمو .

وله دوای ام مسئله یش هر بو حسیاته عالیه‌وه بو ترقی‌وتعالی عراق دائما جهد وتوششی فرموه وبو دوستایه‌تی بین عراق و نجد وعراق و ایران زور سعی فرموه . واتوانین بلین‌موئسس حکومت عراق تنها‌ هر مشار الیه .

له‌بر ام‌همو خدماته عالیانه‌ی که‌بوی فرمو ن له‌غیبوبتی مشارالیه همو عراقیك جدا متأثره فقط امید بەوی که اگر له‌دوریشه‌وه بی به‌عین حس متحسس ابی وداٸما تماشای ام‌حکومته افرموی کەخوی موجدیتی وبم سببەوه نختی تأثره کەمان تهوین ابی .

امید اکین هتا نهایت داٸما لەمسعودیتا بی . وبەدل و به‌گیان تمنای تمادی موفقیتی اکین .

---

### ترجمه‌ی حالی مندوب سامی تازهٔ عراق
### لهخامت معتمد سامی تازهٔ عراق

فخامت سیر گیلبرت کلایتون که له دوای مندوب سامی حاضر تشریف اهینی‌ته عراق و مقام‌عالی معتمد سامیتی عراق اشغال اکات . مشار الیه له ٦ تموز سال ۱۸۷۵ هاتوته دنیاوه وله‌کلیهٔ جزیرهٔ [ وایت ]دا تحصیل کردوه وله مکتب [ وولویچ ] دا تحصیل علوم عسکری تواو کردوه .وله سال ۱۸۹٥ دا داخل اوردوی بریطانیا بوه وله سال — ۱۹۰۱ دا بووه به کاپتن وهتا ۱۹۱۰ له اوردوی مصردا خدمتی کردوه . وبینیکیش له حکومت سودانا مستخدم بوه وله هجوم سال ۱۸۹۸ تیادا زور شجاعتی نواندوه وخدمتی سبقتی کردوه وحتی بم سببەوه ناوی له لیسته‌ی قوماندان عمومی بریطانیادا مقید بووه . و چند سال مدیر عمومی استخبارات مصر وسودان بوه . ومقابل به خدمات فوق العاده‌ی له طرف حکومت فخیمه‌وه به ۳ نشان تلطیف کراوه وحتی کرەت ناوی له تلغراف تقدیراتا قید کراوه . وچند مدت هتا ۱۹۲۲ مستشار وزارهٔ داخلیهٔ مصر بووه وله دوای ام تاریخه بوه به معتمد سامی حکومت بریطانیا له فلسطین . وله طرف حکومت تورك وایران وچند حکومتی ترەوه به چند نشانیك تقدیر وتلطیف کراوه . وله طرف حکومت مصرەوه لقبی پاشایەتی دراوه‌تی .

وچندجاره بو حل‌وفصل بعضی مسائل جزیرة العرب له‌طرف حکومت بریطانیاوه به تمثالی تعیین کراوه .

ومشار الیه له مستشرقین مشهوره وخصوصا له‌وانه‌یه که وقوف ومعلوماتیکی کامله‌ی هیه به سرحدات عراق . وزور شارەزای همو خصوصاتیکی نجد و جلالت ابن السعوده . خاصه له کافهٔ انحای عربیه‌دا معلومات و اختصاصیکی فوق العاده‌ی هیه ومشار الیه چونکی مدتیکی زور له ناو ملتی عربابووه و افکاری شرقه وبالخصوص زور بو ترقی وتعالی ملت عرب و ساٸر مللی مظلومه‌تی کوشاوه معلوم ومحققه که لهم موقعه عالیه‌یشا که اشغال افرموی به پیروی سلفی دوره له عراقیشا خدمات فوق العاده‌ی سبقت اکات و ابی به واسطه‌ی تجدید رابطه‌و محبتیکی ابدی بین حکومت بریطانیا وعراق و امیدا کین و کو جیکاکان که‌له‌عراقیشا ناویکی مقدس و ابدی بوخوی بجی‌بیلی . وبه‌واسطهٔ مشار الیه‌وه عراق زیاتر نائل سعادة بنی .

### هەوالی دەرەوە :

* * * *

### هەرە‌کانی ایران ترك اکن

له تلغرافات عمومی لندنەوە

٣٠ ــ ١٠ ــ ٢٨

بصره ــ او هەرەبانەی کە لە مجبرە بون حکومت ایران حکم لی کردون کە لازمە شاپقه و لباس پهلوی لە بەرکەن لە بەرامەوەی معارضەی ئەم ئەمرەیان کردوه ، قسمیکی لە اراضی ایران دەرکردون و لەمانە بعضی علما یان مواصلات بصرەیان کردوه و لە طرف بصرییەکانەوە اکرام و تلطیف کراون .

---

### یونان لەگل دراوسێکانیا

اتینه ــ اجاره وەبزەلوس لە بروضرام اجماع اول مجلس مبعوثانا بیانی کردوه ئەحری کە معاهدە لە گل تورکیا ، بلغاریا و ارناوودا بکات .

---

### مجلس مبعوثانی ایران

طهران ــ بە مظاهرەیکی گورە اجارە مجلس مبعوثانی ایران اجماع کردوە و رضا خان لە نطق افتتاحی دا اشارەت کردوه کە حال حاضر مناسبت بینی ایران و تورکیا ، افغان ، روسیه و انکلترە زور باشه و کو تورکیەی بە حقی ایرن لە خصوص الغای امتیازات اجانبیشەوە موفق ئەبی ، و ئەولین وزارة حاضرە ایرانیش خەریکی لائحەیە کە بو کردنەوەی مجلس اعیان .

---

### حدود تورك و سوریه

بیروت ــ چند ضابطیکی تورك مواصلات حلب یان کردوه بو خاطری لەگل فرانسەکان مشورت بکن بو نەمانی او اغتشاشە کە لە حدود طرفینا هەیە ، لە دوای مذاکرە هەردولا قراریان داوەکە متقابلا سعی بکن بو گرتنی او اشقیایانەی کە دام اغتشاشه ئەکن .

---

### بین تورك و بلغار

استانبول ــ لە بین انقره و حکومت بلغاردا دەست کراوە بە مذاکره بو عقد معاهدەیکی ضمانت و ام ریك بونەوەی بلغاریە تورك بە مقابلەی نزیك بونەوەی یونانەوەیە بە صربیه .

---

### لە بین حدود سوریە و تورکیادا

بیروت ــ عشائر و اشقیای بین حدود سوریه و تورك زور بە شدت هجوم ئەکەنە سەر یەك و تالان یەکتری ئەکەن .

---

### حقوق ژنی فلسطین لە انتخاباتا

قدس ــ موافق قانون بلدیەی ( مل ایب ) ژن حق هیە ئە انتخاب بکات و انتخابیش بکریت ، حقیقتا امە خطوەیکی تجددە بو ترقی فلسطین .

### حکومت بولشویك و امریقا

برلین ــ غزتەکان امریقا الین حکومت بولشویك تبلیغی وزارة خارجیة امریقای کردوه کە بولشویك حاضرە لە خصوص قرض پیش حرب امپراطوری روس مفاوضە لە گل حکومت امریقادا بکات .

---

### اغتشاش لە ایرانا

لندن ــ غزتەی دایلی نیوز تلغرافیکی نشر کردوه کە لە مخبری استانبولیەوە ورگرتوە الی لە اکثر شارە گورەکانی ایراندا لە خصوص تطبیق و عدم قبولی تجنید اجباری یەوە اغتشاش هیە، وبالخصوص لە مرکز آزربایجاندا کە تبریزە ام اغتشاشە زور گورە بوو .

اعتراف ملکیت احمد زوغو بك

برلین ـــ ایطالیا زور سعی اکات بو اوەی کە حکومت تورکیا اعتراف بە ملکیت احمد زوغو بکی بملك ارناوت بکات .

---

شاه ایران لە عبادانا

عبادان ـــ رضا خان شاه ایران مواصلت عبادانی فرمووە وبە صورتیکی محتشم استقبال فرموزارە و شرکت نوت انکلیز وفارس دعوتیکی منتظمی بو کردە و لە حفلەی انشا کردنی شمندوفرەکەیا شاه بە دست خوی اول بردی داناوە .

---

اختراع ایرانیك

طهران ـــ وزارة معارف ایران لە سفیری ایران واشنطونەوە تلغرافیکی ورگرتوە الی لە تبعەی ایران احمد خان کەلە مکتب هندسەدا اخوینی ولە فابریقەی (فورد) دالیش اکات اعبارە اختراعیکی مهمی کردوە لەبر اوە زور مهم بوە لە امریقادا بە اسمی خویەوە قید کراوە . اختراعەکەی : امەیە کە اوتوموبیلیکی درست کردوە حوار صد کس اگری وبە ساعتی پنجا میل سرعت اتوانی بسر هەمو شاخێکیدا هەڵ بکری .

---

ممثل عراق لەمصرا

قاهرە ـــ رشید بك الخواجەی ممثل عراق لەقاهرەدا زیارة وزیر خارجیەی مصری فرمووە و خریکە اعتماد نامەکەی تقدیم جلالة ملکی بفرموی

مجلس مبعوثان

بغداد ـــ مجلس مبعوثان عراق روزی پنجی امبانکە اجتماعیان کردوەو ارادەی ملکی خوینراوتەوە لەخصوص تأجیلی مجلسەوە بو (٤٥) روز .

---

حوادث داخلی :

لەغزتەی پیشو لە قسم هاتن و رویشتنیا نوسیبومان کە سعادت مفتش اداری و رفیقەی محترمەی لە بغدادەوە عودتیان فرمووەتەوە سهواً تلقی کرابو ، موسی الیە و رفیقە محترمەی میسیس لاین پیری ایواری عودتیان فرمووە .

---

حفیدزادە محترم شیخ عبد القادر افندی کە پینیك لەمو پیش تشریفی بردبوە سکیمر ، دوینی ایواری عودتی فرمووە .

---

لە خاندان ورؤسای طالبانی محترم شیخ حبیب افندی وشیخ قادر افندی بو چاوپێکوتنی سلیمانی و احباب ودوست . ومحترم ملا عبد الله در افندی ناظر اوقاف منطقەی کرکوك سلیمانی هەوایر بو تماشاکردنی ایشوکاری اوقاف دوینی ایواری لە کرکوکەوە تشریفیان هیناوە سلیمانی . ولە مالی حفید زادە محترم شیخ قادر افندی میوانن .

---

مامور مرکز کرك سلیمانی محترم امین بك کە بە ماذونیت مانگیك تشریفی بردبوە بغداد لە دوای ختام مدة ماذونیتەکەی پنج شش روژ لەمەو پیش عودتی کردوە .

---

مامور مخابرەی سلیمانی محترم شاکر افندی بە مناسبتی تحویلی بو رواندوز پری بەعائلەوە حرکتی فرمو بو محل وظیفەکەی .

درسی الیە لەو مدەیەی کە لیرەدابو بە سبب حسن اخلاقیەوە خوشەویستی هەمو ماقەکەبو . ولە جی شاکر افندی ندیم افندی مامور پوستەی رواندز تعین کراوە .

---

بو مشترییە کرامەکانمان

آخر استرحامان

رجا اکین ایتر میدان بعضی معاملە مدن وعبوری مان مکن بە نشری اسم ومراجعت محکمە . بە ناوی بلدیەوە زو بدلی آبونەکانتان بو بنیرن .

---

مطبعة بلدیة سلیمانی

بو هەمو شتیك

مخابرات بەناوی ادارەخانەوە

ئەکرێ

§

ادارەخانە لەبنای بلدیەدایە

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی بە آنەیکە

# ژیان

غزلیتە

هەمو شتیك اوسی هفتەی دو جار دەردەچی غزتەیکی کوردیە

ئابونە

بەشش مانك پانج

بەسالیك دە روپیە دا

بو دەرەوە اجرت

پوستەی علاوە ئەکرێ

شش مانك کمترابونە قیدناکرێ

اعلانات

دێریك ٦ آنە دەسیتزیت

یکی بە آنەیکە

۲ جمادی الاخر ۱۳٤۷   ۱۵ ت ۲۰ ۱۹۲۸   [پنجشمە]   تاریخ انشاء ۲۱ کانون ثانی ۹۲٦


نەخوشی اجتماعیمان :

بی قراری ، بی عزمی

* * * *

زمان کورراوە ، امرو فردیکی خوێندەواری اقصای شرق لە احوال روژنامەی ئەوپەری غرب اگادارە ، و بەسبب ئەم کثرت معلوماتەوە هەمو روژی تی ئەگەین کە « نوبیلی » و یا « بیرد » عزم سیاحت و کشفیاتی قطب جنوبی یا شمالی ئەکەن . و بەرامبەر بەهەمو مهالکیکی محقق و یا ملحوظ ئەم قرارەی خویان تیك نادەن و حتی المقدور ـ بعضا فوق المقدور ـ بو تطبیقی جهد ئەکەن ،

لام وایە هەمو فردیکی تی ئەگەیشتوی کورد لە ئەم شدت عزمە و قطعیت قرارە لە ملل غربیدا ابینێ ، کم و زور اختیاری و یا غیراختیاری ئەکەونە مقایسەوە لەگەل هی خویاندا ، فقط نتیجەی ئەم مقایسەیە ـ طبعا ـ تاثر ، یاس و تحسرە ،

ئەمرو ، کە روژی تیهەلچون ، جسارت ، مدنیە و قطعیت قرارەوە . و یکانە خاصەی تمایز و تفوق ملتیك ئەمەیە ، مع الاسف ام خاصة جوهریە لەناو ایمەدا بە اعتبار عموم نیە ،

بەپێی تصنیفیکی اجتماعی کە تازە علمای اجتماع کردویانە : بشەر تابع دو مذهب ، اصول و یا طرز حیاتن : طرز اشتراکی ، طرز استقلالی ،

مع الاسف ، ایمە وەك اکثریەیکی طبیعت خاو. جی ام دو صنفە ماوینەوە ، نە تربیەیکی « استقلالی » « انفرادی » وەامان هەیە کە عند الایجاب فردیکمان بەخویدا رابەرمو یت ، قرار و عزمی شتیك بکات و بیهینێتە حیز فعلەوە . و نە تربیەیکی « اشتراکی » « کومەلی » وەامان هەیە کە ۱۰ ، ۱۵ و یا ۲۰ کسمان بو تطبیق غایەیکی مشترك بو خویان قرار بدەن و بو گەیشتن بەم غایەیە هەول بدەن ،

هەروا لە بیرمە لە ۹۲۹ دا لە گەل یکیك لە افراد متوسطەی ـ یعنی قسم اصناف ـ سلیمانی لە سفری بغداد ئەهەرامەوە ، اوما کە ریکای اوتوموبیل نەبو و تنها مناقلات حکومتی بە اوتوموبیل ئەکرا ، بسبب ناخوشی هواوە دو سە روژ لە کفری معطل مابوینەوە لەطرف دوازە ساعتدا ۳ کرەت قرار و فکری رفیقەکەم

تبدیل کرد . هه‌وەل جار بە رفیق دائما موافقم وت ،
فلانی موسم زمستانە امیدی خراپتر لەکر بت جاکرتا ،
وەك لیرە لەم شارە ناخوشە تدبیری بەبین هرچونێك
بی رونشتنمان مصلحتترە .

ماوەی

⁂

پاسماوەی، بیاناتەوی معالی امین زکی بک — لە
خصوص معرفەوە ،

۸ ـ مساعدهٔ مخصوص بو تدریسات ـ لەپێش اوەدا
کە قسەکم تەواو بکم نظر عالیتان جلب اکەمە سر مسئلەیەکی حیاتی کە توسیع پێدانی تدریساتە لە لواکانا .

وغنی نیە لەحضراتانەوە او مبلغەی کە لە بودجەدا بو
معارف تخصیص کراوە کافی نیە بو توسیعی تدریسات
همو انحای بلادەکان کەلەهمو شتێك پێویستترە .

و حقیقتا اگر تماشای بودجەی سابق معارف بکین چاو.
مانپێ اکەوی لە اعتبار تشکیلی حکومتەوە هتا ایستا او
نسبتەی کە بەاعتبار صد زیادی کردوە زور ضعیفە مثلا
لەسال ۱۹۲۱ ـ ۲۲ دابودجەی مذاور بەنسبت بودجەی
عمومیەوە عبارة بوە لە ۳،۳٪ و لەسال ۹۲۲ و ۲۳
دا صدی ۴،۱ ولە ۲۳ و ۲۴ دا صدی ٤ و لە ۲٤ و ۲۵
دا صدی ٤،٥ولە ۲۵ و ۲٦ دا صدی ٤ ولە ۲٦ و ۲۷
دا صدی ٤،٦ ولە ۲۷ و ۲۸ دا صدی ٤،۹ بو ولەم سالە
دا ام نسبتە گیشتوە بە صدی ٥،٥ .

وموجود طلبهٔ مکاتب ابتدائیەکان لەم مدتەدا لە
۱۷۲۳۲ وە گیشتوە بە ۲٤۱۱٤ یعنی لەظرف ام چوار
سالە دا ٦۹۳۸ طلبەی زیاد کردوە ، ونظر بە معدل
سنەوی عبارتە لە ۱۷۳٤ طلبە .

و اعتراف اکەم بەوەی کە حکومت جهدی بانسی
کردوە کە ام نسبەی بوسال ۹۲۷ و ۲۸ دا کە ندروە
بە ٤ ٪ و امسالیش بوە بووە بە ٥ ، ٥ ٪ کە بە
نسبت پێشوەیەوە ۰ ، ٦ ٪ ی زیاد کردوە وحقیقتا
ام اهتمامیش موجب شکرانە . وطبیعی معلومە بەنظر
صیقت مالیەوە بوحکومت بە جهدێکی فوق العادە پیدا
بووە .

فقط لەکل امیشا ام عنایت محدودە کافی نیە بو
ترقی وتعالی حکومتەکەمان وبو تخلیصمان لە جهل الا
بە مدتێکی زور تەبێ بم نوعە قابل نیە ترقی بکین .
و اینین معدل طلبهٔ مکاتب ابتدائیەکان لەهزاری
هشت زیاتر نیە کە بە نسبت نفوسی وە لە حالێکا کە
معدل طلبە پێش حرب حکومت بریطانیا هزاری
۱۵۷ وەی فرانسە ۱٤٤ و اسپانیا ۱۰۳ وبلغاریا ۹٦
ویونان ۸۸ طلبەیە .

ولەم عبارتەوە تێ اگین کە ترقیاتی معارفی ئێمە
سالێك بە نسبت هزار کسەوە عبارت بوە لە نیو طلبە
و اگر بم نوعە معارفمان ترقی بکا ودەیکی تر نەگرین
محقق اینجا بە ۱٦۰ سالی تر اگین بە درجهٔ معارفی
پێش حرب یونان وبە ۱۹۲ سالی تر اوسا اگین بە
بلغاریا .

لبر اوە بە هرە مقدسترین واجباتی مجلس لازمە
کە طلب لە حکومت بکن کە اصولێکی مناسب بدوزنەوە
ومعالجەی ام مسئلە حیاتیە کە سریعا بوپێشکوتنی معا.
رفمان واسطەی بفرمون و ام اصولیش ایجاد کردنی
وارداتێکی مخصوصە لە لواکانا کە صرف تخصیص بکری
بومعارف وکو لە حکومتەکانی تر امە کانە ولەم حکو.
متانەیش یەکێکیان بریطانیایە کە تطبیق ام اصولە اکا و
حکومت هر لە نیوەی مصرفاتی معارفیا اشتراك

اکا وەکەی تری لە ادارۀ محلیەوە تأمین اکری • و حکومت تورکیش نیوەی مصارفی معارفی خستوتە سەر ولایەتەکان و نیوەکەی تری خزینە تأمین اکا ام اصول هرە چاکترین واسطەیە بو ترقیاتی معارف • وزارت مالیە وە دەرف لازمە لایحەیکی قانونی احضار بکن کە عبارت بی لە دانی بعضی صلاحیت بە لواکان بو اوەی لە سەر بعضی رسوم مقدا یك زیاد بکری بە شەرطیك ام زیادە هموی لە معارفیا صرف بکری و اقتراحی خو یشم لەم خصوصەوە تقدیم ئەکم : مثلا دروستە لوای بصرە لە سەر هەمو طنیك خورما کە سوق ئەکری بو خارج لە رسمەکەی زیاتر رو پیەیکی تریشی علاوە بکری و ام وارداتە کە نزیکی لە کیك رو پیەیە لە معارفیا صرف بکری، و دیسانەوە لوای دیوانیە و عمارە قابلە کە ١٠٠٠٥٥ طن هەمو سالیك حاصلاتی چلتوکی ئەبی لە رسمەکەی رو پیەیك و یا زیاتر بو معارف زیادی لی بسینری •

بەمە لوای بصرە وارداتیکی مخصوص مقابل بە نیوەی مخصیصاتی معارفی بو خوی تامین اکا و لوای عمارە و دیوانیەیش بە رەحتی مقابل ئەمە ئەبی •

من لە وقتیکا لە معارفا بوم بو تطبیق ئەم مسئلەیەلە تفکرابوم و طام لە لجنەی مخصوص کرد کە خەریکی ئەم ایشە بن فقط نەمزانی نتیجەی ایشەکەیان بە کوی گەیشت •

مندوب سلیمانی
امین ذکی

## هوالی دەرەوە :

سیاستیکی سری لە بین دول اوروپادا

جنیف ــ جمعیت عصبة الامم بە مناسبتی ئەو ایضاحاتەوە کە حکومت بریتانیا لە خصوص اتفاق بحری بین خوی و فرانسەوە داویەتی بە المان بوی معلوم بوە کە لە رغم عصبة الامم سیاستیکی سری هەیە لە بین بعضی دولت اوروپادا •

---

به درو خستنەوە

برلین ــ کولونل بو بو غزتەی تایمسی تکذیب کردوە کە ئەلی تعیین کراوە بە مستشار حکومت چین و ئەلی هیچ ضابطیکی المان وظیفەی، قبول نەکردوە لە چینا و خزمتی هر وەکو ئەوان •

ملیونیك فراق

پاریس ــ لە وقتی خوی لە مستشرقین فرانسیز (قونت قوسطانتین ئرلوسکی) لە ٨٩٩ دا ملیونیك فراقی لە میراتەکەی تخصیص کردوە بو ئەو مادەی کەلە شرقا و لە پیشا تطبیق حروف لاتینی ئەکات و استعمالی اکات و لە ٩٢٢ دا چرکسەکان حروفات لاتینی یان تطبیق کردوە •

لە بەر ئەوەی ایستا خەریکن ئەم ملیون فرانقە بدەن بە تورکەکان ، چرکسەکان مراجعتیان بە فرانسە کردوە کە ئەم مبلغە لازمە بدری بە خویان •

---

اهالی انقرە

استانبول ــ حکومت تورکیا قراری داوە کە ئەبی اهالی انقرە عمری، بە کورە و بچوکەوە خوینەوار بن و بو ئەوەی بە چوار مانك هەمویان فیری خویندن و نوسین بکن عموم مامورین انقرە قراریان داوە کە لە درس گوتنەوەدا اشتراك بکەن •

---

بە پی سیاحت

استانبول ــ کچیکی انکلیزی قراری داوە بە پی سیاحت بکات و لە لوندرەوە هاتوتە ویانە و لە ویشەوە دیتە استانبول •

نحاس پاشا براثت کردوه

لندن — غزته‌ی دایلی هیرالد خبری داوه که نحاس پاشا و ویصا بك له خصوص رشوت ورگرتنی مسئله‌ی امیر سیف الدین بکه‌وه که متهم بون براثتیان کردوه .

دفع ملاریا

لندن — لجنه‌ی صحهٔ عصبت الامم له‌سر تقریر هیئت صحه‌ی عالم که له خصوص ملاریاوه داویه . قراری داوه که بو دفع ام علته سعی بفرمدری .

متخصصه‌کان امراض عقلیه

لندن — بنا له خبریك که [ دایلی میل ] له اسکندریه‌وه داویه‌تی الی ۳ متخصص امراض عقلیه که یکیکیان انکلیزی دوم فرانسزی سیم اسویچره‌یی یه له‌سر قراری مجلس بلاط مصر بو اوی معاینهٔ صحت امیر سیف الدین بکن مواصلت مصریا کردوه .

مسئله‌یه‌کی غریب

طوغره یول — له دی الویکاردا کوریکی سوت مانکی بلوغی بوه . ام مسئله‌یه بوه به سببی مراقی دوقتوره‌کان وزوریان چون بو تدقیق وچاوپی‌کوتنی .

عنوانی رسمی مقامه‌کان

انقره — مجلسیك تخصیص و اجتماعی کردوه که له تورکیادا له خصوص عنوانی مقام رسمیه‌وه که انوسری مذاکره بکات . قراریان داوه که لم اصطلاحاتانه‌دا ترکیب وجملهٔ عربی وفارسی کاملا ترك بکری .

سقوط قابینه‌ی فرانسز

لندن — له روزی کردنه‌وی مجلس مبعوثانا قابینه‌ی فرانسز سقوطی کردوه . وا در انه‌وی تکلیف له مسیو پوانقاره بکری که قابینه‌یه‌کی که تشکیل بکات

تاجیل مجلس تاسیسی سوریه

رویتر — بنا له خبریکی موثوق که ورگیراوه لم روژانه‌دا دیسانه‌وه قرار ادریته‌وه بو تاجیل مجلس تاسیسی سوریه بو سه مانکی تر .

هوال داخلی :

وزیر داخلیه

وزیر داخلیه معالی ناجی بك شوکت بوتماشا کردنی ایشو کاری لواکان له (۹) ام مانکه دا حرکتی فرمده بو طرف کربلا ، نجف دیوانیه .

سعادة متصرف اکرمی بوتماشا کردنی ایشو کاری قضاکه تشریفی بردوته هلبجه . خوای له کل بی .

بمناسبت تعطیل مجلس مبعوثانه‌وه مبعوث محترم مان جناب محمد صالح بك له بغداده‌وه تشریفیان هینایه‌وه .

له مقام متصرفیه‌وه :

صورتی تحریرات محاسبات عمومیه‌یه‌که له خصوص قبول مسکوکانه‌وه تبلیغی کردوه له ژیره‌وه اعلان کرا لازمه بم نوعه معامله بکری .

وه‌ك معلومتان بوه لای ایره بعضی تردد هه‌یه له قبول کردنی مسکوکات هندستان له انواع او پاره زیواله‌یان که لوس بوبن . بناء علیه تاکیدی تعلیماتی سابقمان ئه‌کینه‌وه که جائز نیه قبول کردنی او نوعه روپیه‌یه واجزای روپیه‌یانه که لم حالاته‌دا که له خواره‌وه‌یه بیان ئه‌کرین .

۱ — به نوعی لوس بوبی که نوسینه‌کی قابل خوینده‌نه‌وه نه‌بی . و تشخیص صورتی نه‌کری .

۲ — تیك چوبی — بم نوعه که یان کنی تی کرابی . یا لی برابی ، یا کرترایته‌وه و یا پینه کرابی .
بناء علیه رجا ئه‌کم تعمیم ئم تعلیماته بو ملحقات بفرمون .

مدیر عام محاسبات عمومیه

# ژیان

کریار

بەشش مانك پێنج

بەسالیك دە روپیە دەدا

---

بو دەرەوە اجرت

پوستەی علاوە ئەکری

شش مانك کمترابونە قبول ناکری

اعلانات

دیریك ٦ آنە دەسێنرێت

یکی بە آنەیکە

بو هەمو شتیك

مخابرات بەزاوی ادارەخانەوە

اکری

§

ئیدارەخانە لەبینای بلدیەدایە

---

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی بە آنەیکە

هەمو شتیك انوسی هفتەی دو جار دەردەچی غزتەیکی کوردیە

٦ جمادی الاخر ١٣٤٧ ١٩ ت ٢٠٠ ١٩٢٨ [ دوشمە ] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦


## تشکری میعوثەکانمان ئەکین

* * * *

مجلس مبعوثان لە ابتدای یەکی ئەم مانگە دا بە صورتیکی اعتیادی اجتماعی ئەرمو . لەدوای خوێندنەوەی خطاب عرش موافق قانون داخلی مجلس دەست کرا بە انتخابات رئیس و نائب رئیس نتیجە : بە اکثریت آرا نجابت عبد العزیز بك قصاب رئیس سابق دیسان ئەوە بە رئیس و مندوب محترم سلیمانی معالی امین زکی بك بە نائب رئیس انتخاب کران .

بەم مناسبتەوە ئەمانەوێ مسرورییتی هەمو لایك مقابل بەم انتخابە مصیبە عرض قارئین کرام بەکین :

لە هەمو عراقیکا وە معلومە کە ، علم و فضیلت و دهای خارقەی نجابت عبدالعزیز بك قصاب لەوانە نیە انکار بکری ، مشار الیە لە اول تشکیلات حکومت عراقەوە بو ئەم ملك و ملتە کەلی خدمتی سبقتی کردوە لە ادارەیشدا فعالیتیکی فوق العادەی پیشان داوە و لە اول اجتماع مجلس مبعوثیشەوە کە بە رئیس انتخاب کرا و ئەو موقعە عالیە مهمەی احراز کرد و لەم اجتماعەدا کە تقریبا مدەتیکی زور دوامی کرد ، بە واسطەی حسن

اخلاق و انتظامپروەری و حقیپرستی لەم رئیسەمانەوە بە صورتیکی باش ادارەی لەم مجلسە کرا بە ترجیات کە وەکو طبیعتی ئەم موسعە عالیە بو ئەم ذاتە خلق کرابو، ئەو مسائلانەی کە تودیع مجلس کرا هەموی بەصورتیك کە خادم ملك و ملتە کە پی لە جریانیکی طبیعی دا حل و تصدیق کرا .

معلوم هەمو لایکیشە ، معالی امین زکی بك ذاتیکی کورد و لە رجال مشهورە و فضلای عراقە ، مشار الیە وەکو لە علوم عسکری دا یدیکی طولای هەیە لە ادارەیشدا فوق العادە شارەزایە ، لە ابتدای هاتنەوەی عراقیەوە کە تعیین کرا بە امر و مدیر دار التدریب و مدرسة ملوکی عسکری عراق ، بە واسطەی دها و علم و عرفانیەوە زور لەم وظیفەیەدا خدمتی کرد و ئەم مدرسەیە کە تازە تأسیس کرابو لە بناغەیەوە بە صورتیکی محکم دای مزران و وەکو مدارسەکان عسکریەی اوروپا روح و انتظامیکی فوق العادەی پیدا ، و لە اول انتخابات مجلس مبعوثانەوە چونکە اولەمین رجال کورد — و لوای سلیمانی بو لە طرف اهالی ئەم لوایەوە انتخاب کرا و بو ئە.

وەی زیاتر خدمت ملت و خصوصا وطنەکەی خوی بکات ئەم وکالتەی قبول کرد .

حقیقتا لەو مدەیەی کە لەم وظیفە مقدسەدا مارە بوە بصورتیکی ئو لەلایە لە خدمت کردن قصوری نەفرمو وبوترقیات وطن وحکومتەکەمان سعی فرمو وکلی اسباب کە بوترقی وتعالی وطنکەمان خادم بی بوی احضار فرمون .

وغیری امیش بە واسطة معلوت وخدمات ممتازە بوە لەو دو قابینەیەدا کە تودیعی فرمو ومدەیکی زور وزارة اشغال وبیئیك وزارة معارفی اشغال فرمو بو دیسانەوە لە هەو خصوصیکەوە بوملك وملتەکەخدمت فرمو وبم سببەوە لای کلی فردیکی ملت ، کە ذاتیکی خوشەویست محترم والی الابد مدیون ومتشکری خدمات حسنەی خوی فرمون .

انجا بم مناسبتەوە کە ئم دو سیما عالیە کە محب و خادم ملك وملتکمن . لەم انتخابە مصیبە کە بە رئیس و نائب رئیس انتخاب فرموراون حقیقتا بو هەوملتەکە جار شکرانە .

مقابل بە حسیات عالیانە وکلای ملتەکەمان کە خدمات مسبوقة ام دو ذاتە عالیەیان فراموش نە فرمو وبو ام وظائفە عالیە ام دو سیما الیقەیان انتخاب فرمو الی لابد مدیون ومتشکری حسیات عالیانین . امید اکین ام انتخابە مصیب فالیکی خیر بی بو ترقی وتعالی عراق تمنا اکین لەم دورەیەشدا بە واسطة جهد و کوشش ام دو وکیلانمانەوە وبالخاصە ام دو رئیسە مشفقەمانەوە وطن وحکومتەکەمان زیاتر نائل حریت بی و استقلالیکی رەهاکی جانکەوی . وانشاللە لەسر فکری حسنەی خویان ولەسر ام ریکا باشە کە گرتویانە خوا معاونیان ابی .

❊

### نەخوشی اجتماعیمان :
### بی قراری ، بی عزمی

پاشماوەیە

* * * *

باتحقیك بارانمان لی بدا لە جوابدا ووتی زور باشە ودسی کرد بە استحضارات سفر اساسا من قراری خوم دابو فقط تجربتا دفعەی دوم بیم ووت باوکم فصل زستانە احتمال انواع فورطنە دزی هیە خوانخواستە هوالەریکا لی کورین ومقدریکمان بەسرهات خولەچولی قولفە بکمان نکوتوە . والیرە امینەوە انتظار اکەین با دە روژ تعطیل بەبین ، کفر نیە ، رفیق بە سەزمان اتا صرفنظری لە حرکت کرد . فقط ایواری دیسان قرا وی ئانم بی هەلوەشاندەوە و حرکتمان کرد .

طبیعی ، بی انصافیە کە ئەم مسئلەیە بکەم بە نمونە بو هەمو طرز تفکرو قراری کوردەواری ، فقط لەعین زماندا لازمە بلیم اکثریت عظیمەمان تقریبا وەکو ئەمەینە .

بەلای منەوە اسباب ئەم بی قرارییە ، بی عزمی و بی ثباتیە بروجە اتیە :

اولا لە کنە و اساس ی، ئەو ە ابشە ە ی کە ئەما ئەوی قراری لەسەر ئەدەین وورد نایینەوە و بەنظریکی سطحی تماشای ئەکەین .

ثانیا لە تطبیق ئەم قرارەدا توشی جە نوعە احوال شرائط و یا موانعیك ئەبین لیکی نادەینەوە ، بناء علیە ادنی مانعەیك توشی مفرطی خیالمان ئەبێت و ساردمان ئەکاتەوە .

مارە ئـ

### افغان اشتراك ميثاق كيلوج اكات

لندن — غزته‌ى تايمس اونوسى كه افغان اشتراك ميثاق كيلوجى كردوه و عين غزته الى افغان به تشبثات لطيف و ارزوبه‌كى تواومه وه‌و تجدد اروا له حاليكا كه له افغانا هه‌ غزته‌يك هه‌ير و ايستا پارده غزته انتشار اكات .

---

### استدات فرانسه له سوريه

پاريس — له مجلس مبعوثانا بعضى مبعوث فرنسز كه له حزب اشترا كيون طليان له حكومت كردوه كه اقتصاداً وا چاكه فرانسه واز له استداب سوريه بينى و له سر اوه معارضه‌يه‌كى زور به شدت روى داوه و موسيو پوانكاره به دلائل ثيانى كردوه كه بو مصلحتى عمومى فرانسه لازمه محافظه‌ى ام استدابه بكرى و ترى نكات و الى لازمه وكو وعده‌مان داوه سوريه‌كان وا تربيه بكين كه ئنل استقلالیكى تواو به بن .

له‌دواى ام مناقشه‌يه مجلس به موافقت ۳۸۰ راى كه ۲۰۰ راى مخالفتى كردوه طلبى ام مبعوثانه‌ى رفض كردوته‌وه .

---

### حكومت هند دعوت جنرال غورووى كردوه

پاريس — به رسمى معلوم بوه له‌سر دعوتيك كه حكومت هند كردو به‌تى (جنرال غورووى) حاكم عسكرى پاريس له ۱۲ ى ام مانكه‌دا حركت اكات بو هندستان و لاى نائب جلالت ملك ميوان ابى و له‌و مدده‌يه‌ى كه‌له‌ويدا ابى زيارت هه‌مو شاره كوره‌كانى هندستان اكات و تدقيق حيات اجتماعيه و ماليه‌ى هندستان اكات و تماشاى انتظام قوه‌ى عسكرى بريطانيا كه له‌ويدايه اى كات ، دوائر مستعمرات اهميتيكى كوره ادات بم زيارت جنرال غوروويه .

### چوار جاسوس المان

برلين — حكومت فرانسه چوار شخصى المان كرتوه كه له فرانسه‌دا موظف بون له سر اوى بوى معلوم بوه كه امانه منسوبى جمعيتيكن كه تجسس هه‌مو انحاى فرانسه اكن . وله سر كرتنى امانه هيجانيكى كوره بوه له المانيا .

---

### سير چمبرلاين

لندن — له دواى كرانه‌وى سير اوستن چمبرلاين كه به مناسبتى نه‌خوشيه‌وه بو تبديل هوا تشريفى بردبوه امريقا له‌قولى عواممدا به صورتيكى فوق العاده قبول فرموزاوه وله‌ناو مركزيدا مسروريتيكى خستوته دلى هه‌مو مبعوثانه‌وه .

—)§(—

### تشكرى حكومت عراق مقابل به حسيات ومعاونت حكومت مصر

بغداد — مقابل به حسيات حكومت مصر كه درحق به وله‌ده‌دى خوشه‌ويستى عراق فرمووه له وقتيكا كه له لوندره‌وه به مصرا كراوته‌وه بو عراق رئيس الوزراى عراق به ناوى حكومته‌وه تشكر نامه‌يكى بو رئيس الوزراى مصر نوسيوه .

—)§(—

### مولا محمد على

بغداد — مولا على كه يكيكه له رجال مشهوره‌ى هندستان وتشريفى هيناوته بغداد ، حركتى فرمووه بو كربلا ، نجف ، امام موسى ، وزيارت هه‌مو عتبات مقدسه فرموه .

**حوال داخلی :**

سعادت مفتش اداری و رفیقه‌ی محترمه‌ی و جناب مفتش پولیس که تشریفیان بردبوه ناحیه‌ی قره‌داغ و وارماوا و قضای هلبجه چوار ریشژ لەمەوپێش عودتیان فرمووه .

اجباره بنا له سر اقتراحی دائرهٔ مالیه و امری سعادتی متصرف اکری بعضی تحویلات که وکو له خواره‌وه نوسراوه له مأمورین مالیه‌کانا اجرا کراوه .

مأمور مال ناحیه‌ی تانجرو قادر افندی تحویل کراوه بو مأموریت مالیه‌ی خورمال .

وه‌مأمور مال خورمال محمود افندی له جی او تعین کراوه به مأمور مالیه‌ی تانجرو .

مامور مال ناحیه‌ی سرچنار مصطفی افندی تحویل کراوه به مامور مال پینجوین و مامور مال پینجوین مصطفی افندی له جی او تحویل کراوه به مامور مال سرچنار .

کاتب مالیه‌ی شهربازار ترفیعا تعیین کراوه به مامور مرکز هلبجه و مامور مال مرکز هلبجه رؤف بك بوه به صندوق امینی شاربازیره

اعلان

تعهدی تسلیم کردن کاو جوی حیوانات حکومتی پولیس سلیمانی و هلبجه له ۳۱۹ / ۱۲ / ۲۸ دا خناموی‌دیت هر کس طالبی تعهدی ام مالزمه‌یه مراجعت به دائره‌ی پولیس لوا بکات .

متصرف سلیمانی

اعلان

له اعتبار ۱ شباط ۹۲۹ هرو وسائط نقلیه لەحیاتی طرف چپ که ایستا جاریه لازمه جهت راست ریکا بکرن .

آگر دو اوتوموبیل له استقامتیکا پیش و یا پاش یك برون وآگر اوتوموبیل پشته‌وه ایه‌وی تی‌پری‌اوتوموبیل پیشه‌وه بکات لازمه او اوتوبیله‌ی پشته‌وه طرف چپی اوتوموبیلی پیشه‌وه بکری اخبار تی پر بکات وبروا .
اگردو اوتوموبیل برامبری یك هاتن له سر هر دو لیان لازمه طرفی راستی ریکا بگرن اخبار تی پر بکان برون .

مدیر پولیس

بو مشتری‌یه ژماره کانمان

معلوم عالیتانه دائره‌کمان به زور غزته‌ی نه‌داوه به سر کسا له براوه لطفا اوی اوروی قبول کردنی نیه اعاده‌ی بکاته‌وه و او قسمه بدلاته‌ی که له خدمتیانایه بومان بنیرن ، اوانه‌یش که تبرلی افرمون دیشانه‌وه وکو مقداره‌کانیان تقدیم کراوه حق غزته‌کمان به ناوی صندوق بلدیه‌وه بو بنیرن .

«زیان»

له‌دائرهٔ طابوه‌وه :

اعلان

خانویك که له کرکوك ماکه‌ندی واقعه و محدوده شمال شرق طریق عام و شرق جنوبی خانوی ۵ — ۳۰ تسلسلی ۳۸۳ که عائدی رحمه علی عایشه‌یه ، جنوب غربی تکیه ۸ — ۳۲ تسلسل ۴۱۰ که عائدی خلیفه محمده وتواو کری به خانوی ۱۲ — ۳۲ تسلسل ۴۱۵ که عائدی محمد شیخ کوری احمده غرب شمالی به خانوی ۹ — ۳۰ تسلسل ۳۸۵ که عائدی حمه مینی کوری محمده ونوسروی ۷ — ۳۰ ، تسلسل ۳۸۴ به ناوی ورثهٔ عزیز کوری بکر که رحمه ، فاطمه و ئلچینه‌یه جدیدا طابو اکریت هر کس حقیکی هیه له تاریخ ام اعلانه‌وه هتا ۳۰ روژیتر باوراقی مثبته‌یکه‌وه مراجعت به دائرهٔ طابو بکات دوم جار اعلان کرا .

بو همو شتیك

مخابرات به ناوی ادارەخانەوه

اکری

§

ادارەخانه لەسنای بلدیەدایه

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی مانیکه

کریار

بەشش مانك پێنج

بەسالیك ده روپیه دەدا

بو دەرەوه اجرت

پوستەی علاوه ئەکری

شش مانك کەرابونه قیدناکری

اعلانات

دیریك ٦ انه دەمینیت

یکی بەآنیکه

همو پنجشنبەیك اوسی هفتەی دو جار دردەچی غزتەیکی کوردیه

٥ رجب ١٣٤٧ ـ ١٧ کانون اول ١٩٢٨ [پنجشنبه]

تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦


## ربط سلیمانی به بغدادەوه به واسـطەی تلەفونەوه

* * * *

معلومه که ترقیات ملتیك له همو شـتیك زیاتر به تجارت و آلش ویرشیکی روژەوه ابی . یکانه واسطەی تجارت و ترقی و تعالی ملت اوەیه که لەناویا و لەگەل خارجیا خطوط مخابره چاکتر و سـریع تربی .

کوردسـتان جنوبی و بالخاصه لوای سـلیمانی : له زمانی ادارهٔ پیشودا هر چند خطوط تلغرافیەی هبو فقط لەمانگیکا له بیسـت کرەت زیاتر تیك اچو و به درنك چاك اکرایەوه و غیری اویش اکر زور اهتمامی پی بکرایه اوسـا هفتەی جار یك پوسته آمد و شـدی اکردو بم سببەوه عادتا له همو واسطەیکی مخابره محروم مابو .

همو ازانین ام لوایەهتا کو سال ٢٥ یش بەواسطەی بعضی اسبابەوه وکو خط تلغرافی تیانەبو وبوی نەهاتبو پوستەیش بعضا بەمانکیك جاریك اوسا اهاته سـلیمانی واروشـت . وتجاریك به مانکیك انجا جاریك موفق ابو کەخبریك له وکیل ولەماله تجاریکەیەوه ورکری لەبر اوه همو معاملات تجارة معطل مابو وبم سببەوه قسمیکی زوری اهالیکەمان پریشان مابوەوه .

فقط حمدا امه چند ساله حکومت ام مسئلەیەی هینایه پیش چاو و بو ام خصوصه به جدی سعی فرمو نتیجه ، غیری اوەی که عموم انحای تری عراقا پوستة هفتەی دو کرەت و یا ۳ کرەت امد و شد اکات ، لیرەدا به صورت اعتیادی هفتەی دو جار و به غیراعتیادیش همو روژی پوسته دیته سلیمانی و لیرەیشەوه اروا و غیری اویش حکومت بەمه اکتفای نفرمو بو اوەی واسطەی مخابره چاکتر و سریعتر جریان بکات خطوط تلەفونیشی بو تمدید کردین و امه سالیکه اهالی بی کلفت به سهلی اتوانی بو همو ایشیکی لەگل بغدادا مخابره بکات .

جکه لەمەیش به مسرورییەوه پیمان که حکومت زانی مخابره و تجارتی ایمه اکثری لەگل بغدادایه ام خطة ی هتا بغداد تمدید کرد وحال حاضر سلیمانی به تلەفون به بغدادەوه ربط کراوەو حتی تجربتا سعادت متصرف غورمان لەدوازدەی ام مانکەدا به تلەفون لەگل بغدا

دا مخابره‌ی فرموه طبعی ملتیش استفاده له اکات .

ام لمحه ام آزره دلالت اکات که حکـومت و بالخاصه مامورین اداره‌کانمان فوق العاده ملتپرور و مشفقن چونکه ام ایشه خیریه‌یان فوق‌همو لطفیکی زیاتره وله همو شتیك چاکتر وباشتره بوترقیات تجارت اهالی و ایشوکاری حکومتی .

امید اکین به واسـطهٔ ام لطف وشفقته‌وه که حکومت له‌کل‌مانا افرمویت هتا بتیك که له همو نقاط تری لواکه‌مانا ام واسطه‌یه تامین وتمدید بکری که بم سببه‌وه سـلیمانی املده ترقی وتعالی بکات که لواکه‌مان و مامورینه اداره‌کانمان له عراقا ممتاز وبالبنان بن .

وتمنا اکین بم نوعه کشبشانه‌وه که حکومت ایفرموی هتا مدتیکی که عراقیش به تلسز تلفون به هموانحای سائره‌ی تری عراقـه‌وه ربط بکری . ولم نوعـه مسـائلانه‌وه معلومه که حکومت جدا له‌کل اهالی‌دا مشفقه و انشاالله ام شفقتی حکومته ابی به سببی ترقی وتعالی وپایداری حکومت ومسعودیتی ابدی ملتیش .

هرزه‌کاریت بپارێزه

پیریت خوی دور اخا

پاشهاره‌یه

* * * *

اکر توشی پیریکی زمان دیده بوی که موی سپی بی دان و روممتی چرچ و لوچ بوبي له‌کل امه‌شدا بالای قنج وقیت چاو رون بنیه یکی صاغ له بزوتنا چستو چالاك . خواردنی زو هضم اکا له ایشو عقلدا وه‌کو لاو بی . بزانه ام نوعه کسانه زمانی لاوی خویان به عفت و اعتدال پاریز کاری کردوه که زخیره‌ی لاوی‌بو ایستا عمار کردوه .

و یا اکر توشـی لاویکی له مره‌تي هرزکاریدا ببین که ره‌نکی پیری لی نیشتوه ده‌موچاو آوسـاوی زور کوشتی وقله‌وی وسور وسپی ام نوعه لاوانه نه‌ت‌خله‌تینی به علائمی صحتی ام نوعه انجانه باور مه که له‌رویشتنا زو هیلاك و یا اکر به کردیکا هه‌لکری هناسه برکای پی بکا و یا له ایشـی عقلیدا زو ورس بی و اکر توشی تهلکه‌یاك بی کورج بترسی و اکربی که یکی توشی ده‌ردیك بو له خوی بترسی و زور بی جسـارت بی .

به راستی بزانه که ام نوعه لاوانه له هرزه‌کاریان بی خبرله حسیاتی کنجیان سوء تصرفیان کردوه و کومیان کردوه له و حسرت نشی ام نوعه کنجیه نه امینیته‌وه .

چونکه لاویك اکر صاحب عفت واعتدال بو و صاحب عزم و ثبات بو برامبر همو تقلباتیکی زمان به عزمیکی شـیرانه‌وه راوه‌ستی هیچ مایوسـیت ناکا به مسلکی خوی .

انسان له عمری پانزه سالیه‌وه هتا بیستو پینج سالی وبلکو تا سی ـــ ۳۰ سالی احتیاجی به‌ ور یابون و هوشیار بکی تواوه که یا لاوی‌خوی چاك اپاریزی و عمری به سـعادتیکی تواو‌را ابوری و یا له‌لذتی کنجیدا سوء تصرف اکا که نتیجه پشیمانی بو امینیته‌وه انجا هر وه‌کو مسـئله‌ی کوردی الی : ( هتا نه‌یخیته طاق نایت الله صدق ) .

ع . عزیز

مدیر مکتب حلبچه

---

## هوالی دره‌وه :

فابریقهٔ فورد له استانبولدا

غزتهٔ تایمیس انوسی که حکومت تورکیا قبولی کردوه

قوریقهٔ اوتوموبیل فورد له استانبولدا شعبه‌یه‌کی کوره بکاته‌وه که توشرق اوتوموبیل درست بکات .

ولی عهد خوشه ویست بریطانیا

قاهره — ولی عهد بریطانیا (برنس اوف ویلس) بو اوه‌ی عودت بکاته‌وه لوندره روژی (٦) ام مانگه موا سلت قاهره‌ی فرموه وله طرف مندوب سامی بریطانیا و ممثلین ملك مصر و رجال مشهورهٔ حکمته‌وه فوق العاده استقبال فرموراوه و بو یافا حرکتی فرموه بو سویش .

( زیادی نفوس حکومت روسیا )

ریغا — رفیق رایکوف خطبه‌یکی خویندوته وه و بیانی کردوه که نفوس روسیا همو سالیك (٣) ملیون زیاد اکات و الی امه نتیجه ابی به سببی بعضی مشکلات له زراعتا چونکه به قدر ام نفوسه که‌زیاد اکات اراضی نیه که قابل زرع بی بو فلاحه‌کان .

جلالت ملك معظم

بغداد — رکاب جلالت ملك معظم به قطار خصوصی له (١٠) ام مانگه‌دا عودت افرمویته‌وه‌و له (١١) ام مانگه‌دا مواصلتی بغداد افرمویته‌وه و بو ایفا کردن راسمهٔ استقبال به صورتیکی فوق العاده همو ترتیباتیکی بو احضار کراوه .

و جلالت ملك محبوب عراق لم سفره‌ی‌دا له همو ایشیك زیاتر تماشا و تدقیق احوال زراع و زراعتی فرموه .

ملك افغان

لندن — بو اوه‌ی بالذات خوی تادیبی بعضی رؤسای عشایر بکات که له علیهی حکومت حاضره ی افغان دستیان کردوه به‌اختلال ، ملك امان الله خان له کل قوه‌تیکی زورا حرکتی کردوه بو همو مناطقیکی اختلاله که .

سفیر المانیا بو روسیه

برلین — ( هر فون دیرکسن ) له طرف حکومت المانه‌وه تعیین کراوه به سفیر بو حکومت روسیه .

رعیه‌ی ارناورد له مصرا

قاهره — حکومت مصر قبولی ناکات که رعیه‌ی ارناوودیش وکو هی سائر دولیکی له محاکم مختلطه‌دا محاکمه بکرین چونکه الی لهو حکومتانه نیه که حق بعضی امتیازاتی بی ، و ابی وکو رعایای مصر له محاکم مصرا محاکمه بکرین .

اهالی تراکیا

استانبول — بعضیك اهالی تراکیا هاوار اکن له دست حکومت یونان له خصوص مسائل مبادله‌ی مهاجرین بین تورك و یونان دا .

تلغراف سمیمی رئیس لجنهٔ حدود

بغداد — رئیس لجنهٔ ممثلین تورك حدود بین تورکیا و عراق توفیق هادی بکی والی ماردین که له موصله‌وه عودتی فرموته‌وه بوماردین تلغرافیکی بو متصرف موصل نوسیوه وزور بیانی تشکری کردوه مقابل بهو حرمته‌ی که‌ما ورین عراق له حقیان کردوه وله تلغرافه‌که‌یا تمنای تمدید دوستایه‌تی بین تورك و عراق کردوه .

ملك معظم

بغداد — جلالت ملك معظم عراق لهو مده‌یه‌ی که له بصره‌دا تشریفی ماوه‌ته‌وه به شفقت ولطفیکی فوق العاده زیارتی همو مکتبه‌کان فرموه وبیانی ممنونیتی له هیئت اداره وتدریسیه‌یان فرموه .

## وزیر دفاع

بغداد — وزیر دفاع معالی نوری پاشا السعید که له خدمت جلالت ملك معظم عراقا تشریفی بردبووه طرفی جنوب له شش مالسکما عـودتی بغدادی فرموه .

---

اعلان

بو قسمداخلی مکتبی صنایع بغداد طلبه قبول اکری هر کسی طالبه مراجعت به دائره‌ی تحریرات بکات .

متصرف سلیمانی

---

اعلان

خانویك له کل عرصه خانویك که له محله‌ی درکزین واقعه و مرقمه به رقمی ابواب (٣٨و٤٠ — ١١٠ و له بینی حاجی صالح کوری احمدی قاسم مشترکه له بر اوه که لهم محکمه‌یه‌دا ازاله‌ی شیوعی له طرف مدعی حاجی صالح اقامه کراوه و له بر اوه‌یش که‌قابل تقسیم نه‌بوه . علی الاصول اوا حراجه موقتی مزایده‌وه بو مدهٔ (٣٠) روژ که عبارته له مانکیك . بو صورته اوانه‌ی که طالب به شرای ملکی مذکورن له ظرفی مدهٔ قانونیه‌دا به صدی ده تأمیناته‌وه مراجعت به محکمه‌ی صلح سلیمانی و منادی توفیق آغا بکه‌ن

معاون حاکم منفردی سلیمانی

---

اعلان

عرصه خانویك که له محله‌ی جوار باغ واقعه و مرقمه به ٤ — ١٢٦ و له بینی ملا عبدالله دوغریس و ابرا هیم کوری صالح مشترکه له‌بر اوه که له طرف مدعی ملا عبدالله‌وه لهم محکمه‌یه‌دا دعوای ازاله‌ی شیوعی اقامه کراوه و له بر اوه‌یش که قابلی قسمت نه بوه اوا عرصه‌ی مذکوره حراجه موقتی مزایده‌وه بو صورته اوانه‌ی که طالب به شران له تاریخی ام اعلانه‌وه هتا مروری مانکیك به صدی ده تأميناته‌وه مراجعت به محکمه‌ی صلح سلیمانی و منادی توفیق آغا بکه‌ن . له بر اوه کیفیت اعلان کرا *

معاون حاکم منفرد سلیمانی

---

له‌دائرهٔ طابووه :

اعلان

او خانوه که نومره‌ی ١٠ — ٧٧ و تسلسل ٣٦٩ وله کره‌کی درکزین واقعه و عائدی حبیبهٔ یکی احمد و رشید و فاطمه و حلاوه اولاد عزیزه و له پیش مرقومان داویانه به رهن به دائره‌ی ایتام سلیمانی و به وکالت دوریه به مدیرایتام سید احمد افندی کوری شیخ عبد الرحمن و به مدتی سالیك له‌اعتبار ١٥ رجب ٣٤ به مقابل ٢٢٩ روپیه و دو انه‌و معامله ی رهنیهٔ بتاریخ تشرین ثانی ٩٢٨ و ژماره « ١ » کراوه بنا له‌سر تواو بونی مدت و مراجعت دائره‌ی ایتام تبلیغات به یکی له مرقومان که حلاوه یکی عزیزه کرا و له بر اوه‌ی که حبیبه یکی احمد و رشید و فاطمه اولاد عزیز معلوم بوه که جیکایان مجهوله و لازمیشه اخطار بکرین له غزته‌ی محلیه‌دا که‌اکر له تاریخ ام اعلانه‌وه هتا سی — ٣٠روزی تر پلل او رهنه به تواوی نه‌ده‌نه‌وه و اکر افاده‌یکی مشروعیان بی مراجعت به محکمه نه‌کن بو استحصال حکم و بو تاخیر منعیان له دائره‌ی طابو او خانوه اخاته مزایده‌وه و ایفروشی له‌براوه اعلان کرا .

---

اعلان

له اعتبار ١ — شباط — ٩٢٩ هه‌مو وسائط نقلیه له‌جیاتی طرف چپ که ایستا جاریه لازمه جهت راست ریکا بکرن .

اکر دو اوتوموبیل له استقامتیکا پیش و یا پاش یان برود واکر اوتوموبیل بشه‌وه ایه‌وی دوری‌اوتوموبیل پیشه‌وه بکات لازمه او اوتوبیله‌ی بشته‌وه طرفی چپی اوتوموبیلی پیشه‌وه بکری انجا تی‌پر بکات و بروا .

اکردو اوتوموبیل برامبری یان هاتن له سر هر دویان لازمه طرفی راستی ریکا بکرن انجا تی‌پر بکه‌ن برون .

مدیر پولیس

---

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانی

بو همو شتیك
مخابرات به ناوی اداره‌خانه‌وه
اکری
§
اداره‌خانه له‌بنای بلدیه‌دایه
عنوان : سلیمانی ژیان
یکی به آنه‌یکه

همو شتیك انوسی هفته‌ی دو جار درده‌چی غزته‌یکی کوردیه

کریار
به‌شش مانك پینج
به‌سالیك ده روپیه ده‌دا
بو دره‌وه اجرت
پوسته‌ی علاوه ئه‌کری
شش‌مانك کرابونه قیدناکری
اعلانات
دیریك ٦ آنه ده‌سینریت
یکی به آنه‌یکه

١٢ رجب ١٣٤٧   ٢٤ کانون اول ١٩٢٨ [ دوشمبه ]   تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦


## نه‌خوشی اجتماعیمان :

### مصاحبه — ٤

عافقله کاری ، عنعنه پرستی له حیات اجتماعیه‌ماندا باشماوه‌یه

* * * *

عنعنه پرستی چه نتیجه‌ی اعتیادیی کون ، چه نخو . شیی دماغی ، و روحی بیت ، شتیکی مضر ، بد و بی معنایه .

بلی ! به‌و اعتباره‌ی که کم و زور جزئیکی باوك و باپیر ماین ، قسمیکی ماضین ، مربوط عنعنه‌ی راوردوین فقط لازمه له عین زماندا له بیرماندا بیت له پیش همو شتیکدا ایمه اولادی ام روزه‌ین ، پشتمان کردوته و رو پشتو و رومان له پیشه‌وه‌یه .

زور راستیان وتوه : لاعلی التمیین هموشتیك درجهٔ اعتدالی باشه و فقط افراط حتی له تقوی یشدا مقبول نیه ، عنعنه پرستی ایمه حد افراطیشی تی پراندوه .

ام نخوشیه پیس و قاتله ؛ بی مبالغه له همو احوال و اعمالیکماندا حاضر و موجوده . قسم صنعتکار له پینه چیوه هتا زرنکر ، فلاحمان له نیوه‌کاریکه‌وه هتا ملا کیکی صاحب هشت ، تو دی مبتلای ام بلایه‌ن

مثلا ؛ له عصر بابان و پیش باباندا که‌وش سور ، رش باو بوه پاشا و موفردی هر امه‌یان له‌پی کردوه . ام احتیاجه صنف کوش درو و پینه‌چی هیناوته وجود فقط به مرور زمان ام مودهٔ پیلاوه نماوه قوندرهٔ کلا- سی ، روغندار هاتوته پیشه‌وه . معمولات خومان له رغبت کوتوه .

مع‌الاسف مقابل به‌م کوران میل و باوه هیچ فکر تجدد و انقلاب نه کوتوته میشکی کوش دروکانمانه‌وه له جیاتی اوه‌ی امانیش له کل چرخ زماندا هه‌ل سورین ترقییك له صنعته که‌یاندا بنوینن تنها راضی بون به یادی ماضی و حسرت راوردو و به سائقه‌ی محافظه کاریوه ، به بیریاندا نایه‌ت مشته و کازنه که‌یان تبدیل بکه‌ن به قالب و مکینه‌ی قوندره .

نه‌ختی به‌ولاوه بروین و تماشای فلاحه‌کانمان بکه‌ن ام نخوشیه به صورتیکی محسوستر مشاهده ا ئه‌ین و لم‌صنفه دا لوحه‌ی عنعنه پرستی کلی مؤثر ترکلی بدبختانه‌تر

ابینین . ام قسمەمان هیشتا بەاسباب و آلات عصریوە خریکی شان لە شان دانی اوروپایە . جوتیاریکی بە سەزمان بە دوانزە سعات بە هزار نیخە نیخ و آرق هەلرشتن ، لە پاش دو سە جار شکانی کاسن و هوجار انجا موفق ابیت بە کیلانی اعظمی دونمی اراضی .

نتیجەی ام هموکلفت و مشقتەی سە و یا چوار ربە کمە کە مقابل بە دەکز جیت و باطمانی شکری خارجەیە . جا بم موجودیت اقتصادیەوە باور ناکەم هیچ حق ویا روی قسەمان هیبت . بو ام جوتیارە ؛ احتمال فقر حالی معذرتیك تشکیل بکات فقط نازانم ملاکە دولەمندەکانمان ـــ کە هینانی مکینەیکی دروینە ، جوت و یا طورومپایکی آو بە نظر ثروتیانەوە هیچ شایان اهمیت نیە ـــ بوچ خویان بەمعاصر بابل و مدیا ازانن و هیچ اثریکی تجدد پیشان نادەن جداً شایان تأسف و بلکە باعث مأیوسیتە کە ابینین حتی پتاتەی خواردنی خومان لە سنە و جیکایانی ترەوە دیت .

هموکائنات اعترافی کردوە امرو حق ، قوت پارە و ثروت اقتصادیەیە . دستی اقتصاد سەروی هموو دستیکە . چوار پنج سال لەمو پیش فرانسە لەکل اوەی لە حرب عمومیدا غالب و مظفر دەرچو بو ؛ تنها بە سبب تشنت اقتصادیەوە عادتا هاتبوە درجەی اضمحلال

مقصد لەم مثالە اوەیە کە معنای بین الدولی قوت پارەیە لام وایە بەم اعتبارە ایمە کوردەواری موجودیتیك و قوتیکمان نیە .

ماوەتی

—)§(—

**هەوالی دەرەوە :**

انقلابات لە جزیرا

برلین — لە جزیرة العرب او عصیانەی کە هیە بلاو بوەتەوە ، ابن السعود مقابل بە عاصیەکان هرچی قوتی هیە لە نزیك طایفەوە کوی کردوتەوە و او فرقە و عشایرانەی کە عصیانیان کردوە تخمین شصت هزار کسی لی اکری ، امانە هموی لە دوری جدەدا دستیان کردوە بە تعرض بو سرای ابن السعود .

---

صحت جلالات ملك معظم بریطانیا

لندن — جلالات ملك بریطانیا کە بە واسطەی نخوشیەوە اسیر فراشە . عموم هیئت طبابت لوندرە و دوقتورەکانی خاص خوی بە صورتیکی دائمی بە هموو نوعە وسائطیك خریکی تداوین .

بنا لە راپوری ١٤ ی مانکی هیئت صحیە معلوم بوە کە جلالتی لە تهلکە نجاتی بوە ونخوشیەکەی غائلەی نماوە والین هرچند بە واسطەی ضعف و بی قوەتیەوە شکاتی لە وضعیت وجوادی خوی هیە ، فقط لە دوقتورەکانەوە معلوم بوە کە برە برە برەو چاکی اروا .

---

سفیر عمومی مصر بو عراق

قاهرە — استاد مخلوف بك لە طرف حکومت مصرەوە تعین کراوە بە قونسلوس عمومی مصر بو عراق و لە دوای دو هفتەی تر حرکت اکات بو عراق .

بەم مناسبتەوە لە قاهرەدا دعوتیکی بو قونسلوس عمومی عراق لە مصرا کردوە .

---

کشف جمعیتیك کە خریك بون رئیس جمهوری امریقا بکوژن

برلین — رئیس جمهوری امریقا کە لە طرف جنوبا سیاحت اکات ، بو کوشتنی جمعیتیك تأسیسی کردوە و لە ری شمندفرەکەدا بومبایان شاردوەوە فقط لە پیشەوە لە طرف دائرەی پولیسەوە کشف کراوە و بعضیك لە اعضای جمعیتەکە حبس کراون .

غزته‌ی وفد مصری

لندن ــ جمعیت حزب وطنی مصـر له لندنا دستیان کردوه به درهینانی غزته‌یك به ناوی وفدی مصری‌یه‌وه .

ولی عهدی بریطانیا

لندن ــ ولی‌عهد خوشه‌ویست بریطانیا ( پرنس اوف ویلـس ) له دەی مانك‌دا مواصلتی لوندره‌ی فرموه‌وه وله استاسیونی [ فیکتوریا ] دا بصورتیکی فوق العاده استقبال فرموراوه .

حرکت ارض له ازمیرا

استانبول ــ امجاریش دو کرت حرکت ارض واقع بوه له ازمیرا یکیکیـان زور دوای کردووه اهالی له ترسـانا چونته دره‌وه . فقط بی ضـرر بوه .

تورکیا و حروف لاتینی

استانبول ــ حکومت تورکیا له‌مـال‌تازه‌وه همو قوایدیکی به‌حروف لاتینی طبع اکات . له‌براوه زور به عجله هول وسعی اکات که‌اهالی و بالخاصه مامورەکانی به تواوی فیری خویندن و نوسینی ام حروفانه ببن و بینیکی که مامورین عمومی به‌مجبوری امتحان اکرین اوانه‌ی که فیری نه‌بوین و ناجح نه‌بن استخدام ناکرین .

عموم مطبوعاتیش مجبور کراوه که له سال تازه‌وه بهم حرفانه غزته دەر بهینن .

قابریقه‌یکی خوری له اطنه دا

استانبول ــ قابریقه‌یکی خوری له اطنه‌دا که دو سال له‌مه‌و پیش له طرف شرکتیکی المانه‌وه تاسیس کراوه سوتاوه و ٣٠٠٠٠ هزار لیره‌ی تورکیا خسارتی بوه .

جلالت ملك عراق

بغداد ــ رکاب جلالت ملك معظم عراق له بیاتی « ١٦ » ی مانگدا مواصلتی بغدادی فرموه‌ته‌وه و له طرف وزرا و رؤسای دوائر و اشراف اهالی‌یه‌وه استقبال فرموراوه .

ــ)§(ــ

صورت تلغرافیکی فخامة رئیس الوزرای عراقه که بوه وزیر مفوض لوندره‌ی نوسیوه

لطفا به ناوی حکومت وملت عراقه‌وه احوال صحة جلالة ملك جورج بپرسـن و عرضـیان بکن که‌همو عراقیك دوعا و تمنای شفای اکات .

صورت تلغراف جوابیهٔ وزیر مفوض عراق

جلالة ملکه ماری به قلبیکی صافه‌وه مقابل به‌تلغراف حکومت عراق که بو احوال پرسی جلالة ملك جورج نوسیوتی تشکر افرمویت .

هاتن و روشتن

سعـادت متصرف اکرمی ومحترم محاسب لواء بو تماشا کردن وتفتیش ایشوکاری قضاکه روزی پنج‌شمه تشریفیان برده قضای حلبچه و ایواری جمعه عودتیان فرموه .

له رؤسـای پشدر جناب بابکر اغای سلیم اغا وله اغاوات پشدر جنابان بابکر اغای حوسن اغا وخضـر اغای حاجی رسول اغا و احمد اغای بایز اغا ومینه اغای علی اغا وله‌مأمورین‌سابقی‌قضای‌رانیه‌حاجی‌شفیق افندی روزی پنجشمه له پشدره‌وه تشریفیان هینایه سلیمانی وروزی یکشمه حرکتیان کرد بو بغداد .

## جژنه پیروزه

صبحینی که سه‌شمه و بیست و پنج مانگه روژیکی مقدس و یوم میلادی حضرت عیسی (ع) یه و جژنی عموم ملت نجیبه‌ی عیسوی‌یه . بم مناسبته‌وه جژنه پیروزه له‌کل عالم خرستیان اکین ، و تمامان وایه که الی الأبد همو سالیك به مسعودیت تصادفی ام جژنه و ام روژه مسعوده بکه‌نه‌وه .

زیان

---

مبعوث سلیمانی محترم حمه صالح بك روژی یکشمه تشریفی برده بغداد .

مدیر ناحیه‌ی سندی محترم محمد رفعت افندی امین افندی تشریف هیناوته‌وه سلیمانی .

محترم حه . . . لك مدیر مکتب ثانوی کرکوك و مفتش مدارس کو . . . تفتیش مکتبه‌کانی ایره تشریفی هیناوه‌ته سلیمانی . و . . . ودتی فرمووه کرکوك .

---

اعلان

له‌بر اوه . . . هیچ حادثه‌یك رو نه‌دا ، لو اثنایه‌دا که طیاره ایته‌یته . . . حل استی ، هاتوچوکری همو جواری محل طیاره بو چند دقیقه‌یك لازمه خویان تعطیل بکن له اثنای هلسان و نیشتنه‌وه‌ی طیاره‌دا امدو شد به صورت قطعیه ممنوعه .

متصرف سلیمانی

اعلان

خانویك که له‌محلهٔ کویژه واقعه و مرقمه به (١٠ — ٦٤) وبه اعتباری سه بش دو بشی هی مدعی علی افندی کوری قادر آغا و بشیکی هی حبیبهٔ خوشکیتی لهم محکمه‌یه‌دا له طرف مدعی علی افندی مزبوره‌و دعوای قسمتی اقامه کراوه و له‌بر اوه که له مدهٔ احاله‌ی موقته‌دا له مدعی بولاوه که به سیصد روبیه طالب بو مشتریکی تر ظهوری نه‌کرد و له‌بر اوه که ام بدله له قیمت مقدرکه کمتره بناءً علیه اوا بو پانزه روژی تر خرابه موقعی مزا یده‌وه اوانه‌ی که طالب به شرای خانوی مذکورن به صدی ده تأمیناته‌وه له‌ظرف مدهٔ معینه‌دا مراجعت به‌محکمه‌ی صلح سلیمانی و دلال توفیق آغا بکه‌ن والا احالهٔ قطعیهٔ اکیشریت .

معاون حاکم منفردی سلیمانی

---

له‌دائرهٔ طاپووه :

اعلان

خانویك که له کره‌کی ملکندی واقعه . . . حدوده شمال شرقی طریق عام وشرقی جنوبی خانوی ٥ — ٣٠ تسلسلی ٣٨٣ که عائدی رحمة حاجی عایشه . . . جنوب غربی تکیهٔ ٨ — ٣٢ اسلسل ٤١٠ که عائدی خلیفه محمده وتواو کری به خانوی ١٢ — ٣٠ تسلسل ٤١٥ که عایدی محمد شیت کوری احمده غر . . . بی به خانوی ٩ — ٣٠ تسلسل ٣٨٥ که عائدی . . . ن کوری محمده وتومروی ٧ — ٣٠ تسلسلی . . . به ناوی ورثهٔ عزیز کوری بکر که رحمه . . . وقاط تلمجیلیه مجددا طاپو اکریت هر کس حقوکی . . . تاریخ ام اعلانه‌وه هتا ٣٠روژیتر باوراق رسمیه . . . رسمیه‌وه مراجعت به دائرهٔ طاپو بکات . . . بم . . . اعلان کرا .

---

اعلان

له اعتبار ١ — شباط — ٩٢٩ همو وسائط نقلیه له‌جیاتی طرف چپ که ایستا جاریه لازمه جهت راست ریکا بکرن

اکر دو اوتومبیل له استقامتیکا پیش و یا پاش یك برون واکر اوتومبیل پشته‌وه ایه‌وی تی‌پری اوتومبیل پیشه‌وه بکات لازمه او اوتومبیله‌ی پشته‌وه طرفی چپی اوتومبیلی پیشه‌وه بکری انجا تی‌پر بکات وبروا .
اکر دو اوتومبیل برامبری یك هاتن له سر هر دو کیان لازمه طرفی راستی ریکا بکرن انجا تی‌پر بکه‌ن برون .

مدیر پولیس

---

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانیه

بو همو شتیك
عبارات بەناوی ادارەخانەوە
اکری
§
ادارەخانە لەسنای الدیەدایە
هنوان ، سلیمانی ژیان
یکی بە آنەیکە

# ژیان

هو شتیك اوەس هفتەی دو جار دردەچی غزتەیکی کوردیە

کرپار
بەشش مانك پینج
بەسالیك دە روپیە دەدا
بو دردەوە اجرت
پوستەی علاوە ئەکری
شش مانك کمترابونە قیدناکری
اعلانات
دیریك ٦ انە دەسینریت
یکی بە آنەیکە

١٥ رجب ١٣٠٧ ... ١٩٢٨ [پنجشمه] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦

## اجتماع مج

* * *

روژ شمەی رابوردو ... ٢٠ ... ام مانگەی

کرد ، بەمناسبتی حلول میعادی ... مجلس امت عراق اجتماعی فرموە ، و لەم دورەیە ... رتن اوق همو دورە.

کان بو ترقی و تعالی حکومت ... کلی مسائل مهمە یان تودیع اکری و باخصوص مسائل ... که له همو شتیك زیاتر ... ی عراق تودیع و تصدیق اکری ، تمنامان وای ئەم دورەیەشدا وکیلە کانمان بو غایە و هدفی اصلی کە تامین کردنی سعا. دت و ترقی و تعالی حکومەتەکە ـــ ملتەکەیە و بو ام غایە مقدسە کە وجیبەیکی ذمتیانە لەسعی کردن قصور نەرمون

چونکە همو ازانین حکومت حاضرەی عراق کە حدو دەی جنو بالەکروی فاو کورفزی بصرەوە دست پی اکا و شمالی نوساوە بەاراضی ایران و تورکیاوە و شرق و غر بی هتا حدود سوریە و ایران امتداد اکات ، ام ملتە ی ایستا لەم اراضیەدا اژی چند قرنیك لە حریت و سرپستیت محروم بو بو و بەدست ادارەی اجانبەوە گیری خوارد بو ، تاریخ تبانی اکات کە لە سر ام اراضیەیە

قیمتە کە همو مشتبکی پارچە النونیکە چند اردو سرکرا وەتەوە و چند حکومت استیلای کردوەو چند انقلابا ت و ادارەی دیوە ،

نتیجە وکو حرب عمومی انکشافی دا بە دماغ و افکار کلی ملتی منالومە . و بە واسطهٔ علم و فنیك کە لە غربەوە رژایە شرقەوە و زوری بە واسطهٔ شفقتی حکو مت بریطانیاوە . عراقیش نجاتی بو و امرو حر و سر بست وکو سائر دولی کە اژیو بو تأمین کردنی استقبا لیکی رونالك بو خوی هولی ادات .

لەبر اوە ابی بزانین و استفادە لەم فلفە و لم وضعیتە بکە ین و بو اوهٔ الی الابد ژینیکی مسعود بو خومان تأمین بکەین و بواوە بکینە مقابل ملتانی کە و دوانە کەوین ابی بە نوبیاك تی کوشین کە صد بازمان بکین بە هنگاویك بەو نوعە بو پیشەوە بروین .

امرو چونکە عراق مرە احسن ترین ادارەی چنك کوتوە و بە صورتیکی دیموقراطی ـــ مشروطیت ادارە اکات و همو مسائلیکی تودیعی ملت کراوە و ملتیش ام وکیلانەی بە تمنی خوی انتخاب کردوە . ابی و تیلە.

کانمان بزانن : که مقابل به هه‌مو وضعیتیك و اداره‌یه‌کی حکومت هر اوان اتامسرین وملت مقابل به هه‌موخرابه‌یك اوان مسئول اکات وبرامبر به هه‌مو چاکیه‌ك هر اوان تقدیر اکات .

هر چند انکار ناکری هتاکو ایستا وکیله‌کانمان له هه‌مو دوره‌یکدا قصوریان نفرموه . وترقیاتیك که به نسبت سال به ساله‌وه کردومانه معلومی اکات که حکومت ووکیله‌کانمان بو احیا کردنه‌وه‌ی ام ملته تی کوشاون .

بلام امید اکین لم دوره‌یشدا هه‌مو شتیك برطرف بکن وبو منفعت عمومی ام کاته‌یه که اساس مقصد هر امه‌یه به هه‌مو قوة وهتریانه‌وه بی افراط کل حکومت تشریکی مساعی بفرمون و ام غایه مقدسه‌مان بوتأمین بفرمون . وملتیش مقابل به هه‌مو تقلاو زه‌شیك اوان خوی به‌مدیون شکران یان ازانی ودائما تمنای موفقیت یان اکات .

نه‌خوشی اجتماعیمان :

مصاحبه — ٤

محافظه‌کاری ، عنعنه پرستی له حیات اجتماعیه‌ماندا باشماوه‌یه

* * * *

فرض محال لاعلی التعیین هر بندریك « ویقوتازیی » له اعه کرد حالمان چی ابیت ؟ له فرضیکی وهادا چاره‌ی احسن هر وك اجداد اولیمان چونه‌وه پیستی حیوان ، کلای دار خواردن وله اشکوتا دانیشتنه .

له‌قدیمه‌وه اکیرنه‌وه : چوار پینج پشتمان لمو پیش جاوی ریزه وکلاش هورامان هه‌مو احتیاجیکی لباسیانی تأمین کردوه . شه‌ی نیه نسل حاضر بم شته بسیطا نه اداره ناکرن . فقط مع الأسف مقابل بهم ترقی و تجدد استهلاك و مصرفه هیچ علامتیکی سرکوتن وپیش کوتن له قوه‌ی استحصالیه‌ماندا نیه .

جولای بدبخت ایستاش خریکی جاوو خامه ، چیناوی وچیتی لاییر نیه ، رەزەوانی هزار باسوق و دوشاو به چاکترین و منتهای ثمره‌ی تراوی نی ده‌کا . فابریقه تقلید نازانی چیه و یا تجاهلی لی اکان .

خوا کاری بلدیه راست بینی که یکی له شروط استحضاری چاپخانه‌که‌ی قنه‌یه‌ی کویز وکورسی حه‌یزران بو و الا به سبب محافظه‌کاری چاپی و عنعنه پرستی دارتاشه کانمانه‌وه ایستایش هر له سه‌ر کورسی رقی بی بالپشتی دا انیشتین .

لەوا حالی مه‌بن که‌امه کشتی به‌سبب جهالت و تی نه گیشتنه‌وه‌یه ، بلکه قسماً وایه ، فقط به‌شی زوریان له اوضاع دنیا و احوال اقتصادیه نسبتاً باخبرن . اصل قه‌تله‌ی مهم ام محافظه‌کاریه امه‌یه که باوك و باپیر امه‌ی نکردوه ، لادان له ریکای اوان ، تجدد پیشان دان یعنی وعنعنه نا پرستی ، بامت ، کناه ، عیبه ... مسئله امه‌یه »

{ ر : ن }

هوالی دره‌وه :

صحة جلالة ملك بریطانیا

بنا له راپورتی هیئت صحیه که له بیانی (۱۸)ی مانك دا داویانه معلوم بوه که هرچند جلالة ملك شه‌و نختیك ناره‌حت بوه فقط به نظر عمومیه‌وه برو چاکی و برو افاقه اروا .

وراپوری ایوارەی ئەمین روژ الی کەبە سورتیکی عجله
برو چای اروا .

---

صحة جلالت ملك انكلتره

لندن ـــ بنا له راپوری (۱۹) مانك هیئت صحیه جلا
لت ملكی انكلتره او روژه صحتی له جی خوی بوه و
مستر بحا وقتی رابواردوه .

شفقتی ولیعهد انكلتره برامبر بەعمله

ولیعهد انكلتره لەکل مواصلت لوندرەی دا زور
شفقتی لەکل عملەی معادن خلوزەکان واندوه و طلب له
حکومت کردوه کەمقداریکی زور پاره تخصیص بکات
بو ژن ومنال و مالەکیان .

---

معاهدەی دولی و ایران

لندن ـــ مجلس مبعوثان ایران او معاهده موقتەی که
له کل نمسه و جیکوسلوفاکیادا کردویانه تصدیق کردوه
و ملحق معاهدەکەی ایران و افغانیش تصدیق کردوه .

---

انقلاب افغان

لندن ـــ سیر اوستن جمبرلاین بیانی کردوه که تلغرا
فیکی لەسفیری افغانەوه ورکرتوه هر چند الی عاصیکان
هجومیان کردوته سر کابل بلام لەطرف قوة حکمتەوه
مغلوب و سر کردەکیان کوژراوه و بەمسببەوه انقلابه
کە تسکین کراوه . فقط راپور سبحینی او روژه الی
أساساً انقلابەکە لەجلال آبادا دستی پی کرابو بلام تمکن
نەبوه همو معلوماتیك لەوێوه ورکرین فقط وضعیتی
کابل خرابه لەریاستی پیشی شهیر (باجه ساقو)دا قسمیك
له عشائرەکان هجومیان کردوته سر کابل ودو قلایان
کرتوه و چونکه هیئت سفارة بریطانیا چوته خارج شار
تمکن نبوه لەعطلة بیتلەوه کەلەناو شاردایه خبریان لی ور
کرین بلام حکومت هندستان طیارەیەکی ناردوه بو
اوی وبە اشارة خبری ورکرتوه کە وضعیت خراپ له
براوه حکومت هندستان همو تدابیریك اتخاذ ئەکات بو
محافظة رعایای بریطانیا .

---

حکومت پاراکوی امریقا

لندن ـــ له سر محاربەیك کە له بین حکومت پاراکو
ای و بولیفیەدا واقع بوه رئیس جمهوری پاراکوای
دعوتی همو اهالی کردوه کە لەعمری (۱۸)وه هتا(۲۲)
سال همو ببن به عسکر .

عصبة الامم ومحاربة امریقا

رویتر ـــ مجلس عصبة الامم قراری داوه که
تلغرافیك بنوسی بو حکومت پاراکوای وبولیفیاوه که
اصیحتیان بکات واز لم محاربەیه بهینن چونکه لەسر
عصبة الامم لازمه موافق مادهٔ ۱۳ مین میثاق عصبة
ابی تحقیق اسباب منازعەکه بکات و او فصلیان
بکات .

---

فیلویك طیاره بو عصبة الامم

مستر کلیفورد تقریریکی داوه به عصبة الامم الی
لازمه له زیر ادارهٔ ام جمعیتەدا فیلویك طیاره ببی
و انشا بکرین کە لە وقتی خصومت بین حکومتەکانا
استعمالی بکات .

محاربه له امریقادا

لندن ـــ حکومت پاراغوای و حکومت بولیفیا
لەسر منازعەیك کەلە بینیانایه دستیان کردوه به محاربه .
پاپا مراجعت به حکومت اسپانیا کردوه که بکه
ویتە بینەوه و صلحیان بکات .

## تشکرات قونسلوس تورکیا

بغداد ـــ قونسلوس تورکیا طلعت قایا بك تشکر نامه‌یه‌کی بو رئیس الوزرای عراق نوسیوه الی : ئه له تلغرافیك که له جمعیت هلال احمر تورکیام ورگرتوه له خصوص اعانه‌یك که دو برای عراق « ٥٠٠ » لیره‌یان ناردوه بو منکوبین ازمیر ، به ناوی حکومته که‌مه‌وه تشکری عراقیه‌کان اکه‌م مقابل بم لطف و شفقته‌یان .

## داخلی :

### خط تلفون به بغداد و سلیمانی

بغداد ـــ به مناسبتی تواو بونی تمدید خط تله‌فون به بغداد ، کرکوك ، سلیمانی یه‌وه دائرهٔ تلغراف و پوسته له خانقین ، شهربان ، قره‌غان ، بعقوبه ، فلوجه و مرکز شرکت نوط خانقین و کرکوکیشدا مرکزی تله‌فونی کردوته‌وه .

---

بنا له‌تلغراف معالی وزارهٔ داخلیه که بومقام‌عالی متصرفی هاتوه و له مقام عالیشیانه‌وه به دائره‌کانا تعمیم کراوه لازمه له روژی شمهٔ ٢٤ ی مانکه‌وه وکو لای خواره‌وه مأمورین له دوائري حکومتدا دوام بکه‌ن .

غیری یك شموان همو روژیك له‌ساعت « ٩ » ی افرنجیه‌وه هتا یك ، پاش نیوه‌روان له‌دوه‌وه هتا چوار . یك شه‌مووان بیانی له‌نووه هتا یك .

### اعلان

تله‌فونی سلیمانی له خطی کرکوکه‌وه ربطی بغداد کرا و ایستا مقابل به اجرت له‌کل بغداد و مراکزي بینی سلیمانی و بغداددا قسه‌کردن ممکنه لیسته‌ی اجرت مکالمه‌ی تلفون له‌کل بغداد و سلیمانی و له‌کل او مراکزه‌ی که له بینیاندایه له‌ژیره‌وه بو معلومات اعلان کرا .

متصرف سلیمانی

| انه | روپیة | |
|---|---|---|
| ١٢ | ٣ | بغداد |
| ٨ | ٣ | بعقوبه |
| | ١ | چم‌چمال |
| | ٤ | فلوجه |
| ١٢ | ٢ | کجل کجل |
| ١٢ | ٢ | خانقین |
| ٤ | ١ | کرکوك |
| ٨ | ٢ | قره‌غان |
| ١٢ | ٣ | شهربان |
| | ٢ | طوز |

ام اجرته‌ی که‌له‌سره‌وه نوسراوه بو سه ـــ ٣ دقیقه و یا له‌سه دقیقه کمتر قصة کردنه .

--)§(--

---

### اعلان

بو آبونه‌ی هر مجله‌یه‌کی عربی آرزوت کرد مراجعت به محل میخائیل ساکو بکه »      ساکو

---

### اعلان

له اعتبار ١ ـــ شباط ـــ ٩٢٩ همو وسائط نقلیه له‌جیاتی طرف چپ که ایستا جاریه لازمه جهت راست ریکا بکرن .

اکر دو اوتوموبیل له استقامتیکا پیش و یا پاش یك برون واکر اوتوموبیل پشته‌وه ایه‌وی تی‌پری اوتوموبیل پیشه‌وه بکات لازمه او اوتوبیلای پشته‌وه طرف چپی اوتوموبیلی پیشه‌وه بکری انجا تی‌پر بکات وبروا اکردو اوتوموبیل برامبری یك هاتن له سر هر دو بیان لازمه طرف راستی ریکا بکرن انجا تی‌پر بکان برون .

مدیر پولیس

---

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانی

بو همو شتیك

مخارات بهناوی ادارهخانهوه

اکری

§

ادارهخانه لهبنای بلدیهدایه

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی به آنهیکه

کریار

بهشش مانك پنج

بهسالیك ده روپیه دهدا

بو درهوه اجرت

پوستهی علاوه ئهکری

شش مانك کمتر ابونه قبول ناکری

اعلانات

دیریك ٦ آنه دهسینریت

یکی به آنهیکه

همو شتیك اوسی هفتهی دو جار دردهچی غزتهیکی کوردیه

٢٢ رجب ١٣٤٧ ٣ کانون ثانی ١٩٢٩ [پنجشمه] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦

## مکتب بچکن — و بچهکانمان

له پیش همو شتیکدا ترقیات ملتیك بهوهوه تأمین اکری که نسل اتی به تربیهیهکی چاك پیبکهیزی که له استقبالا اوانیش تشکیل عائله بکن و بره بره ملتهکی فعال صاحب عزم و تربیهیهکی اساسی پاش پی ، معلومه که تربیهی عائله وی تأثیراکاته اولاد ، چونکه منالیك لهشهو و روزیکدا شهش ساعت له خارجدا لای مربیهکانی مکتبی تربیه وراکری باقی زمانهکیتری لای ابویتی ابی او تربیهیهی کهلهعائله کهیهوه وری اکری زیاتر تأثیری تی اکات و اچیته دماغیهوه و بوی ابی به اساس و غیری امیش منال چونکه هتا کوره ابی انجا انیر ریته مکتب زیاتر مربوطی دایکیتی و تنها مرداپك بخیوی اکات ، کواته لازمه ژنهکانمان — دایکی منالهکانمان لهپیاوهکانمان چاکتر صاحب عقل و اخلاق بن و عادتا مربیهیهکی وابن کهبتوانن مقابل به تجددات و تربیهی حاضره منالهکانیان پیبکهینن . لهبراوهلازمه بچهکانمان بنیرینه مکتب و لهسر تربیهی حاضره پیبگهیترین که تشکیل عائلهیان کرد منالهکانیان چاك گوره بکن کهبو وطن و ملتهکهیان عضویکی فعال بن .

ایمه انکاری ناکین و زورمتشکرین که حکومت حاضرهمان وکو شفقتهکانیتری بو تأمین استقبال منالهکانیشمان سعیفرمو . و بهقدر احتیاجات ملتهکه مکتبی بو کردینهوه . و بو اوهٔ کیچهکانیشمان جاهل نمینهوه و تحصیل دیدهبن سه سال لهوپیش مکتبی کچانیشی بو کردینهوه . وبه مسروریتهوه الین اولهمین بهواسطهٔ معاونتی حکومت و دووم بهسبب جهد و کوشش مدیره ومعلمه محترمهکانیهوه . ام مکتبه لهظرف ام سه سالهدا حتی فوق التصور ترقی کرد و موجودیهتیکی به قیمتی پیشانی ملتدا و بم سببهوه ملتیش به خواهش و مسروریتهوه همو کیچهکانیان ناردهناوی و امرو موجودیکی زوری هیه . به نوعیك که محقق هتا بینیاك وا بینیتهوه به واسطهی ام کیچانهمانهوه که تشکیل عائلهیان کرد نسلی آتیمان موجودیتیك پیشان ادات و عضویکی فعال ابن بو وطنهکیان .

بلام لهم روژانهدا بیستمان که مربی ام کچانه — مدیرهٔ محترمهٔ ام مکتبه چونکه رفیق حیاتی ایره نیه وله جیهش مراقیدا مستخدمه ولهبر اوه که مکتبیان

نابی لە یك جیا ببنەوە ایەوی لەم وظیفە مقدسەیە استعفا بکات ولە مکتبەکە جیا ببێتەوە . وام خبرە وکو ملتەکەی محزون کردوە زور تأثیری کردوتە کچ، کانیشمانەوە .

انجا وکو لەپیشەوە عرضمان کرد وەهو کەس ایزانی کە یگانە ترقی وتعالی وتجددیك کە لەم مکتبەدا هیە هر بە سبب جهد وکوشش مدیرۀ محترمۀ حاضرە یانەوە هاتوتە وجود . وحقیقتا انکار ناکری کە محترمە مدیرەیکی تجدد پرور ، فعال وزیر خدمتی بوام ملتە سبقتی کردوە . لەبر امە طبیعی لە مفارقتیا ام انتظامەی نامینی وام رغبتەی کە هیەتی کم ایبێتەوە .

استرحام اکین لە حکومت زیالحاصە لە سعادت متصرف معارفپرور مان کە لەهر کس زیاتر بو تأسیس وترقیات ام مکتبە ... فرموە . انجاریش جهدمان بوبفرموی وترقی ... مکانمان بفرمون کە تقدیم ... کردوە .

ومطالب و استراحتی مدیرە ... بفرموی وبم سبباوە ام معهدە علمیە وام مؤسسە عالیە بر دوام ولە ایستا زیاتر ترقی بکات . ودلی ... کانیش مسرور ببی *

⸻

هرزەکاریت بەبارێزە پیریت خوی دور اخاتەوە

* * * *

لەبراوە ای لاو ، اگر چە ترشی زەحمتیش دیت فقط لازمە ثبات بکیت وهرزەکاریت بپارێزی چونکە بو زمانی پیریت ذخیرەیکی زور چاك کو اکیتەوە و استقبالیکی روناك بو خوت حاضر اکیت و دیسانەوە تکراری اکینەوە کە ام ذخیرەیە هر بە خو پاراستنی هرزەکاریتەوە ایبت .

مثلا اگر ترجمەی حالی پیاویکی گورە وەتنان وبنینەوە کە بە سعی و کوششی خوی لە فقری نجات دابی و کوتبیتە رفاە حال و خوشیەوە ، ابی بزانین کە ام پیاوە بە کوشش و هولدان و بە صبر و ثباتیك کە مقابل بە جور و اذیتی زمان کردویتی و کە حفظی خوی محافظە کردوە کیشتوە بم پایەیە .

زور لاو بیتراوە کەلە اولی عمریدا امید استقبالیکی چاکی لی کراوە ، بەلی نتیجە بە واسطەی عدم محافظە و سوء استعمالی دوری لاوی یانەوە ام امیدەیان وون کردوە و لمانە قسمیکی زوریان لە پیش صرف کردنی عمر طبیعی خویانا بە امل و امیدیکی زورەوە چونەتە ناو خاکیان بە نصیب خویان کردوە وام امل و امیدە لەگل خویانا نیژراوە ، اگر لە حقیقت حالی امانە ورد ببینەوە معلوم ابی کە بەواسطەی افراطەوە و عدم عفتەوە و یا بە نتیجەی تخریبکاری الکولەوە بە دستی خویان خویان ضایع کردوە ،

لم چند کلمەیە کە لە پیشاوە نوسیبومان مقصدمان لەقسمیك لاوەکانمانە ابینیز خویان اکن بەقوربانی هرزەکاری و بە فدای آرزو . و دوا روژی خویان لیك نادنەوە کەلە دواییدا غلطیك و بلایەکی گورە اهینن بە سر خویانا . گنجیك : هرچند خوی بە هیز و بەقوت بزانی ، سر کلمیکی سور ، چاویکی تیژ و کشی بی بلام اگر لەایشیکی بە قوتدا زو ماندوبو و لەخوی ورس بو ومأیوس بو معلومە کە او گنجە نخوشە . بلام ام نخوشیە لەماسولکەی دست و قاچ و لە ناو گوشت وپوستدا نیە بلکو لەمیشك و لە دلدایە چونکە بە افراطی استعمال کردنی آلکول و بە زیادی صرف کردنی قوۀ شهوانیە ام دو عضوە متأثر ابن . وبم واسطەوە بە عجلەتر زوتر لەپیش اوەیدا کە وجودی طبیعتا بکاتە دورەی پیری

لەبریکا پیر ابی و لذت کنجی و(لاوی) خویان وون اکەن . ونیشانەی ضعیف بونی ام دو عضوە زو ماندوبونی دماغ و ضعیفی دلە کەامەدوانیش بە بائیریکی کم و سوك و آسان زور مانکو این ودلە کوتەیان پی اکات . و بەم سببەوە لاوەکە توشی عصبیت ،ترسنوکی وبی جسارتی ابیت . بلام مصیبتی کورە زوری لیرەدایە کە ام نوعە کسانە وکو ( روزجون آشکرایە) امیشی‌زانن و لەکل امەیشدا لە افراط سفاهت خویان دور ناخنەوە وزیاتر دوامی لە سر اکن .

کەرابو لاویت بەبارزە ... و اعتدال وعزم وثبات ولاویکی پاك ... بەریت دور بکەویتەوە . وبەم سببەوە ام ملتە معصومە و ام وطنە جوان وبە قیمتە استفادەت لی بکات . چونکە وطن چاوەری ایوەیە وهر هیوای بە ایوەیە . و ایوەیش ای لاوان بەزیتان پیا بیت .

حلبجە : ع : عزیز

---

## هوالی دەرەوە :

روبتر

٢١ /١٢/ ٢٨

انقلابات افغانستان

لندن ــ ام سە روزەلە کابلەوە خبریك ورنکیراوە ، وا ظن اکری کە استاسیون (بی‌تل) کە دومیل‌لە سفارتخانەی بریطانیاوە دورە سقوطی‌کردبی و کوتبیتە دست عاصیەکان .

تایمس نشری کردوە الی ایستا هموانقلابات لە کابل و اطرافیایەتی . و رعیەی اوروبایی کە لەویدان لە خطەردان . و حیات ملك و ملکەی افغانیش لەخطردایە .

### وضعیت ایران

بصرە ــ حکومت ایران بەطیارەبەناو عشائرەکەدا بیان نامەی نشرکردوە . و الی او عشائرانەی کە عصیانیان کردوە اگر لە ظرف مانکیکا سلاحەکانیان تسلیم حکومت بکن عفو اکرین .

بصرە ــ ملك ابن‌السعود مواصلت (عقیر)ی کردوە و . همو عشائرەکانی نجدی کو کردوتەوە و نصیحتی کردون کە احترام حدود عراق بکرن . و معاملەیکی خراب نکن .

---

### ایران

طهران ــ عساکر ایران لە اطرف عمرە و حوزەدا بە سر عشائرەکانا موفق بون . و زور لە رئیس عشائرەکان تسلیم حکومت بون .

---

### بین چین وبریطانیا

لندن ــ وطنیەکان چین الین ام معاهدە تازەیەی کەرکیای بین چین وبریطانیا دایلە لە سر اوەی کە بریطانیا اعتراف کردوە بە حکومت وطنیة چین . والین ام، لشانەی صمیمیتە لە بین چین وبریطانیادا ولەم معاهدەیەدا بریطانیا وازی لەو رسم کرکە هینارە کە جاران معمول بەبو لە حدود هند و چین دا *

---

### دنکی جلالت ملك جورج

لندن ــ شرکت غراموفون کولومبیا مأذونیەتیکی خصوصی لە جلالت ملك جورج بریطانیا ورکرتوە لە. سر آرزوی عمومی کە او نطقەی لە وقتی انشاأ کردنی جسریکی تازەی سر تایمس‌دا فرمویەتی چند قوانیکی لی پر بکاتەوە .

اقلابات افغانستان

لندن ــ قونسلوس افغان له لوندرەدا بیانی کردوە که بەواسطهٔ (بی‌تلەوە) بەری موسکودا له گل افغاندا غاره هیه . او عشائرانەی که عصیانیان کردوە (٧٠٠٠) کسن وهمو جردە و ری کرەکانن و بە لباس عسکری افغانەوە هجومیان کردوە له طرف عسکری افغانەوە مغلوب و رایان کردوتە سر شاخیك و لەمودوا حکومت قوة انیری بو محافظهٔ قونسلوس خانه بریطانیا

سری سال

پیری که یکی مانك بو تصادفی سری سال و جژن (کارپي وال) ی کرد ام روژه روژیکی مسعود ملت نجیبهٔ عیسوی‌یە بم مناسبتەوە تبریك و تمنای مسعودیتی ام مله اکین .

ژیان

قابینهٔ عراق

بغداد ــ اوەی غزتهٔ نهضه نوسیبوتی له خصوص قابینهٔ عراقەوە ، مدیر مطبوعات بە رسمی تکذیبی اکات .

صوت العراق

بغداد ــ معالی مزاحم بك الباچەچی طلب له وزارهٔ داخلیه کردوە که مأذونیەتي بدەنی غزتەیکی سیاسی بە ناوی (صوت العراق) ەوە دربهیَنیَ .

النجم

بغداد ــ له ادارهٔ چاپخانەی کلدانیدا له موصل مجلەیك انتشار اکات بە ناوی (النجم) ەوە .

## هاتن و رویشتن

سعادت متصرف اکرمی بو تماشا کردنی ایشوکاری ناحیه که بیانی روژی شمەی ٢٩ ی مانك تشریفی بردە مرکزی ناحیەی بازیان و ایواری عین روژ عودتی فرمووە .

سعادت متصرف اکرمی و محترم معاون مدیر اشغال سلیمانی جناب محمد علی افندی روژ یك شمەی ٣٠-١٢-٢٨ تشریفیان بردە قضای هلبجه ، ناحیەی خورمال و ایواری عین روژ عودتیان فرمووە .

سعادت مفتش اداری و رفیقەی محترمەی میسس لاین بوارەی دو سه ــ ٣ روژ رابوردن روژ شمەی ٢٩ ی مانك حرکتیان فرمو بو موصل .

ضابط استخبارات قوای هوائی محترم جناب کاپیتان کینك و رفیقەی محترمەی میسس کینك بوارەی لەجژندا له سلیمانی رابوردن تشریفیان هینابوە سلیمانی و روژشمەی ٢٩ ی مانك له رفاقت سعادت مفتش اداریدا تشریفیان بردە موصل .

اعلان

اشارەیه بە اعلان اجرت تلەفون که له جریدهٔ ژمارە (١٤٧) دا نشر کرابو .

لطفاً اجرت مکالمەی فلوجه بە چوار روپیەو چوار آنه بخوینەوە .

متصرف سلیمانی

اعلان

در [illegible] ادهٔ ناو مرکزی قضای هلبجه خراو ته منا [illegible] بە دوروپیه و نیو له طرف طالب [illegible] یەوە کی طالبی کم کردنیتی مراجعت بە [illegible] .

متصرف سلیمانی

اعلان

له اعتبار [illegible] ــ ٩٢٩ همو وسائط نقلیه لەجیاتی طرف [illegible] ایستا جاریه لازمه جهت راست ریکا بگرن

. اکر دو اوتو [illegible] له استقامتیکا پیش و یا پاش یك برون واکر او [illegible] بشتەوە یەوی تیپری اوتوموبیل پیشەوە بکا [illegible] مه او اوتوبیلەی بشتەوە طرق چپی اوتوموبیلی پیشەوە بگری انجا تیپر بکات وبروا .

اکردو اوتوموبیل برامبەری یك هاتن له سر هر دو کیان لازمه طرق راستی ریکا بگرن انجا تیپر بکەن برون .

مدیر پولیس

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانیه

بو همو شتیك

مخابرات بە ناوی ادارەخانەوە اکری

§

ادارەخانە لەبنای بلدیەدایە

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی بە آنەیك


کریار

بەشش مانك پنج

بەسالیك دە روپیە ئەدا

بو دەرەوە اجرت

پوستەی علاوە ئەکری

شش مانك کمترابونە قبول ناکری

اعلانات

دیریك ٦ انە دەمیتریت

یکی بە آنەیك

همو شتیك ازمی هفتەی دو جار دردەچی غزتەیکی کوردیە

۲٦ رجب ۱۳٤۷   ۷ کانون ثانی ۱۹۲۹ [ دوشمە ]    تاریخ انتشار ۲۱ کانون ثانی ۹۲٦


## نادی مامورین

* * * *

وکو اصول و عادتە و زور استفادەی لی کراوە امرِ لە ناو همو ملتیکا ، هر صنفە و هر طبقەیك بو خوی جیکایکی خصوصی هیە کە لەوقتی استراحتا تیا کو بنەوە و صحبت و وقتی تیا رابویرن و گفتکو و مباحثە لە مسلەکەی خویانا بکن .

لیرەدا وکو لای سائر طبقات ملت ام اصولە نیە و بو مامورەکانیشمان لەبر بیش خستنی شتی الزم بەسر لازم دا حکومت نەی تانی وە فلو بیك و جیکایکیان بو تخصیص بفرموی .

امرو وکو لە سائر شاران عراقدا ( نادی مامورین ) هیە لیرەیشدا بو اوەی مامورەکانمان لە وقتی استراحتا همو لە جیکایکدا کو بەبنەوە و صحبتیکی صمیمی بکە و پیتە بینیان و لە داخل اداب دا رابویرن و بم سببەوە توشی بعضی سفاهت نەبن لازمە لیرەیشدا فلو بیکی موظفین احداث بکری .

هر چند ناتوانین انکاری بکەین کە سعادت متصرف اکرمیان . دائمی ام خصوصەی هیناوتە پیش چاوی و بو ام مسئلەیە و بو تامین استراحتی مأمورەکان زور تی کوشاوە و همتی فرمووە . فقط لەبر اوەی کە هیشتا جیکایکی وا کە بە عملی ام نادی یە بی نەدوزراوەتەوە و لیرەدا نیە . موقت بو اوەی مأمورەکان همو تیا کو بە بنەوە صحبت بکن وقتی تیا رابویرن لە طرف سعادتیانەوە چایخانەکەی بلدیە تنسیب کراوە .

فقط ، کو لە سعادتیانەوە معلوم بووە و همو کسیش ترتیبات نادی ازانی ام جیکایە جونکە هر عبارتە لە صالونیك و اوطەی تری نیە بە دائمی بە عملی ام مؤسسەیە نایەت و نابی بە نادی . جونکە : نادی ابی اوطەی مطالعە ، اوطەی یاری ، اوطەی نان خواردن و جیا جیا چند اوطەیکی ببی .

لەبر اوە تمنا اکین کە سعادت متصرف معتبر دورەمان هر بە اکتفا نفرموی . ولە سر اوفکرەی کە هیەتی بو ترقیات ملت و استراحت مأمورەکان لەدوای ام زستانە امر بفرمون یا لەوی دا بە درست کردن وبە زیاد کردنی چند اوطەیکی ریا یەکری ابنیەیکی باشمان بو تخصیص ولە ژیر پروغرام و نظامیکی باشدا

تشکیل نادیکی مأمورین ابدعان بو بکری بم سببەوە مأمورەکانمان زیاتریکی مسعود وحیاتیکی منتظمیان ببی *

## هەوالی دەرەوە :

* * * *

اسباب انقلاب افغان

کلکتە ـــ لەو خەبرانەی کە لە آخریا وەرگیراوە معلوم بووە کە عساکر افغان لەبەر عدم تأدیە معاشەکانیان مدافعەیان نکردووە • وطیارەیەکی حکومت بریطانیا لە طرف عاصیەکانەوە سقوطی پی کراوە و جیکیا نیشتەوەی طیارە بە دست حکومتەوە نەهاوە •

چین و المانیا

برلین ـــ هر چند بە رسمی معلوم نە بووە کە چین ٣ شخصی مدرب المانی استخدام کردبی فقط وکو معلوم بووە حکومت چین متخصصین آلمان لە دوائری تلغراف و جیولوجی دا استخدام اکات •

انقلابات افغانستان

پشاور ـــ دو طیارە لە طیارەکانی قوای هوائیەی حکومت بریطانیا لە هندستانەوە حرکتی کردووە بو کابل و قسمیکی تر لە رعایای بریطانیا و لەوانەی کە پنایان بردوە تە بەر سفارتخانەی بریطانیا نقل و نجاتی داوون •

معاهدەی تازەی المانیا و رومانیا

بکرش ـــ مجلس مبعوثان واعیان رومانیا معاهدە تازەکەی بین المان و رومانیای تصدیق کردوە • کە هتا کو ایستا لەسەر بعضی مسائل مالیەی زمان حرب اختلافیان لە بینا بو •

ایطالیا لە طرابلس دا

روما ـــ وزیر مستعمرات ایطالیا او حاکم طرابلس غرب و حاکم برقە استعفایان کردوە • لە بەر اوەی کە ( سنیور موسولینی ) توحید ادارەی بین طرابلس و برقەی کردوە •

بین روس و یمن

حدیدة ـــ مسیو ستانکوف رئیس شرکت تجارەی روسیە کە چند مانکیکە لە یمن دایە ، اجارە بە طیارە چوە بو صنعا و مذاکرەی لە کل امام یحیی دا کردوە و کراوەتەوە بو روسیا •

حکومت حجاز ـــ و حج

جدە ـــ حکومت حجاز بە رسمی تکذیبی او خبرانەی کردوە کە نوسیویانە اختلال لە حجازدا هیە و الی ایستا امنیت و اسایشیکی تواو لە حجازدا هیە و حکومت حجاز خریکە هەمو تسهیلاتیك بکات بو حجاجەکان و الی امسال لە هەمو ممالیك حجاج زیاتر ابی • چل وابور هولاندایی حاضر و تخصیص کردوە بو نقل حجاجەکانی ( زاوە ) •

بین پاراکوای و بولیفیا

واشنطن ـــ نزاع بین حکومت پاراکوای و بولیفیا زور شدتی سەندوە و عساکر حکومت بولیفیا داخل اراضی پاراکوای بووە •

( ای تل ) ایران

محمرە ـــ حکومت ایران لە هەر ممالك جنوبیەیدا استاسیونی ( بی تل ) تأسیس کردوە •

جمعیت تحدید سلاح

جنیف ـــ اعضای تحضیریەی جمعیت تحدید سلاح کە لە سال ٩٢٧ وە اجتماعیان نکردوە اجارە دعوت کراون

که له ١٥ ه ی نیسان ٩٢٩ دا اجتماع بکن و امریقایش قبولی کردوه .

احوال چین

مکدن ـــ همو رؤسا و کورەي(مانچوریا)له ریاست (شیانغ سویه لیانغ)کوری تشانغ تسورلین دا قراریان داوه به همو نوعیك اطاعتی حکومت وطنیەی چین بکه ن و له همو جیکایك و مبانی حکومت بیداغی وطني چینیان هلداوه .

و له سر اوه حکومت وطنیش تقدیری همت و معا مله‌کەی کردون . و شانغ سویه لیانغی کردووه به قو. میسر که مدافعەی شمالی چین بکات .

حکومت ارجنتین

واشنطن ـــ حکومت ارجنتین تبلیغي حکومت بو لیفیای کردوه که هتا کو ام نزاعه تواو نه‌بي نایه‌لم هیچ اسلحه‌یك که مقابل به رسم ترنسیت به ناوما اهات بوت ایستا بوت بیت .

فرانسز

باریس ـ به واسطه‌ی زیادی معاشات مجلس مبعو ثان و اعیان فرانسزەوه .که مسیو بوانکاره اعتراضی لی کردوه . بعضي مشکلات سیاسیه له بین قابینه‌ی فرا. نسزدا پیدا بووه .

طلبه‌ی هندستان

لندن ـــ وکو چون همو ساليك عادتیان بووه امسا لیش به مناسبتی سری سال تازەوه طلبه‌کان هندستان‌له (لندن)دا حفله‌یکیان کرتووه و به تمنا کردنی شفای جلالة ملکه‌وه رایان پواردوه .

صحة جلالت ملك بریطانیا

لندن ـــ جلالة ملك بریطانیا شەوی ٢٨/١٢/٣٠ به صورتیکی باش رای بواردوه .

انقلابات افغان

بغداد ـــ ٥ه ـــ ٣ طیارهٔ کوزه له مقر هنیدی‌یەوه حرکتی کردوه بو کراجی ، لەبراوەی حکومت هند طلبی کردوه که قوەی هوائی هندستان زیاد بکرن که له مسئلەی افغانەوه رعیەی بریطانیایی پی نقل بکری له کابله‌وه بو هندستان .

زراعت لوکەی عراق

لندن ـــ سیر ویلیام همفری مدیر شرکة لوکەی امپراطوریت بریطانیایم نزیکانه مواصلتی بغداد اکات بو تماشا کردنی ایشو کاری لوکەی عراق که له بورسەی «لیفر بول» دا اقبالیکی کورەي پیدا کردوه .

بین عراق و ایران

بصره ـ بعضی له رؤسای عشیرت(بنی طرف) که مقابل به ایران عصیانیان کردبو . التجایان به حکومت عراق کردووه . و حکومت عراق سعي اکات که سلاح یان لی وربگری .

جلالت ملك عراق

بصره ـــ جلالت ملك معظم عراق له وختی زیارتی بصرەدا . له خصوص دو مسئلەی مهمەوه مذاکرەی فرمووه .

١ ـــ انتظام‌دان به معاملهٔ تجاریهٔ خورما .

٢ ـــ وکردنەوەی جوکەیکی زل که اراضی (بور ) ی پی آو بدری که ١٥٠ هزار فدان وسعتی هیە .

تلغراف جلالة ملك عراق كه بو جلالة

ملك بريطانياى نوسيوه

لندن جلالة ملك جورج پنجم :

زور مسرور و متشكر بوم كه بيستم صحة جلالتان رو

چاكى اروا له‌خواى تبارك وتعالى أپاريمه‌وه كه به تواوى

صحتيكى كاملة بى به بخشيته‌وه و به مناسبتى سرى سال

تازه‌وه فوق هه‌مو آماليك تعاى صحة جلالتان اكم .

صورة تلغراف جوابه‌ى جلالة ملكة مارى

بغداد ـ جلالة ملك عراق :

له وكالت ملك جورج دوه ر حاتان لى اكم له قبول

تشكراتم بفرمون مقابل به تلغرافه سميميه‌كت ، وسنو

ن عنيايه‌كانتام »

---

قائممقام حلبچه محترم حميد بك له حلبچه‌وه تشريفى

هيناوه‌ته سليمانى

رئيس عشيرت پشدر محترم بابكر اغاى سليم اغا كه

له كل [illegible] [illegible] عشرات پشدردا بيتك له‌مو پيش تشريفى

بوبو [illegible] عودتيان فرموده .

---

اعلان

بيست و شش عدد قسله‌ى دارى قايمى تكميداني

له هلبچه له مزايده‌دايه . ام داره ٢٦ عدده ١٣ داريان

سه متره دريژى و ١٤ اينج استوريى و ١٣ داره‌كه‌ى

تريان دو متره دريژى و ٧ اينج استوريى له هلبچه به

٤٠ روپيه له سر طالبى كى طالبى كريني مراجعت به

حكومت بكات .

متصرف سليمانى

---

له‌دائرة طاپوره :

اعلان

اراضى‌يك كه له اطراف شار سليمانى واقعه و مشهوره

به جبيكا اصابخانه و محادده روز هلاتى به جبيكا جارى

بونى سرچاوه‌ى كانى‌سارد و شمالى به‌ريكاى عام كه‌كى

سرشقام و توز كرى به اراضى تسلسل ٧٩ كه له زير

ادعاى كاك احمد شيخ دايه و توزكرى با جبيكا جارى

بونى سرچاوه‌ى كانى‌سارد و روز اواى به شيو كانى‌سارد

و جنوبى به اراضى‌يك كه له زير ادعاى ورثه‌ى كاك

احمد شيخ دايه و تسلسل ٧٩ و تواوكرى به‌ريكاى كانى

دوه‌ان و تسلسل ٣٢ به مجددا به ناوى خزينه‌ى حكو

مت عراقيه‌وه ربط طاپو اكريت هر كس ادعايكى هبه

له تاريخ ام اعلانه‌وه هتا مى ـ ٣٠ روژ يكى به اوراق و

مستمسكات قانونيه‌وه مراجعت به دائره‌ى طاپو بكا

يكم جار اعلان كرا .

---

اعلان

خانويك لكل عرصه خانويك كه له محله‌ى دركزين

واقعه ومرقمه به رقمى ابواب ٣٨ و ٤٠ ـ ١١٠ وله

بين حاجى صالح كورى احمد قاسم مشتركه لبر اوه كه

لم محكمه‌يدا زاله‌ى شيوعى له‌طرف مدعى حاجى صالح

اقامه كراوه وله‌بر اوه‌يش كه قابل تقسيم نه‌بوه .

على الاصول اوا خرايه موقعى مزايده‌وه بو مدة ٣٠

روز كه عبارته له مانكيك . به صورتى اوانه‌ى كه طالب

ب به شيراى ملكى مذكورن له ظرفى مدة قانونيدا

به صدى ده آميناته‌وه مراجعت به محكمة صلح سليمانى

ومفادى توفيق انا بكان . دو جار اعلان كرا .

معاون حاكم منفردى سليمانى

---

اعلان

له اعتبار ١ ـ شباط ـ ٩٢٩ هه‌مو وسائط نقليه

لجياتى طرف چپ كه ايستا جاريه لازمه جهت راست

ريكا بكرن .

اكر دو اوتوموبيل له استقامتيكا پيش و يا پاش

رون واكر اوتوموبيل پشته‌وه ايه‌وى تى‌پرى اوتومو

بيل پيشه‌وه بكات لازمه او اوتوموبيله‌ى پشته‌وه طرفى

چپى اوتوموبيلى پيشه‌وه بكرى انجا تى‌پر بكات و روا .

اكردو اوتوموبيل برامبرى يك هاتن له سر هر دوكيان

لازمه طرفى راستى ريكا بكرن انجا تى‌پر بكن و رون .

مدير پوليس

سال ـ ٣ ژماره ـ ١٥٠

ژیانه

لاپەره ـ ١

# ژیان

بو هەمو شتێك مخابرات بەناوی ادارەخانەوە اکری

§

ادارەخانە لەبنای بلدیەدایە

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی بە آنەیکە

کریار

بەشش مانك پێنج بەسالیك دە روپیە ئەدا

بو دەرەوە اجرت پوستەی علاوە ئەکری

شش مانك کرا بونە قید ناکری

اعلانات

دیریك ٦ آنە ئەسێنرێت

یکی بە آنەیکە

هەموشتێك اوسی هفتەی دوجار دەردەچی غزتەیکی کوردیە

٣ شعبان ١٣٤٧ ١٤ کانون ثانی ١٩٢٩ [ دوشمه ]

تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦

## توتون ایران

* * * *

پێنیك لەمو پێش دور و درێژ لە خصوص توتون و بالخاصە نکرین و جلب نکردنی ترتون ایرانەوە نوسیبومان لەکل اوەیشدا هەموارباب ترتون و زراعەکانمان لەممسئلە بەحالی بون وام ضررەی خویان ارانی یکی رغماً زیاتر تشبث بو ام حالە اکن ، لە جیاتی توتونەکەی خومان اصلاح بکین ، ترقی پی بدەین یکی سعی اکین کە ضربەیەکی کورەتری لی بدەین .

لە براوە مجبوراً وازمان لەو اصرحاماتە هینا کە بو چاك کردنی توتونەکەی خومان اکرا . ایستا رجا اکین کە ایتربدەستی خومان مال خومان و عالم عور نکینەوە و صرف نظر لەم مسئلەیە بکین .

لە حالیکا لە مملکتەکەی خوماناا لە صرفیات زیاتر توتون موجودایی ابی بوچ بچین لەخارجەوە بە قاچاق ترتون ایران بکرین و تنزل بدەین بە مالەکەی خومان

ابی انسان تدقیق روحی هەمومسئلەیك بکات و چی لازم‌ابی بو زندوکردنەوەی و بو ترقی پیدانی تشبث بەوە بکات .

عجبا ئزانین بوچ لەدالەوە ترتون قیمتی اکرد ، بوچ ایستا بە کرەتی سقوطی کردوە ؟

لە حالیکا کە ئزانین ئی توتون زوریە و لە براوەیە ئم لە ایرانیشەوە توتون اهینری و ئم سەبەوە لەبرامەی ایرە ولە بغداد موجودی لە صرفیاتی زیاتر بوە وا بە کرەتی سقوطی کردوە .

یکی لەکل اوەیشدا کە دائرەی کمرك بەهەمو قوتیەوە ام مسئلە بە تعقیب اکات و حتا کو ایستا بالفعل چند مقدار یك توتونی ایرانی بدەست تجارەکانەوە کرت ، یکی انتباه ناکرین و زیاتر تشبثی پی اکین .

هەمو ازانین کە مقابل بەم هەمو صرفیاتە و بەم هەمو اموال تجاریەی کەلە خارجەوە دیت هەر ام توزە وارداتەمان هیە ، امیش بدەست خومان عور بەبینەوە زور هیە .

عجبا ابی بوچ نەزانین أسباب چیە سال بەسال توتەکەمان تنزل اکات وثروت مملکتەکەمان بوچ سقوط اکات . و محققیش ارانی لەم کرینی توتون ایرانەدا اکر تصادفاً جاریك منفعتیکی جزئیشی ئیابی بو شخصیك

| بدل قرارداده | ناوی شهر |
|---|---|
| ١٠١٠ | کریزه |
| ٢٢٥ | بالاتران |
| ٧٥٠٠ | مالوان |

**لەدائرۂ طاپووه :**

اعلان

**عرصەی سلا‌لق نقیب تسلسل ٦١٨**

حدود : شمال شرقی بە خانوی تسلسل ٥٦٥ کە عائدی سید نوری افندی نقیبە و تواوکری بطریق عام شرق جنوبی بە مزکوت نقیب تسلسل ٥٦٦ جنوب غربی طریق خاص غرب شمالی طریق عام ٠

| مساحه : | ماتمتر | دەیمتره | متره |
|---|---|---|---|
| | ٥٠ | ٩٧ | ١٨٤ |

**عرصه باغچەی نقیب تسلسل ٦١٩**

جنوب غربی و غرب شمالی بطریق عام شمال شرق بطریق خاص و مزکوت نقیب شرق جنوبی بە باغچەی بلدیە ٨٨ — ٤ تسلسل ٩٣ و تواوکری بە مزکوت مذکور ٠

| مساحه | ماتمتره | دەیمتره | متره |
|---|---|---|---|
| | ٥٠ | ٢٤ | ٧٤ |

او دو عرصەیە کە حدودیان لە سرەوە بیان کراوه و لە کرکی ملکندی واقعن بە ناوی ورثەی نقیب سید احمد افندی‌یەوە مجددا قید طاپو اکریت و امیش باعتبار پینج سهم بو سید نوری افندی دوسهم و بو هریکلە امینە و حلاوه و حبیبە اولادان موی الیە سید احمد افندی سهمی لە تاریخ ام اعلانەوه هتا ٣٠ روژی تر هر کس حق و ادعایکی هیەبە اوراق و مستمسکات ﻫ نونیەوه مراجعت بە دائرۂ طاپو بکات ونەیانی تواو وتی ام مدتە بە ناویانەوه تسجیل اکریت و ئامەدزی هەو کبی سهیم جار اعلان کرا ٠

—)§(—

**اعلان**

**او خانوە کە لە کرەکی** درکزین واقعە و نومروی ١٠ — ٧٧ و تسلسل ٣٦٩ یە و عائدی حبیبە کچی احمد ورشید وفاطمە وحلاوه اولاد عزیزه ومرهونە بارکا لت دووه لای دائرۂ ایتام بە مبلغ دوسد وپینجوپك روپیە ودو آنە مقابل بە بدل رهنی وقرار اخراجی مزایدەوه لە تاریخ ام اعلانەوه هتا بیست و پینج روزیتر هر کسس طالبی کرینیتی مراجعت بە دائرۂ طاپو و منادی توفیق بکات اول جار اعلان کرا ٠

بوزانین هەمو

هیچ کس ایەوی بە زوییکی زو فیری خویندنەوه و نوسین بی لەمەولا زانستی طلبە تیی و قبول اکات ام فرصتە لە دست بدەن پشیانی لە دوایە .

کریم سعید

---

**لە مطبعە دیوان عوری یکی بە هشت آنە افروشری**

{ **** }

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانیه

## قانون تعدیل قانون عقوبات بغدادی بو سال ٩٢٤

ایمه که ملك عراقین

لسر طالب وزیر عدلیه و موافقت مجلس وزرا لسر

امه امرمان دا :

ماده

١ ـ ام قانونه پی ده‌لیٔن قانون تعدیل قانون عقوبات بغدادی بو سال ١٩٢٤

٢ ـ بم نوعه که له ژیره‌وه نوسراوه باب دوازده‌هم عقوبات بغدادی گورراوه .

### باب دوازده‌هم

### جرائم که تعلق به امنیت حکومته‌وه به‌یت

(١) همو عراقی‌یٔك که له ریزهٔ دشمندا مقابل به حکومت سلاح استعمال بکا به اعدام جزا ادریت .

(٢) هر کس هول بدا که حکومتیکی اجنبی مقابل به حکومت عراق بینیته سر معاملهٔ دشمنانه و یاخود اعلان حرب و یا هول بدا له بعضی ایشی وا بو او حکومته پیدا بی که قادری بکا بو اجرای ام معاملاته وامه‌ش به دوزینه‌وه‌ی دسایس و یا به عقد مناسبات لکل او حکومت اجنبی‌یه و یاخود لکل یکی له مامورانیا بکا به اعدام جزا ادریت ام دسایس و مناسباته له طرف دشمنه‌وه تعقیب بکریت یا نکریت .

(٣) هر کس لکل دشمن عراقدا مخابره و یا استشاره و یا حیله و دسیسه به قصد تسهیل دخولیانیٔ به اراضی عراق بکا و هر کس به دانی عسکر یا پاره یا ذخیره یا اسلحه یا مهمات و یا به کم کردنه‌وه اخلاص و یا انضباط عسکر حکومت عراق و یا عساکر متفق او که حکومت بریطانیایه له عراقدا معاونت دشمنیٔ بکا و هر کس به قصدی خط شمندوفر و یا پردیٔك بدا و یاخود به قصدی اوه له حرکات قوای عسکری تاخیر بکا و خنیان بکه‌وی به اعدام و یا به اشغال شاقه مؤبد و یا موقت جزا ادریت .

(٤) هر کس لکل رعیت حکومتیکی دشمندا مخابره بکا نك به قصد ارتکاب یکی لو جرمانه که له مادهٔ پیشودا بیان کراوه لکن او کسه بم مخابره‌یه بوبیت بواسطه که اخبارات مضره به احوال سیاسیه و عسکریهٔ دولت بکاته دشمن به اشغال شاقه که مدهٔ له پنج سال تجاوز نکا و یا به حبس جزا ادریت

(٥) هر کس به دسیسه لکل حکومتیکی اجنبی‌دا و یا لکل یکی له رعیت او حکومته‌دا هول بدا که قسمی له عراق له ادارهٔ حکومت عراق دا بزری و یاخود عراق و یا قسمی له عراق له ژیر نفوذ حکومتیکی اجنبی‌دا دا نری و هر کس بو ارتکاب یکی لم جرمانه به یکی لو وسائل نشره که له مادهٔ هفتا و هشتمیندا بیان کراوه تشویقات بکا به اشغال شاقه که مدهٔ له حوت سال تجاوز نکا و یا به حبس جزا ادریت

(٦) هر کس به یکی لو وسائل نشره که له مادهٔ هفتا و هشتمیندا بیان کراوه خبری درو بلاو بکاته‌وه و بزانی که درویه و یا به قصد تیکدانی راحت عام و یا ضعیف کردنی حکومت و یا تقویهٔ نفوذ دشمن خبر بلاو بکاته‌وه به حبس که مدهٔ له سه ٣ تجاوز نکا و به جزای نقدی و یاخود به یکی لو دو جزایه جزا ادریت

(٧) هر کسی له امور عسکریهٔ حکومت عراق سا به
هر چی لونی بوبی معلوماتی بهیت به اختیاری
بالذات ویا بالواسطه لای مأمور دولتیکی اجنبی که
اگل حکومت عراقـدا متفـق نه بیت ویا لای
شخصیکی ترکه زانی بوحافظهٔ منافع عراق ایجاب
اکا لووقتهدا الی کتم بکریت آشکرای بکا باشغال
شاقه کهمدهٔ لهحوت سال تجاوز نکا ویا به حبس
جزا ادریت واگر آشکرا کردن لای مأمور
دولت اجنبی لهکسیکوه واقع بوبی کهبصورتیکی
رسمیه بو او معلوماته امنیتی پی کرابی و یاخود له
اثنای وظیفهٔ رسمیهدا اگهدار بوبی او وقتـه
جائزه که جزاکه بکری باشغال شاقهٔ موٴبده

(٨) هرکسی بزانی ویتابدا به جاسـوسـیك ویا به
عسکریك کهلهطرف دشمنهوه بوورگرتنی خبرات
نیردرابی ویا بزانی و پنـای بو بدوزیتـهوه به
اشغال شاقهٔ موٴبد ویا موقت ویا به حبس جزا
ادریت

(٩) هرکسی تعرض بکانه حیاتی ملك به اعدام جزا
ادریت ـ هرکسی تعرض بکانه ملك وتعرضیکی
کهحیاتی تهدید نکا باشغال شاقه کهمدهٔ لهحوت
سال تجاوز نکا ویا به حبس جزا ادریت

(١٠) اگر جرائم مذکوره که له مادهٔ سـابقهدا بیان
کراوه مقابل به مندوب سامی بریطانیا ارتکاب
کرا عین جزای پیشوی لهسر تطبیق اکری

(١١) هرکسی هول بدا که بهقوتیکی اشکرا ملك یا
وزرا یا اعضـای مجلس مبعوثان و یا یکی لوان
بترسـینی بهقصدی میل ویا اجباری به کردن یا
نهکردنی ایشیك که داخل صلاحیت قانونیه ی
باشغال شاقه کهمدهٔ لهحوت سال تجاوز نکا ویا
بهحبس جزا ادریت

(١٢) هرکسی به یکی لو وسائل نشره که له مادهٔ هفتا
و هشتمیندا بیان کراوه روی تحقیریك بكانه ملك و
یا به آشکرا تحقیری بکا به حبس که مدهٔ له سه سال
تجاوز نکا و به جزای نقدی و یا به یکی لم دو
جزایه جزا ادریت ٠

(١٣) هرکسی به یکی لو وسائل نشره که لهمادهٔ هفتا و
هشتمیندا بیان کراوه حکومت و یا جیش مولك
و یا تحقیر بکا به حبس که مدهٔ له سه سال تجاوز
نکا و به جزای نقدی و یاخود به یکی لم دو جزایه
محکوم ابیت و اگر ام جرائمه مقابل به مندوب
السامی بریطانیا و یا مقابل بهو قوای مسلحهیه که
حکومت بریطانیا لهعراقدا ادارهٔ اکا ارتکاب کرا
عینی اوجزایهٔ پیشوه تطبیق اکریت ٠

(١٤) هرکس به قصد تخریب و یا تغییرنظام دستوری
و نظام حکومت که مقرره و یا به قصد کوشتن
بو مقاصد سیاسیه بومبا و یا سـائر مواد انفجاریه
استعمال بکا به اعدام جزا ادریت هر کسیٔ بومبا
دینامیت و یا سائر مواد انفجاریه درست بکا یا
انباری بکا و یا بیهینی به قصدیکی بو مقاصده که
له پیشمه وه وتراوه به اشغال شـاقهٔ موقت و یا به
حبس جزا ادریت ٠

(١٥) هر کسی بو عصیان کردن معاونتی یکی له افراد
جیش عراقی و یا یکی لوقوای مسلحهیه کهحکومت
بریطانیا لهعراقدا ادارهٔ اکا بکا به اشغال شاقه که
مدهٔ لهده سال تجاوز نکا و یا به حبس جزا ادریت
و اگر له نتیجهٔ او عصیانهدا یکی مرد جزاکه عین
جزای شخصیك ابیت که ثابت بوبی او شخصه
معاونت مجرمیکی کردوه که جزای او مجرمه
اعدام بیت ٠

(١٦) هر کسی اکل یکی لو افراد قوای عسکریهیه که

له پێشەوە ذکر کرا بو عصیان مشاورە وا بو عصیان نشە وتی بکا اگر ام مشاورە و تشریقاتە نتیجەیکی عملی لی حاصل نبی بە اشغال شاقە کە مدة لە پنج سال تجاوز نکا جزا ادریت .

(١٧) هر کسی یکی لە افراد قوای عسکری عراق و یاخود یکی لە افراد او قوای مسلحەیە کە حکومت بریطانیا لە عراقدا ادارة اکا بو فرار کردن معاونت بکات بە حبس کە مدة لە دو سال تجاوز نکا و بە جزای نقدی و یاخود بە یکی لم دو جزایە جزا ادریت .

و اگر ام تشویقاتە بو فرار نتیجەیکی نبخشی بە حبس کە مدة لە شش مانگ تجاوز نکا و یاخود بە جزای نقدی جزا ادریت .

(١٨) هر کسی بزانی و بنا بداتە یکی لە فرار قوای عسکریە و یاخود بزانی و بنای بو بدوزیتەوە بە او جزایە کە لە فقرة اول لە مادة پێشوودا تصریح کراوە جزا ادریت .

و ام مادەیە بو زن و دایک و کچ و خوشکی او فرارییە تطبیق ناکریت .

(١٩) هر کسی البسة رسمی کە مخصوص بی بە قوای عسکریە حکومت عراق و یا او قوای مسلحەیە کە حکومت بریطانیا لە عراقدا ادارة اکا لبری بکا و خوی تملاً لوان نبیت و یا یکی لە نشان و یا علاماتی اوان تقلید بکا و امەی کە خلق بزانن یکیکە لوان و یاخود او لباسانە لو وقتانەدا لبری بکا کە موجب حقارتی او لباسە بیت بە حبس کە مدة لە شش مانگ تجاوز نکا و یاخود بە جزای نقدی جزا ادریت

و اگرچە او البسە و نشان و علاماتانە عین اصلە کەی نەبیت مادام کە احتمالی اوە بیت کە خلق لی بێک بچی و بە اوان بزانیت ام جزایە تطبیق اکریت

(٢٠) هر کسی لوازماتێک کە بو قوای عسکری تعهدی جای کردبیت بە قصدی قطع بکات بە حبس کە مدة لە سە ٣ سال تجاوز نکا و بە جزای نقدی و یاخود تنها بە یکی لم دو جزایە جزا ادریت

و اگر ام جرمە لە اثنای حرکات حربیەدا ارتکاب کرا جازە او جزایە بکری بە اشغال شاقە و یاخود بە حبس کە مدة لە حوت سال تجاوز نکا

ام قانونە لە روژیکەوە کە لە جریدة رسمیەدا نشر اکری نافذە

تنفیذ ام قانونە لسر وزیر عدلیە و داخلیەیە

لە روژی ١٩ مانگ نیسان ١٩٢٤ و ١٥ مانگ رمضان ١٣٤٢ دا لە بغداد نوسراوە

**فیصل**

| وزیر عدلیە | وزیر داخلیە | رئیس الوزراء |
|---|---|---|
| احمد | علی جودت | جعفر العسکری |

بو همو شتیك

مخابرات به ناوی اداره‌خانه‌وه

اکری

§

اداره‌خانه له‌مطبعی بلدیه‌دایه

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی به‌ آنه‌یکه

حسکریاز

بەشش مانك پنج

بەسالیك ده روپیه دەدا

بو دره‌وه اجرت

پوسته‌ی علاوه ئەکری

شش‌مانك کمترابونه قبول ناکری

اعلانات

دیریك ٦ انه ده‌سبژیت

یکی به‌ آنه‌یکه

همو شتیك اوسی هفته‌ی دو جار ده‌رده‌چی غزته‌یکی کوردیه

١٧ شوال ١٣٤٧ ٢٨ مارت ١٩٢٩ [پنجشنبه] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦

## اهمیتی لسانه

* * * *

ملتیك یه‌وی عنعنات ملیه‌ی خوی محافظه بکات و بو اوه‌ي همو کس به ملتیکی سر بخوی بزانن ابی زبانه‌کي خوی که له قدیمه‌وه نسلاً بعد النسل بوی بجی ماوه ونی نه‌کات و هتاکو بیت ترقی پی بدات ومحافظهٔ بکات .

زبان بو ملتیك له همو عنعناتیك زیاتر اهمیتی زور تره . او ملتانه‌ی که ملیه‌تی خویان ون نه کردوه و دائما موجودیه‌تیکی مادی ملیه‌یان هیه له‌همو شتیك زیاتر نشانه‌ی ملیتیان زبانه‌که‌یانه . و به سبب زبانه‌کانیانه‌وه جیا بونه‌وه و به ملتیکي سربخو اناسرین .

امرو بشری روی زمین هر چند به سبب تأثیرات محیطه‌وه به چند صنفیك جیا بوته‌وه و به سبب رنك ، شیوه ، قیافته‌وه فرقیان هیه و به چند صنفیك جیا بونه‌وه . بلام ام تأثیراته‌یش به‌قدر لسان نه‌بوه به سبب جیابونه‌وه‌ی ملیتیان .

ملتیك ولو هزار سالیش کوتبیته زیر ادارهٔ ملتیکی که‌وه بلام به شرطیك زبانه‌که‌ی خوی ترك نکردبی و جبراً لی‌ٔ منع نکرابی دیسانه‌وه او ملته موجودیه‌ته‌که‌ی خوي هر راا کری و هیچ وقتیك نانوسی به ملتیکی که‌وه و آخری هر جیا ابیته‌وه .

ملت کورد و عرب هر چنده چند عصریکیش له زیر ادارهٔ تورکا بون بلام چونکه له ناو خویانا هر به لسانی مادر زادی خویان قصه‌یان اکرد . ام همو انقلابانه تأثیری نی نکردن و به سبب لسانه‌کانیانه‌وه آخریه‌که‌ی جیا بونه‌وه .

کواته لازمه ملتیك له همو عنعناتیکی زیاتر لسانه‌که‌ی محافظه و تقدیس بکات .

له‌مه‌دا مقصدمان ملت کورده ، ام ملته هرچند له همو کس زیاتر عنعنات ملیه‌ی خوی محافظه کرد ، له‌بر تضییقات اجانب وله‌بر اوه‌ی که له‌محیطه‌که‌دا لسان رسمی و تدریسات مکاتب به کوردی نه‌بو نه‌ی توانی و میدانی نه‌درا که ترقیك به لسانه‌کی بدات و تکا لی پی بکات ، بلام اوه‌ای حکومت فخیمه‌ی

بریطانیا محافظەی حقوقی ام میلتە ئەکات بە سبب لطف و شفقتی حکومت انجیەوه و بە واسطەی مقررات مصیبەوعادلانەعصبة الامەوه ئیمە کان مربست کراو امرو له محیطەکەمان تدریسات و مخابرات رسمی بە زبان مادرزادی خومانە ، له براوه بە واسطەی همت معارفەوه و بە سبب جهد و کوشش عالم و فاضلە کانمانەوه امرو برە برە لسانەکەمان خریکە ترقی بکات و قواعد و الفبا و بعضی کتیبانی مکاتب کە اساس منظم کرانی لسانەکەمانە تالیف کراون و طبع ... بی بە سبب تالیفات کوردیەوه لسانەکەمان ... اکات و هیچ احتیاجمان بە کتیبانی اجنبی ... مع الاسف امرو او حقوق و سربستی ... لسانەکەمان بە تواوی تطبیق اکری لە بعضی ... کوردستانا بە کوردی مخابره و تدریسات ...

اگر بە تواوی تماشای موجودیتی لوای ... بکری معلوم ابی کە ام لوایە مقداریکی کمی تورکە و اوی تری بە اکثریت کوردە و اوردی کرت کوردە .

غیری ایش امرو کە همو بە ناوی حکومت عراقەوه ازین ، هر چند لسانی رسمی ام حکومتەمان عربیە بلام لە سر قرار عصبة الامم و لە سر اعتراف حکومت لە قسم شمالی ـ کوردستانی ام حکومتەدا لسان رسمی و تدریساتی مکاتب بە کوردیە .

کوا، لەم حکومتەدا لە عربی و کوردی زیاتر بە لسانیکی تر مخابره کردن وتدریسات ابی ممنوع بی .

بکی لە کل ایمشا کە امرو حکومت تورکیا او حروفاتە کونەی گوریوه و بە حروفات لاتینی انوسی و مخابره اکات ، بکی هیشتا لوای کرکوك هیچ اسانیکی حکومتی عراقی قبول نکردوه و بە تورکی و بە شیوه و حروفاتە کونەکەیان مخابره اکات .

لە بر اوه رجا لە علما وفضلای ام لوایە اکین اگر خویان بە تورك ازانن و تو حکومت تورکیا ابی مخابره بە حروفات لاتینی بکەن و او اصولە قبول بکن ویاکو مقررات حکومت عراق بە عربی و یا لە برادی کە محیطیکی کوردستانە وله سدی ... هشتای کوردە لازمە لسان رسمی وتدریساتیان بکن بە کوردی • محقق امه زیاتر ابی بە واسطەی ترقی وتعالیان •

## هوالی دەرەوه :

* * * *

### بین یونان و جکوسلوقیا

جنیف ـ او اختلافانەی کەلە بین یونان و یوکو سلافیادا هەبو نەماوه و لابراوه .

### الغای دیوان عرفی لە تورکیا

انقره ـ قوانین احکام عرفیە کەلەشورەی کوردستانا تورکیا تنظیمی کردو و معاملەی پی اکرد لە بر نەمانی غائلە لغوی کردوتەوه .

### صحة ملك جورج

لندن ـ جلالة ملك جورج بە صورتیکی باش و کە هیچ غائلەی لی نکری برو چاکی اروا وامە چوار روژە بە پێ خوی ا کەری و دیتە ناو باغەوه .

### وفاة قوماندانیکی بریطانیا

لندن ـ جنرال هاری مکایمون کە قوماندانیکی مشهور بریطانیا بو و کە عمری ۷۷ سال بو و کە زور خدمتی بو حکومت سبتی کردوه امری خوای بە جی هیناوه .

### میثاق کیلوک

لندن — وکو له طهرانه‌وه خبر ورگیراوه حکومت ایران میثاق « کیلوك »ی تصدیق کردوه .

### فیضان آو له حکومت امریقادا

واشنطون — به واسطهٔ کثرت بارانه‌وه و زیاد بونی نهره‌کانه‌وه وکو له اکثر حکومتا روی داوه له حکومت جماهیر متحدهٔ امریقایش لافاو ویضانیکی مدهش روی داوه و زور خساراتی داوه .

### بین تورکیا و بلغار

انقره — او معاهده تحکیمه‌ی که له بین بلغار و تورکیادا کرابو اجازه له‌طرف هردولاوه امضا کراوه .

### افغان

پشاور — له‌بر اوه‌ی چند عشائریکی تریش التحاق یان کردوه به امان‌الله خانه‌وه زور وضعیت و قوتی محکم بوه .

### بین یونان و بلغاریا

لوندره — او اختلافه‌ی که له بین یونان و بلغاریادا موجوده بو خریکه رفع بکری .

### کردنه‌وه‌ی مکتبه‌کان

به سبب جژن وتعطیل بهاره‌وه عموم مکاتب عراق که له اول جژنه‌وه تعطیل کرابو . له دوای مده‌ی تعطیله‌کیان روژی ٢٥ ام مانکه مکتب کشاد کرایه‌وه وم طلبه‌کان چونه‌وه سر رحلهٔ تدریس .

امیدمان کی طلبه‌خوشه‌ویسته کانمان که امیدی مستقبل وطنه که دانی له‌پاش ام استراحته و چونکه بو امتحان عمومی کمی ماوه به ذوق و ارزویه‌کی خوشه‌وه به جدی له‌خویندنه کیانا سعی بکه‌ن باکو انشاالله به‌عمومی ناجح به‌بن و له عراقا موقعه‌یکی ممتاز وه‌رکرن .

### بو ژیان خوشه‌ویست

له غزته‌ی العراق‌دا به ناوی صلاح الدین کوردی سلیمانی‌یه‌وه مقاله‌یکی دی رجا اکم وقت نازکه هرکسیك ملیت و شخصیتی معلوم و صلاحیت مداخله‌ی شئون ملی مؤید نه‌بی اعتباری پی مکن .

مرخصی کورد

توفیق

### هاتن و رویشتن

* * * *

سعادت متصرف خوشه‌ویستمان که دائما ارزوی استراحت و سعادت ملته‌که‌یه بو حل منازعه‌یکی اراضی بین دو اشراف سلیمانی روژی یکشمه بالذات تشریفی برده ناحیه‌ی تنجرو و ایواری عودتی فرموه .

سعادت متصرف اوژی بو تماشا کردنی ایشوکاری قضائی له‌رفاقت محاسب لوادا تشریفی برده هلبجه و له دوای روژیك عودتی فرموه .

سعادت مفتش اداری غیورمان بو بعضی ایشوکار روژی ١٩ ی مانك تشریفی بردوته بغدا .

روژی دوشه‌مه تشریفی هینایه‌وه سلیمانی .

محترم قائممقام هلبجه حمید بك که بو ایشوکاری رسمی حکومتی تشریفی هینابوه سلیمانی دوینی له‌خدمت سعادت متصرفی دا تشریفی برده ناحیه‌ی تانجرو و عودتی کردوه بو هلبجه .

اعلان

آلایکی ٦ مانکی داغی حکومتی پولیس لوای سلیمانی یعنی له اولی مانکی نیسان ١٩٢٩ وه تا نهایتی مانکی حزیران ١٩٢٩ خراوەته مناقصەوه طغی جو به ١٣٥ وطغی کا به ٥٥ روپیه خراوەته زیر پەیدەوه وله ١٨ مانکی جاریەوه تا نهایتی بومناقصه وله ١ نیسان ٩٢٩ وه تا ١٠ مانکی مذکور بو احالەی له طرف مجلس ادارەوه مدت تعیین کراوه کی طالبی تنقیصه لەو مدتەدا مراجعت به مجلس ادارهٔ لوا بکات ‎٠

متصرف سلیمانی

—)§(—

اعلان

له دی بیستان سور آنی ... رش وله دی کانی بالا مزرعەی کانی سفر ... یا مزرعەی مالکندی وکانی مسلم ... له ... لەکل اشیکدا ، نیوەی دی زاله ، ثلث دی ... رش وکانی بجنه له مرکز لوادا ٦٠ دوکان له دی بزی نیان و نودیدا ٢٥ رمز له دی کورکەدر ٤ براو بو التزام دانیان له طرف مجلس ادارەوه تا ٢٠ مانکی مارت ٩٢٩ بومزایده له ٢١ تا نهایتی مانکی مذکور بو احاله. یان مدت تمدید کراوەتەوه هر کسیك طالبه لەمیانه دیا مراجعت به مجلس اداره ودائرهٔ اوقاف بکات ‎٠

مامور اوقاف

—ﷺ—

له ریاست بلدیەوه :

اعلان

رسم حیوانات نقل ، ذبحیه ، قپان ، کیالیه ، ارضیه میدان اسپ ، دلالیه ، مذبحه بو سال ١٩٢٩ له طرف بلدیەوه ادرین به اجاره ، مدت مزایده له ١٠ شباط هتا ١٠ مارت ٩٢٩ و مدت احاله له ١١ مارت هتا ٣١ مارت ٩٢٩ تعین و تخصیص کراوه هر کس طالب اجارهٔ ام رسمانەیه مراجعت به مجلس بلدیه بکات ... بو آکاداری اعلان کرا ‎٠

لەدائرهٔ طاپووه :

اعلان

ارخانوه که له کرەکی درکزین ... و نومرەی ١٠ ـــ ٧٧ وسلسل ٢٦٩ یه وعائدی حبیبه کچی احمد ورشید وفاطمه وحلاوه اولاد عزیزه وعرهونه باوکا. لت دوره لای دائرهٔ ایتام به مبلغ دوصد وبیستویك روپیه ودو انه مقابل به بدل رهنی وقاراج خرا له مزایدەوه له تاریخ ام اعلانەوه هتا چلوپینج روژیتر هر کسس طالبی کرینێتی مراجعت به دائرهٔ طاپو و منادی توفیق بکات دوم جار اعلان کرا ‎٠

اعلان

نقلیات و حیوانیك که بو جیش عراق پی ویست بی له مناقصەدایه اوانهٔ که طالبی مناقصەن بو خاطری له شرائطەکانی به مفصلی بکەن مراجعت به آمر منطقەی شرقیه و به موقع قوماندانی کرکوك بکن و مناقصه هتاساعت ١٢ی روژی ٢٣ مارت ٩٢٩ قبول اکری .

آمری منطقهٔ شرقیه

{ **** }

بوزانین همو

هیچ کس ایەوی به زوبکی زو فیری خویندنەوه ، نوسین بی لەمەولا زانستی طلبه قید و قبول اکا، ام فرصته له دست بدەن پشیانی له دوایه .

کریم سعید

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانی

بو هەمو شتیك

مخابرات بەناوی ادارەخانەوە

اکری .

§

ادارەخانە لەبنای بلدیەدایە

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی بەانەیکە


کریار

بەشش مانك پێنج

بەساڵیك دە روپیە دەدا

بو دزەوە اجرت

پوستەی علاوە ئەکری

شش مانك کرابونە قیدئەکری

اعلانات

دیریك ٦ انە دەسپیریت

یکی بە آنەیکە

هەمو شتیك اوسی هفتەی دو جار دەردەچی غزتەیکی کوردیە

٢١ شوال ١٣٤٧ ١ نیسان ١٩٢٩ [ دوشمە ] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦


## حقیقتیك

{ **** }

لەغزتەی پێشوی ژمارە ١٦٢ مانا چند دیریك کە بەامضای مرخص کورد محترم حاجی توفیق افندی ئارەوە بو درجی توذیەمان کرابو نشـر کرا ، لەبراوەی فروەکەی موی الیە امرو بو ملت کورد زور معقول و مصیبە و عادتا بە هاواریکی حقیقت تاق کرا و پسـیمان امراری شاروراوەی او چند دیرە مختصرە تشریح بکین .

هەر ایزین ملت کورد چند زمانیك سەربەخواز یا وتنیك کە تورکەکان بە ناوی خلافت و اصـلامیتەوە استیلایان کردین ، لە هەمو حقوقیك محروم مابوینەوە و اثر صنعات ملیەیان بی‌رون کردین ، زبان مادرزادەکەمان کەلەهەموشتیك زیاتر نشانەیە بو ملیت اوپشیان لی منع کردین ، مخابرات رسمی ، ملی وحتی تدریسـات استمائیشیان هەربە تورکی بو ، لەبرادە لەهەمو ترقیات و مدنیت محروم‌مابوینەوە ، غیری ایمیش وقتیك کە شری کورە دەستی پی کرد بە سبب او ظلمانەوە کەلیمان اکرا اکثری ملتەکەمان محو بوەوە و باقیکی تریشـی خریکی مردن بو ، لەحالتی غرغرەدا درکای رحمیان لی کرایەوە و اراضیکەمان لە طرف حکومت فخیمەی انکلیزەوە استیلا کرا ، ام حکومتە چونکە مدنی بو و لەملت پی‌کەاندنا زور تجربە دیەدبو بو ارەی ایمیـش بکات بە ملتیکی عصری وەکو کل حرتی دائی چند جاریش سعی فرمو کە بە تواوی ادارەیکی سـەربەخومان بو تشکیل بکات . بلام لە بر ئەوەی هیشتا قابلیتمان پیدا نکردبو ، ملتیکی ابتدائی بوین ادارەمان پی‌نکرا لەبسانە وە او حامی و مربیە مشفقەمان تەرضیکی نکردە ماینما. ئەمرچەند لە کل عراق و عراقیەکانا توحیدی ادارەی کردین بلام لەبسانەوە بە قراری عصبة الامم بعضی امتیازی مهمی بو صندین کە نتیجە پی ترقی بکین و لەاستقبالا بتوانین بە تنها بو خومان بژین وکو مخابرات رسمی حکومتی و تدریسات بە کوردی بی و مامورین هموی لەملتی خومان بی

و بم سببەوە و بە واسطۀ لطف و شفقتی ام حامیە مانەوە بە نسبت ادارۀ پیشومانەوە ایستا صد قات مترقی

ژین و اگر هەروا بروین و لە خومانی تیك نەدەین زیاتر ترق اکین و همو قابلیتیکمان ابی .

ایمە کە ئمانازانی بە زبانی خومان بخوینینەوە و بنوسین ایستا کە همو تدریسات ، مخابرات رسمی‌مان و کتیبانی مکتبمان بە کوردی‌یە عجبا ام نعمتە و ام لطفەابی بەکم بزانین . آیا کـــس ابی تقدیری نەکات و مدیونی شکرانی ام همو نعمتە نەبی .

بینەوە سر اصل مسئلە . معلومە کە مقدرات ملتیك فرد تأمینی ناکات ملت بە نظر افکاری عامهٔ ملتەکەوە بەریوە اچیت . حسیات فردیك وحتی چند شخصیکیش ترجمهٔ حال و حسیات عمومی نیە .

وکو وتمان لە دوای ام همو فلاکتە کە ام استراحتەمان چنك کوت وکە هیئت عمومیە تقدیری اکات . کواتە بە مجبوری و بە آرزویکی طبیعی‌یەوە دائما محافظهٔ حقوقمان تودیعی او حامیە اکین . باور ناکم کسی بی‌لە دوای ام همو چاکەیەی لە کلمانا کراوە و کە زندو کرانەوە وبو استحصال حقوقمان هول‌درا و تأمینی بعضی مقاصدمان کرا لە کل اویشدا تکرار بو القای فلاکتیکی ترمان هول بدات . و بە خواهشـــیك و آرزویکی طبیعیەوە همو الین چون لەپیشا بوهمو شتیك مقدرات خومان تسلیم او حامیە مشفقەمان کردوە ایستایش هر بەو نوعە تسلیمی اکین و قابل نیە لەو فکرو قرارە بجیابینەوە . وامەوکو خاصەیکی ذاتی لی‌هاتوەبومان . دلیلیش اوەیە او وقتە کە حکومت فخیمە بە مناسبی زانی لە کل عراق بژین و چونکە بەشتیکی باشی زانی بومان زور بە مسروریتەوە قبولمان کرد و هتاکو ایســتا بو تیك‌دانی او ادارەیە و لە علیهی لە طرف کوردەکانەوە حرکتیك نکراوە . و بە عمومی مطیعی ام ادارەیە بون کواتەلازمە ضرتەکانی بغداد و العراق و اوانەی بە ناوی مستعارەوە لە خویانەوە بعضی حوادث اوسن و الین کویا کوردەکان خریکی مضبطەن کە لە عراق جیا بینەوە وکسیکی‌تر الی‌واجبەلسر وکیل، وپیاوەکورەکانمان بواوی وحدەتیکی قطعی ام دو ملتە تامین بکن لازمە هول بدەن و اتفاق بکن . غیر معقولە . ایمە اگر حقوقمان محفوظ بیت دائما اتفاق اکین . و اگر تجاوزی حقوقمان کرا اوسا هاوار اینە بر حامیە مشفقەکەمان .

لە بر اوە رجا اکـین اوانەکە آکایان لە افکاری عامەی ملت نەبی لە خویانەوە دخلیان نەبی بە سـر مقررات دو ملتەوە چونکە وکو لە پیشـەوە کوتمان محصولی غایهٔ حسیات ملتە بو محافظەی حقوقی وکو هتاکو ایستا تسلیمی کردوە ایستایش ولودوایش هر تسـلیمی حکومت فخیمهٔ بکات وغیری اویش تقدیر ومداخلهٔ مسائلیك کە تعلق بە حیات دو ملتەوە بی ابی او ذاتانە بیکن کە صاحب وجدانیکی پاکن .

## هوالی دەرەوە :

* * * *

### مقداری جزایك کە لە مصر سنراوە

لندن — سیر اوستن چیمبرلاین لە مجلس عوامدا کوتویەتی او مقدارە جزایەی لەسر کوشتنی سردار لە حکومت مصر سنراوە ( ٤٠٣١٠٣ ) لیرهٔ انکلیزیە وهموی لە مشارع صحیەی سودانذا صرف کرابی .

حدودی سوریە و تورکیا

استانبول — حکومت تورکیایش مقابلة خەریکە اساسیك دامەزرێنێ بۆ مقابلەی ئەو چەرکس و ارمنی و کوردانەی کە فرانسە بە قصدی بۆ اوەی دائما تجاوزی اراضی تورکیا بکەن لە حدودا اسکانیان و معاونەتیان اکات .

---

تووتنی ایران

طهران — حکومت طهران اقتصادا لایحەیەکی داوە بە مجلس مبعوثان کە تصدیق بکری بۆ اوەی ایرانیەکان دائما تووتنی وطنی خۆیان صرف و استهلاك بکەن و تووتنی خارجی صرف نەکری .

---

جمهوریتی لبنان

بیروت — حکومت لبنان بە سبب تەواو بونی میعادیەوە خەریکی انتخابە بۆ تعیین رئیسیکی جمهور بۆ لبنان .

---

گیرەیکی عصابەی تورکستان

بومبای — غلام رسول خان کە یەکیکە لە سەرگەرەی مشیکی عصابەی تورکستان اجارە هجومی کردوتە سەر قلعەیکی افغانستان کە نزیکی کابلە . هەرچی اشیایێك کە عائدی ( بچە سقا ) بوە و تیدا بوە ضبطی کردوە .

—)§(—

مصر و انگلیز

لندن — لە خصوص تضمیناتی او واپورانەی انگلیزەوە کە لە حرب عمومیدا لە حالیکا خلوزی اهینا بۆ حکومت مصر لە طرف المانەوە غرق کرابون اتفاق حاصل بوە مقابل بەو واپورانە حکومت مصر سالی ٣ ملیون لیرە ادات بە انگلیز .

---

وفاتی مارشال فوش

پاریس — مارشال فوش لەو نەخۆشیەی کە تووشی بو بو نجاتی نەبوە و وفاتی کردوە ، چونکە ام ذاتە قوماندانیکی مهم و مشهوری فرانسە بو و لە حرب عمومی دا زور خدمتی سبقتی کردوە ، عموم فرانسە لە حالتیکی تعزیەدایە .

---

اتفاق پوستەی بین ایران و عراق

طهران — بو اوەی سرنشت طیارەی شرکتی ( جنکرز ) بە مسرلسنی پوستە بەریتە بغداد و وی بلدی الین لەم خصوصەوە لە بین ایران و عراقا معاهدەیك کراوە .

---

مجلس وزرای عراق

بغداد — مجلس وزرای عراق خەریکی بودجەی سالی ٩٢٩ یە کە بە صورتیکی عمومی تنقیحاتیکی تیدا بکات کە بۆ ادارەی عراق صالح بیت .

---

قونسلوس تورك

بغداد — قونسلوس تورك سعادت طلعت قبابك لەم رۆژانەدا بە صورتیکی رسمی لە دائرة حکومتیدا زیارتی رئیس الوزرا و وزیر خارجیەی کردوە .

---

وضعیتی مندوب سامی عراق

بغداد — وکو شایعە ادن الین نخامت سیرکلبرت کلایتون لە دوای مذاکرە و تدقیقات وضعیت حاضرة عراق لە چە درجەیکدایە توسیوقی بۆ لندن و هتا جواب نەیەتەوە مذاکرەیکی تر لەگەل عراقیەکانا ناکات .

اعلان

له اطراف خورمال تعمیری ریکای اوتوموبیل حرا وەتە مناقصەوە هر کسی طالبه بو تی کەیشتنی تفصیلات و مناقصه مراجعت به دائرەی متصرف سلیمانی و قضای هلبجه بکات .

متصرف سلیمانی

---

له ریاست بلدیەوە :

اعلان

وکو خبرمان زانیوه نانەوا کان به خلاف امر و اعلان بلدیه حقهٔ نان له فیآتی بلدیه دو انه زیاد یعنی به دە آنه افروشن و کنمه شامی و مواد اجنبیه تیکلاوی نانەکانیان اکن . بناءً علیه اوا دیسانەوه اعلانی اکین که ابي نانەواکان له اعتباری امرووه حقهٔ نانی کنم خالص به هشت آنه بفروشن و کنمه شامی و مواد اجنبیه تیکلاوی نانەکانیان نەکن . هر کس خلاف ام اعلانه حرکت بکا به پی قانون عقوبات بغدادی تجزیه اکری بو اکاداری اعلان کرا .

---

اعلان

رسم ذبحیه به ( ١١٠٥٠ ) و رسم مذبحه به (٢٣٠٠) روبیه له عهدەی طالبیایه هر کسی طالب مزایدەیه مراجعت به مجلس بلدیەی سلیمانی بکات بو آکاداری اعلان کرا .

---

لەدائرهٔ طاپووه :

اعلان

تسلسل ٢ نفس قرەداغ

سرای حکومت، که له نفس دیٔ قرەداغ واقعه و محادده (شمال شرق به عرصه دوکاني ورثهٔ اوسته صالح تسلسل ـــ ٦ و تواوکری به عرصه خانوی شیخ نجیب افندی کوری شیخ لطیف افندی تسلسل ٤ و تواو کری بەطریق عام و بەعرصه خانوی شیخ نجیب‌افندی کوری شیخ لطیف تسلسل ـــ ٤ و بەعرصەتسلسل ٣ که وقف مزکوت قرەداغه شرق جنوبی به عرصەی تسلسل ـــ ٣ مذکور و تواوکري به جوکەی آو فاصله له بینیا و بین عرصەی امین آغای کوری عبدالرحمن آغا تسلسل ـــ ١١ جنوب غربی بعرصهٔ شیخ علی کوری شیخ عبد الرحمن تسلسل ـــ ١٠ غرب، سمالی بعرصەی تسلسل ـــ ١٠ مذکور و تواوکری به عرصەی ملا کوری خضر مؤذین تسلسل ٩ و تواو کری به عرصه خانوی مصطفی کوری عبدالله تسلسل ـــ ٨ و تواو کری بعرصه دوکانی ورثەی امین کوری اوستا صالح تسلسل ـــ ٧ و تسلسلی ٢ وه لبر اوهٔ من التقدیم به دست حکومتەوەیه و هتا ایستا ربط طاپو نکراوه ایستا به ناوی حکومتەوه معاملەی مجددی اکریت هر کسی حق و ادعایکی هیه له تأریخ ام اعلانەوه هتا «٣٠» روژیتر به اوراق و مستمسکات قانونیەوه مراجعت بەدائرهٔ طاپوبکات اکینا لەکل تواو بونی او مدته معاملەی بناوی حکومتەوه اکریت بو آکاداری همو کس اعلان کرا .

—)§(—

اعلان

تقلیات و حیوانیک که بو جیش عراق پی ویست بی له مناقصەدایه اوانهٔ که طالبي مناقصەن بو خاطري له شرائطەکاني به مفصلی بکەن مراجعت به آمر منطقەی شرقیه و به موقع قوماندانی کرکوک بکن و مناقصه هتاساعت ١٢ی روژی ٢٣ مارت ٩٢٩ قبول اکری .

آمری منطقهٔ شرقیه

---

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانیه

بو همو شتیك
مخابرات بەناوی ادارەخانەوە
اکری
§
ادارەخانە لەبنای بلدیەدایە
عنوان : سلیمانی ژیان
یکی بە انەیکە

# ژیان

جریدە

کرێار
بەشش مانك پیشە
بەمالیك دە روپیە دەدا
بو دەرەوە اجرت
پوستەی علاوە ئەکری
شش مانك کمتر ابونە قبول ناکری
اعلانات
دیریك ٦ انە دەستریت
یکی بە انەیکە

همو شتیك اوسی هفتەی دو جار دەردەچی غزتەیکی کوردیە

٢٤ شوال ١٣٤٧   ٤ نیسان ١٩٢٩   [پنجشمە]   تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦

## بو وکیلە محترمەکانمان

* * * *

ای وکیلانی ملت !

ای او ذاتانەی کە مقدرات ملتیکیان تودیع کراوە !

ای اوانە کە ام وظیفە مقدسە ، مهمە ، حیاتیەیان قبول کردوە . !

ای او شخصانەی ملت مقابل بە همو چا کەیکیان تقدیر و خرابەیکیان مسئولیان اکات . !

ای وکیلە محترمە کوردەکانمان ! ام خطابەمان لە کل ایوەیە . و ام هاواەمان هر مقابل بە ایوەیە .

ایە نامان ئەوی بحثی دورەکانی کە بکین . لە دورەکانی کەدا اوی ایشیکی کردبی و حسابیکی دابی بە ملتەکەی خوی هر معالی امین زکی بکی وکیلی محترمان بو .

بلام توخدا : ایوە هیچ بە عمومی زانیوتانە و لیک تان داوەتەوە کە چە وظیفەیکی مقدس و حیاتیتان تودیع کراوە و کردوتانەتە استوی خوتان ؟ عجبا نازانن و نەدەزانن لە چە حالیکایە غیری حقوق لە همو آثاریکی عمران و ترقی لە معارف ، صنایع ، تجارت ، زراعت ، اقتصادیاتدا چند محرومە ؟ و اگر هروا بمینیتەوە چند محکومی مردنە . و نازانن بو اوەی بژی ، ترقی بکات حقوق چناك کەوی هیوا و امیدی هر بە ایوەیا ؟

ایوە ابی بزانن کە انتخاب کردەی ملتیکی یك ملیون نفوسین . و لە دواتانەوە پشتیوانیکی مهم و بە قوتی وکو ام ملتە هیە . و ابی بزانن و لە همو کسیکی معلوم بکن کە امرو لە مجلس مبعوثان عراقدا کوملیکی زور هیە کە تمثیلی شعبیکی مهمی وکو کورد اکات .

مقابل بم وظیفە مهمیەتان و لە حالیکا کە ازانن ملتەکەتان امندە دوا کوتوە و ابی فوق‌الحدسی بو بکریت بکری مع الأسف هتا کو ایستا نە لە مجلسدا و نە لە خارجەوە بە تشریبات و تشبثات کس خدمتیکی لە ایوە نەدی و فعالیتیکتان نەنواند و تأمینی یکی لە مقاصدان ملتتان نکرد .

استرحام اکین ام معروضاتمان بە شتیکی خراپ تاقی نکن و بزانن ملت ایتر بە بریەوە ماوە و لە تاوانا هاوار اکات و لە ایوە زیاتر کسیکی کە شك نابات .

ایتر ابی له نظر ملتهکەدا خوتان روسور بکن . و باداثما ملت بەمقدس ناونان بەبات و اسمتان به شرفەوه و یه زرکفتی آلتون بنوسری . ابی اعجاره به قطعی به اتفاق و یکزبانیەوه بو ام ملته مظلومەنان سعی و همت بفرمون .

بو اوەی له کل ملت عرب و حکومت عراق وکو برا بژین به قدر امکان بو اکمال نواقصاتمان و بو تامینی سباب ترقیمان دول بفرمون .

ایتر دیسانەوه رجا اکین بو اوەی قصەی اهلاو اولا بەبری و کس حق کوتی نەمینی . بو اوەی له نظر ملتەکەدا هر یکیکتان موقعیکی عالیتان بی ابی لەمەودوا همو وقتیك له مجلس‌دا فعالیتی اوه بیەن .

---

## هوالی دەرەوه :

بودجەی مستعمرات بریطانیا

لندن ــ له بودجەی تازەی حکومت بریطانیادا بو وزارت مستعمرات قسم شرق لیرەیك و ۷۵ هزار لیره تخصیص کراوه و له بودجەی پاری ٦٤ هزار لیره له قسم مصارف دفاع عراق و ( ٤٧٢٥٠ ) لیره له مصاروف ارضی عراق و شش هزار لیره له مصارف محافظەی حدود شرق اردن کم کراوەتەوه .

مصر و ابن السعود

قاهره ــ بنا له خبریك که دراوه الین بین مصر و حجاز تیك چوه لەسر اوەی رعایەکان قبول ناکن امسال له کل محملی مصرا قوت بنیرن .

وکیل جلالت ملك بریطانیا

لندن ــ او حوادثه هر وا دوام اکات که ئالین خریکن ولی عهد به دائمی بەکن بەوکیل جلالهٔ ملك بلام له راپور هیئت صحیەوه دراکەوی که ام زمانه جلالهٔ ملك کسب عافیت اکات و اوانی وظیفه بەبینی .

---

افغان

غزتەی تایمس نوسیوتی که حاکم جلال اباد التجای به پشاور کردوه و کوتویەتی همو عشائرەکانی شرق اباد نەوی معاونتی امان الله خان بکن و تیدی او خبری کردوه که الین امان الله خان به قطعی ایەوی له دوای رمضان هجوم بکات و کابل استیلا بکاتەوه .

بلام تایمس اتوسی زور دوره کەامان الله خان بتوانی به تواوی حکمی همو افغانستان بکات .

---

تشییعی جنازەی مارشال فوش

لندن ــ له کنیسەی وستمنستردا نویژی جنازهٔ مرحوم مارشال فوش کراوه و ولی عهد انکلیز له رکابی جلالت ملك جورجەوه و مستر بالدوین رئیس الوزرا و مستر اوستن چمبرلاین به ناوی حکومت انکلیزەوه و زور ذواتی تریش که تمثیل مراجع بحریه و ملکیەیان کردوه لەسر جنازەکەی حاضر بون .

لەو روژەدا بیست هزار کس بو زیارت مرابعتی به مالی مرحوم کردوه و همو بناغی حکومتی مؤسسات تجارتی بو تعزیه سر بەوخوار کراوه .

---

معاهدەی عراق

لندن ــ قسمیك له اعضایانی عصبة الامم له مجلسا سؤالیان کردوه که او معاهدەیەی له بین انکلیز و عراقا له سال ۹۲۷ دا کراوه بوچی هتا کو ایستا تودیعی مجلس عصبه نکراوه ، مستر چمبرلین جوابی داوەتەوه که هتا کو ایستا به تواوی اتفاق لەسر حاصل نکراوه و ...

له مجلس کردوه که ام موضوعه جاری تاجیل بکن هتا
تواو ابی و وظیفه‌کانی توديعی مجلس امت اکری .

---

داخلی :

{ **** }

له‌جلسه‌ی مجلس مبعوثان باردا بو اقتصادیات عراق
وخصوصا بو کوردستان . وبو اوی زراعت وتجارتی
توتون داخلی ترقی بکات وبو اصلاحی مبعوث محترمه
کورده‌کان تقریریکیان دابو به مجلس له دوای مناقشه-
-یقیندا به اکثریت قبول کرد که امه مسئله‌یه‌کی مهمه
بو اقتصاد عراق وبه عجله بو ایجاب اجرای ام مطلبه
مهمه تقریره‌که حواله وزارة مختصه‌ی کرا .

بلام چونکه هیشتا حکومت بوجی‌بجی کردنی ام
ایشه تشبثیک وچاره‌یه‌کی اکردوه دیسانه‌وه وکیل
محترمان معالی امین زکی بك پرسیار وسوالی له وزیر
ری وزراعت کردوته‌وه بو ام خصوصه .

چونکه ام مسئله‌یه زور مهمه وله هو شتیت
زیاتر تامینی ثروتیك اکات بو عراق استرحام له حکو-
مت اکین له‌پیش رقی زراعتیا بو اصلاحی چاره‌یك
بدوزیته‌وه .

---

وکیل خوشه‌ویستمان معالی امین زکی بك که‌فوق
هه‌مو شتیك له مسائل و وظائف عسکری‌دا یدیکی طو-
لانی هیه و داهیه‌کی عظیمی ام فن و علمه‌یه ام جاره‌له
خصوص وضعیت و تشکلات جیش عراقه‌وه تقریریکی
م ی توديعی حکومت کردوه .

حقیقتا تقریره‌که‌ی هر کلمه‌یه‌کی عادتا مقابل به کو-
هریکه و اکر وه‌کو معالی فرمویه‌تی ام مسئله‌یه وا

تطبیق بکری حکومت عراق زور استفاده‌ی لی اکا .

مع‌مافیه ام مسئله‌یه وظیفه‌یه‌کی مودوعه‌ی حکومته
و وظیفه‌ی او ذاتانه‌یه که‌لتم علمه‌دا اختصاصیان هیه .

معاون حاکم منفرد سلیمانی محترم صالح زکی بك که
بینیك له‌مه‌وپیش مقابل به خدماتی مکافاةً له وزارة
عدلیه‌وه له حاکم صلحیتی‌یه‌وه ترفیعی پی کرابو بو معا-
ونیتی حاکم منفرد اجاره به مسروریته‌وه بیستمان که له
وظیفه‌که‌ی‌دا تثبیت و تأیید کراوه . تبریك و تمنای
موفقیتی اکین .

---

## هاتن و رویشتن

****

سعادة متصرف خوشه‌ویستمان ایواری روژی جمعة
۲۹ مانك بو تماشا کردنی ایشو کاری ناحیه‌که تشریفی
برده بازیان و له دوای دو سعات عودتی فرمووه .

---

مفتش پولیس لوای کرکوك و هولیر محترم جناب
کاپیتان لینلدل له ۳۱ مارت دا تشریفی هینایه سلیمانی و
له‌دوای دو روژ عودتی کردوه .

---

قائممقام شارباژیر محترم رضا بك به مأذونیت له
۲۸ مارت دا تشریفی هینایه مرکزی لوا و له‌دوای سه
چوار روژ عودتی فرمووه .

---

له قوانی پشدر محترم حاجی عباس اغای ملیم اغا
چند روژ له‌مو پیش تشریفی هینایه سلیمانی له‌دوای چند
روژیك عودتی فرمووه .

مدیریتی عام محاسبات عمومیه

ژماره ٥٢/١/١٤٠٧/٧

تأریخ ٧ شباط ٩٢٩

منشور عمومی

بو متصرف لوای سلیمانی

موضوع : شرائطی قبول کردنی اوراق نقدیه و مسکوکاتی هندستان له خزینه و له معاملاتدا .

او تعلیماتنامەیه که لەو پیش لەطرف امدائرەیەوه اصدار کرابو خصوص قبول کردن و تداول پی کردني مسکوکاتی هندیەوه که حال حاضر متداول و اخـذو صرف اکرین له عراقدا اوا به خـلاصهٔ کراوی له خواریەوه بیانی اکەین .

— اوراق نقدیه واجبه له هر دو طرفیەوه نومروی موجودیت یعنی نومروی لای راستی و نومروی لای چپی به تواوی مابي به سریوه .

٢— واجبه او ژمارەیه که به لای راستیەوەیه عیني او ژمارەیەیش به لای چپیەوه هی .

٣ ـ واجبه مشتمل بی بسر امضا کیدابه تواوی .

بناء علیه اوراق نقدیەیك که مشتمل بەم شـرطانه نەبی جائز نیه له خزینەکاندا ور بگیریت هروکو که حا ئزنی بەم شرطانه نابی قبول نکریت و واجبه ور بگیریت دراوێش بوبی وفرتونیش بو بی و اوراق نقدیه یك [illegible] یش یکیك لەم شرطانەی بە بیت بالطبع له خزینەکان قبول ناکریت لکن بوخاطری صاحبەکەی [illegible] اتوانی راسا به واسطەی امدائرەیەوه مرا [illegible] ضابطی مسکوکات بکات که له شاری بومبایه بو اوه [illegible] تبدیل او ورقەیەی بو بکاتەوه به ورقه نقد یکی [illegible] یتی نقدا بو بنیرریت .

مار ـــ

---

اعلان

التزام عشری خضرات و اخشاب سپیدار عائد به قضای سلیمانی و کذا التزامی اراضی و انهاری امیریه که عبارتن له {سوسی کرەوی و احمد آوا و زاله و شیخ هوص و نل و شهیدان وسه کردەکان و سـوسی سیدان و کیله سپی و داود بولاق و حسن بك و کانی شیخ و قورتاس و بستان سـور} هر وا له موقعی مزایدەدا ماونەوه اوانه طالبی اجارەیانه لەلی تأمیناتی نظامیەدا مراجعت به مجلس ادرهٔ لوا بکەن .

متصرف سلیمانی

{ **** }

لەدائرهٔ طاپووه :

اعلان

اوشاوه که له کرەکی در [illegible] واقعـه ونومروی ١٠ — ٧٧ وتسلسل ٣٦٩ [illegible] حبیبه بگی حمه ورشید وفاطمه وحلاوه اولاد [illegible] وصرهونه بارکا لك دووه لای دائرهٔ ایتام [illegible] دوصد وبیستوپك روپیـه ودو انه مقابل [illegible] رهـنی وقاراج حرایه مزایدەوه له تأریخ ام اعلانەوه هتا چلوپنج روژیتر هرکـس طـالبی کرینیتی مراجعت به دائرهٔ طـاپو و منادی توفیق بکات سیم جار اعلان کرا .

---

اعلان

تقلیات و حیوانیك که بو جیش عراق پی ویست بی له مناقصەدایه اوانهٔ که طالبی مناقصەن بو ناظري له شرائطەکاني به مفصلی بکەن مراجعت به آمری منطقەی شـرقیه و به موقع قوماندانی کرکوك بکەن و مناقصه هتاساعت ١٢ ای روژی ٢٢ مارت ٩٢٩ قبول اکری .

آمری منطقهٔ شرقیه

---

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانی

بو همو شتیك
عرات بەزاوی ادارەخانەوە
اكری
§
ادارەخانە لەبنای بلدیەدایە
عنوان : سلیمانی ژیان
یکی بە انەیکە

# ژیان

ژیانی نوێ

كریار
بەشش مانك پنج
بەسالیك دە روپیە دەدا
بو دەرەوە اجرت
پوستەی علاوە ئەكری
شش مانك كمترابونە قبد ناكری
اعلانات
دیریك ٦ انە دەسینریت
یکی بە آنەیکە

هەر شتیك آوسی هفتەی دو جار دردەچی غزتەیکی كوردیە

٢٨ شوال ١٣٤٧ ٨ نیسان ١٩٢٩ [ دوشمە ] تاریخ انتشار ٢١ كانون ثانی ٩٢٦


## تشریف هینانی

معالی میجر ادمونس ، مستر ثمیس و سعادة میجرلوئید

* * * *

ایواری روژی پینجشنبەی مصادف ٤ ـ ٤ ـ ٢٩ معالی میجر ادمونس مستشار وزارت داخلیە و معالی مستر سمیس مستشار وزارت معارف و سعادت میجر لوئید مفتش اداری كركوك بە ری اغجەلرو سورداش دا تشریفیان هینایە سلیمانی و او روژە هتاكو سورداش لە طرف سعادت متصرف اكرم و سعادت مفتش اداری یەوە استقبال فرموران ، او دو شەوەی كە لە سلیمانی دا تشریفیان مابە وە ، لە مالی سعادت مفتش اداری میوان بون .

صبحینی او روژەی كە تشریفیان هینابو معالی میجر ادمونس لە كل سعادة متصرفی اكرمی دا هاتنە سرا همو مأمورە كورەكان و كورە و ناودارەكانی شار بو بە خیر هاتن و بیان ممنونیت تشریفیان بردە خدمتی . و بە حرمت یكەیكە قبول كران و بە خدمت كیشتن و بیان ممنونیت كیف خوشی خویان و ملتەكەیان برامبر بم تشریف هینانەیان لەخدمتا كرد . و ایوارەی عین روژ بو نان خواردن لە سفرهٔ سعادة متصرف اكرمی میوان بون . و معالی مستر سمیس یش او ینەی كە لە سلیمانیدا مایەوە لەزیارت مكتبەكان و كفتكو لەكل اربابان معارفدا خریك بو . و بواوەی تماشای احوال قضا و ناحیەكانی لواكەیش بفرمون بیانی روژی شمەی ٦/٤/٠ بە ریە سروچكدا تشریفیان بردە پنجوین .

بە مناسبتی زیارت ام دو داتیە كورەیەی و تو معالی میجرادمونس و معالی مستر سمیس كە زیارتی لوا كەیان كردین و بەلطفی زوری خویان همو ملتمان كیف خوش فرمو امانەوی حسیات و درجەی كیف خوشی ملتەكەمان عرض بكین :

معلوم همو لایكە لە زمان احتلالەوە معالی میجر ادمونس تشریفی هیناوەتە عراق ، بو حكومت و ملتی عراق و خصوصا بو ملت كورد كلی خدمتی كردوە .

اوی لە همو صاحب منصبانی حکومت فخیمە زیا ترلە کوردستانا مایەوە و لە همو کس زیاتر خدمتی ام ملك و ملتەی کردبی و زیاتر اکای لە همو احوال و اخلاق کوردەکان بی هر معالی میجر ادمونسە .

مشار الیە چوار سال زیاتر کە لە سلیمانی و هلبجە و رانیە و کرکوك دا مأمور بوە همو وقتی بو برز بونەوەی ام ملتە سعی فرموە و دائما همو ملتیشی مفتون اخلاق و لطف بی پایانی خوی فرموە و حقیقتا انکار ناکری لە حالیکا کە سلیمانی لە فلاکتی دی و توشی انقلابە بو و لە حالیکا کە مشار الیە لە کرکوکە وە تماشای ادارەی ام لوایە و قضا و ناحیەکانی افرمو ، اوی لە همو کس زیاتر یاریە و لطفیکی فوق العادەی لە گل مدرسەکان و مداریشتوی ام لوایە کردبی و اوی ام لوایەی هینابیتە ام حالەوە هر معالی میجر ادمونسە و چونکە لە معالیەوە معلومە کە بلندی ملتیك هر بەخوێندنەوە ابی بو امیش و بو لە ناتی مکتباتی کوردی و بو چاك کردنی زبان و داناتی کتیبانی کوردی زور حولی داوە بە نوعیك کە اتوانین بلین ام مکتبانەی کە ایستا هەمانە و ام چاك کردنەی کە لە زبانەکەمانا کراوە مؤجدی اولی هر مشارالیە بووە .

مشار الیە لەو بینەی کە تشریفی بردونە بغداد و او جیگا گورەیەی ورگرتوە دیسانەوە لە دوریشەوە دائما تماشای ام لوایەی فرموە و بو تواو کردنی نواقصاتمان لە همو کس زیاتر هول و تقەلای بو داوین اخباریش کە معالی «مستر سمیس» لە گلیا تشریفی هیناوە وام ذاتەیش کە یکیکە لە پیاوە گورە عالمە داناکانی ملت بریطانیا و کە داهیکی گورەی معارف و مکاتبە و مربی خاصی ولی عهد خوشەویست بریطانیا بووە و لە علوم و فنون و فن تربیەدا زور آگەدارە و کە موجدی معارف ایستای عراقە دلیلە کە ام زیارتیشیان لە همو شتیك زیاتر بو اکمال نواقصات معارفمانە .

مشار الیە وکو همو سالیك کردویەتی بە عادت زیارتی لواکەمان اکات و کە لە همو زیارتیکیا صد قات زیاتر توشی خوشی کردوین . امید اکین لەم زیارتیش هر بە عین فکرەوە لواکەمان زیاتر توشی لطف و احسانی خوی بفرموی .

ایمە کە ملتیکی فقیرین و لە غیر لطف و شفقتی حکومتی فخیمە نەبی چاومان لە هیچی تر نیە و همو اسباب خوشی و برزبونەوەمان هر بە واسطەی او لطف و شفقتەوە پیك هاتوە برامبر بەم چاکیەی کە لە گلمانا ابرازی افرمون ، دائما بە اخلاصیکی گورە مقابل بەم همو انسانیتەی کە لە گلمانا کراوە بە دلیکی خاوینەوە بیانی تشکر ئەکین و بە ناوی همو ملتەوە تمنای تمنای سعادت حکومت فخیمە و دوعای عمر دریژی ام میوانە خوشەویستانەمان اکین . امید اکین بەو خیالە گورەوە کە برامبر بەم ملتە هەیانە دائما موفق بن .

ژیان

## هوالی دەرەوە :

* * * *

### وضعیتی افغان

استانبول ـــ او اعضایانەی کە لە نەراوەکانی جمعیت علمیە تورکیا بون بو افغان و ئەجارە عودتیا کردوتەوە خبریان داوە کە وضعیتی امان الله خان زور محکمە و همو عشائرەکان بە جدی اطاعتیان پی کردووە . و لە اولی بهاردا بە قطعی کابل استیلا ئەکاتەوە .

### مستر غاندی

کلکته ــ له وقتی محاکمهٔ مستر غاندیدا که متهم کراره له وقتی سوتانی اموال تجارەی اجنبیدا • قلەبالغیکی زور دوری درکای محکمەی داوه •

ونتیجه مستر غاندی به روپیەیك جزا تجزیه کراوه •

### تألیفی عصبة الامیکی شرقیة

وکو غزتەی جمهوریت انوسی الی وادراکوی که تورکیا و ایران خریکن بو تشکیلی عصبةالامیکی شرقیه و بو ام خصوصه له همو کس زیاتر تیمور طاش خان مستشار دیوان شاه ایران سی اکات •

### عودتی ولی عهد بریطانیا

پاریس ــ له دوای تجهیز و تکفینی ماریشال فوش ولی عهد خوشه ویستی بریطانیا به طیاره عودتی فرمو تەوه بو لندن •

### صحت جلالة ملك جورج

لندن ــ جلالة ملك جورج صحتی زور چاکه و جاربەجار به پی خوی اکەری • و حتی ایستا بعضاً بو ملاقات خلقیش قبول افرموی •

### قونسلوس المان له عراق

بغداد ـ قونسلوس عام المان لەعراق اجاره بة رسمی زیارتی فخامت رئیس الوزرای کردووه •

### خزینهٔ حکومت انکلیز

لندن ــ له تقریر مالیەوه معلوم بوه که امسال هتا ٤ مارت ٩٢٩ ٩ـنو ملیون و چوار صد هزار لیرهٔ انکلیزی واردات لەمصارفات زیادی کردوه . و ام مبلغه ایستا له خزینەدا موجوده •

### داخلی :

* * * *

سعادة میجر لوئید مفتش اداری کرکوك که له رفاقتی معالی میجر آدمونس و معالی مستر سمیسدا تشریفی هینابووه سلیمانی له دوای روژیك عودتی فرموو بو کرکوك •

سعادت مفتش اداری کاپتان لاین له خدمت معالی میجر ادمونس دا تشریفی بردوه قضا وناحیەکانی اطراف •

مفتش پولیس سلیمانی محترم مستر شبرد و جناب ضابط استخبارات سلیمانی تشریفیان بردوه ناحیهٔ قرەطاغ ووارماوا وقضای هلبجه •

### اعلان

التزامی سال ٩٢٩ عشری سی دار ومخضرات مرکزی سلیمانی که خرابوه مزایدەوه مدتی مزایده و احالەی تواو بوه هرچند عشری سی دار خراوەته زیر پەیەوه • بلام بدلەکەی نەگەیرا وەته حدی لایق وعشری مخضراتیش هیشتا نه خراوته زیر پەیەوه بناءً علیه مدتی مزایده و احالەیان تا ١٠ ی مانگی نیسان ١٩٢٩ لطرف مجلس ادارهٔ لواوه تمدید کراوەتەوه هرکسی طالبی التزامه له گل تأمیناتی نظامیەکەی مراجعت به مجلس اداره ومحاسبەی لوا بکات •

متصرف لوای سلیمانی

### اعلان

خانویەك که له محلهٔ ملکندی واقعه و عائدی ورثەی عبدالله بك کوری اسماعیل بکه و حال حاضر به دوخانو

تقسیم کراوه له کل عرصەیك او بشـــانەی که عائدی متوفی محمد امین بك کوری عبدالله بکه و که عبارته له «١٤٦٤»سهم له اعتباری «٢٥٢٠» سهم و بو ورثهٔ انتقال اکات اوا مقابل به مهری مؤجلی حفصه خان کچی صالح عطار و مصارفات محکمه ورسومی و سائرەوه او ١٤٦٤ سـهمه بو مدهٔ «٣٠» روژ خرایه موقعی مزایدەوه . اوانهٔ که ضمیاتیان هیه لەظرفی مدهٔ مذکورەدا به صدی ده تأميناتەوه مراجعت به دائرهٔ اجرا و منادی توفیق آغا بکەن .

رئيس اجرای سلیمانی

---

لەدائرهٔ طاپووه :

اعلان

خانو یك كه له کرکی ماکەندیٔ واقعه و محادده شرق جنوبی به خانوی ١٢ — ٣٦ تسلسل ٤٩٢ که عائدی احمد و محمد کورانی محی الدین غفوره و تواوکری به خانوی ١٤ — ٣٦ تسلسل ٢١٩ که عائدی ورثهٔ سلیمان کوری عزیزیکه جنوبی به خانوی ٥ — ٣٤ تسلسل ٥٤١ که عائدی ورثەی سعید کوری حاجی احمد قرد و تواوکری به خانوی ١٠ — ٣٦ تسلسل ٤٩ امینه کچی سلیمان و رعنا خاتون غربی به خانوی ١٠ — ٣٦م تسلسل ٤١١ بیانکراوه و تواوکری بطریق عام شمالی بطریق عام و تواوکری به خانوی ١٢ — ٣٦ تسلسل ٤٩٢ بیانکراو و تسلسل ٦٢٠ ، له براوەی له قدیمەوه بدست امین کوری عبدالله وه بوه و له ویشەوه بو ورثەی بجی ماوه و لەو مدت بیست و پنج ساله بدست اما یشەوه بی منازع و معارض و بنا له سر طلب ورثەی مذکور باعتبار ١٧٢٨٠٠ بش بو سلمه کچی امین ٤٨٣٨٠ بش و بو هریك له غفور و مصطفی کورانی فرج کوری امین ٣٣٨٦٦ بش و بو خانم کچی فرج ١٦٩٢٣ بش و بو امینه کچی عزیز زنی فرج ١٢٠٩٥ بش و بو فهمی افندی کوری حاجی حسین ٥٤٠٠ بش و بو حمه امین کوری حاجی مصطفی ٢٢٢٦٠ بش مجددا بنا بانه و قید طاپو اکریت له تاریخ ام اعلانەوه هتا سی — ٣٠ روژ بو هر کسی حق و ادعایکی لم خانووه دا هیه به اوراق و مستمسکات قانونیەوه مراجعت به دائرەی طاپو بکات اگینا له کل تواو بونی مدتی قانونی بناوی ورثەی مذکوره وه تسجیل اکریت بو اکاداری بەکم جار اعلان کرا .

---

اعلان

تسلسل ٢ نفس قرەداغ

سـرای حکومت که له نفس دی قرەداغ واقعه و محادده (شمال شرقی به عرصه دوکانی ورثهٔ اوسته صالح تسلسل — ٦ و تواوکری به عرصه خانوی شیخ نجیب افندی کوری شیخ لطیف افندی تسـلسل ٤ و تواوکری بەطریق عام و بەعرصه خانوی شیخ نجیب افندی کوری شیخ لطیف تسلسل — ٤ و بەعرصه تسلسل ٣ که وقف مزکوت قرەداغه شرق جنوبی به عرصەی تسلسل — ٣ مذکور و تواوکري به جوکەی آو فاصله له بینیا و بین عرصەی امین آغای کوری عبدالرحمن آغا تسلسل — ١١ جنوب غربی بعرصهٔ شیخ علی کوری شیخ عبد الرحمن تسلسل — ١٠ غرب شمالی بعرصەی تسـلسل — ١٠ مذکور و تواوکری به عرصەی ملا کوری خضر مؤذین تسلسل ٩ و تواوکری به عرصه خانوی مصطفی کوری عبدالله تسـلسل — ٨ و تواوکری بعرصه دوکانی ورثەی امین کوری اوستا صالح تسلسل — ٧ و تسـلسلی ٢ یه لبر ارهٔ من القدیم به دست حکومتەوەیه و هتا ایستا ربط طاپو نکراوه ایستا به ناوی حکومتەوه معاملەی مجددی اکریت هر کـــسی حق و ادعایکی هیه له تأریخ ام اعلانەوه هتا «٣٠» روژیتر به اوراق و مستمسکات قانونیەوه مراجعت بەدائرهٔ طاپو بکات اگینا لەکل تواو بوني او مدته معاملەی بناوی حکومتەوه اکریت بو آکاداری هـمـو کس اعلان کرا .

---

مطبعهٔ بلدیهٔ سلیمانیه

بو همو شتیك

مخابرات باژوی ادارەخانەوه

اکری

§

ادارەخانه لەسلیمانی یلدیەدایه

عنوان : سلیمانی ـ ژیان

یکی بە آنەیکه

کریار

بەشش مانك پنج

بەساليك ده روپیه دەدا

بو دەرەوه اجرت
پوستەی علاوه ئەکری

شش مانك کمرابونه قیدناکری

اعلانات

دیریك ٦ انه دەسیتریت

یکی بە آنەیکه

هو شتیك اوسی هفتەی دو جار دردەچی غزتەیکی کوردیه

١ ذی القعده ١٣٤٧ ١١ نیسان ١٩٢٩ [ پنجشنبه ] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦


## ویستنیکی مشروع

* * * *

بو طلبی تطبیق او امتیازەی کە هیئت عالی عصبة الامم لە حلی ولایتی موصلا بە کوردەکانیان بخشیوه وبو اوەی ام حقوقە ، و ام امتیازه بە تواری لە همو محیط کوردستانا تطبیق بکری لە چوار ام مانگە دا لە طرف مبعوث محترمە کوردەکانەوه تقریریك تقدیمی رئیس لوزرای عراق رفخامت مندوب سامی کراوه .

وبو اوەی همو کوردەکان لەم مسئلەیه حالی ببن صورتیکیشی بو درجی لە غزتەدا بو ادارەخانەی ژیان نیرراوه .

وا صورتی اومطالبەی کە وکیل محترمەخوشەویستە بە قیمتەکانمان طلبیان کردوه بە ترجمە کراوی نشر کرا .

و درجۀ حسیات ومسروریتی ملتەکەیش برامبر بم فعالیتەی کە وکیلە خوشەویستەکانمان بو محافظەی حقوق وبو برزبونەوەی ولات وملتەکەمان کردویانە بە مفصلی عرض اکری .

نخ مت رئیس الوزرای عراق !

صورتیکی بو نخامت مندوب سامی عراق !

لەو وقتەدا کە لجنەی عصبة الامم خریك حلی مسئلەی موصل بو ، لە تقریرەکەیانا توصیەیان کردبو بە دانی بعضی امتیازاتی اداری بە ملت کورد ؛

لە خصوص ادارەیانەوه و بو تامین مصالحیان صلاحیت و حریتیکی کاملەیان پی بخشیبون ، بلام مع الاسف ام امتیازاتە کە لازم بو لە عموم کوردستانا تطبیق بکری هر منحصر کراوەتە سر لوای سلیمانی و هولیر و ام ریەی لە خصوص تطبیق ام امتیازەوه حال حاضر کیراوه نتیجەیکی علمی ، اقتصادی و ادارەیکی باش کە رغبتیان لەسری بی بە کوردەکان نایەخشی .

و معلومه ام اصوله و امریەی کە ایستا بو تطبیق ام امتیازه کیراوه و کە حکومت زور صعوباتی تیا اکیشی نتیجە فائدەیکی باشیشی نابی بو کوردەکان .

کواته لازمه بو تطبیق ام امتیازه تشکیلاتیکی عمومی و واسعتر بکری کە زیاتر ملائم بی بو حقوقی کوردەکان او وقته بە طبیعی امبارە قورسیش لەسر شانی حکومت سوك ابیتەوه .

به قلبیکی صمیمی‌یەوه استرحام اکین تماشای مطالبەکانی خواروومان بکن . و به عجله توسل و صلاحیت بدەن بو ام تشکیلاته مطلوبه مصیبه‌یه .

١ــ له فخامت تانەوه مخفی نیه که لوای موصل لەوضعیتی حاضرەي دا عبارته له بیست و چوار ناحیه و نو قضا و ام قضایانەیش امانەن : شیخان ، عقره ، زیبار ، عمادیه ، زاخو ، دهوك ، تلعفر ، سنجار و نفس قضای موصل . و اکر بلیین اکثریتی عشایر و اهالی ام قضایانه موافق لغة ، تاریخ و عادتیان کوردن شتیکی تازه نالین . و او خریطەیەی کەلجنەی عصبه الامم لەسر اساسیکی جنسیت لەم خصوصەوه رسمی کردوه لەبر چاومانه و به اشکرا اثبات و ایضاحی امه اکات .

غیری امیش جدا زور زحمته بومتصرف لوای موصل که دائما لەناو ام منطقه واسعەدا بگەری و اکاهدا ری هەمو احوال اهالیکەبی و دیسانەوه بو اهالیش زور زحمته که بو ایشی حکومتیان دائما بینه مرکز لوا و لەبر ری دوری و لەبر اوەی کەلەزبانی کوردی زیاتر لسانیکی که نازانن و لەبر اوەی کەوضعیتی مالیەیشیان مساعد نیەلەبر اوەاقتراح اکین تشکیلی لوایەکی کوردی بکن که مرکزەکەی دهوك بی و به لوای دهوك ناو ببری و قضای عقره ، زیبار ، عمادیه ، زاخو ، ملحق ام لوایه بن و تشکیلاتی ام لوایەش به پی تشکیلاتی لواکانی ایستای شمال بي و معاملات رسمیەیان بي به کوردی .

٢ ـــ و له فخامتانەوه مخفی نیه که موازنه و مقیاس ملتیك هر معارفه و هر معارف زین و سعادت و استقبالی ملتیك تأمین اکات . و عکسی امه اکر ملتی معارفی نبي محکومی مردن و ذلته . و اکر به منصفانه تماشای وضعیتی معارفی لوا کوردیەکان بکین و له کل معارفی منطقەکانی کەدا مقایسەی بکین متأسفانه چاومان پی اکەوی که معارفی منطقهٔ کوردستان بەدرجەیك دوا کوتوه که انسان متأثر اکات . و وا ازانین ام دواکوتنەی معارفیش هر له بر اوەیه کەمربوطا مدیریت عمومیه له بغداد که هیچ اهتمام ناکات بو اکمال او واسطانهٔ که معارفی ام مملکتەی پی ترقی اکات . و غیری امیش اسبابیکی تری هیه که به نسبت صدەوه مقداریکی زور کمی بو مصارف کوردستان صرف اکریت . و اهتمام ناکریت به ترجمه و تألیفی کتیبان .

له بر اوه اقتراحیش اکین که بو معارف ام لواکوردانه مدیریتیکی معارف تعین بکری که مدیرەکەی کوردیك بی و مرکزەکیشی له یکی لم لواکوردیانەدابی .

٣ ـــ توحیدی ادارهٔ چوار لواکوردەکه بکریت که سلیمانی ، کرکوك ، هولیر و دهوکه . و بوامانه تشکیلی مفتشیتیکی عام بکریت که رئیسەکەیان یکی بی له کوردەکان که اقتداری کفایتی بو ام وظیفەیه معلوم بي که مراقبهٔ همو ایشو کاری املوایانه بکات و متصرفی لواکانیش مراجعتی پي بکن و صلاحیەتیکی تواویشی بدریتی و مربوطی پایتختی حکومتی عراق بی و له لوا کوردەکانا تمثیلی همو وزارتەکان بکات . و بو امور مالیه ، اقتصادیه ، صحیه ، عدلیه یش هیئتیکی له زیر دستا بی بو استشاره .

٤ ـــ طلب لەحکومت اکین که سعی بکات بو تعدیلی بعضی مواد له قوانینی عراق دا ارانەی که ازاری به نظر وضعیت جغرافیای او منطقەیه بو حقوق خلکهٔ مساعد نیه تطبیق بکری و اقتراح اکین تطبیق مواد قانون اراضی بکن به صورتیك که دائرهٔ طابو به حقی قرار بتوانی تسجیل اراضیان بو بکات بو مدتیك که له دو سال کمتر نەبی بو اوەی که تسهیلاتیك بی بو بصالح

ام لیکه و تشجیعیشیان بکات که بو تسجیل اراضیکانیان تشبث بکن بەمجانی .

٥ — اقتراح اکین بودجەی عمومی ام مملکته منطقەی موافق بسبتی لای خوارەوه صرف بکری . له میزانیەی عمومی او مبلغەی که بو دوائر مرکزیه تخصیص اکری لی تنزیل بکری باقیەکەی تری مساواةً یا به نسبت نفوس و یا بەپی وارداتیان بەسر لواکانی کەدا تقسیم بکری . و لازمه مسئلەی کمرک عمومیەش به نظریکی دقت بکیری .

ای فخامتماب ! له کل او حسیاته چاکەی ایمه همانه برا بر به حکومت هیچ مانعیك نابینین بەاحترامەوه مطالبی ملتمان کەمان تقدیممان بکین بەصفتیك که رئیس حکومتمان کدن و رجا اکین ام مطالبه به نظریکی دقت تحقیق فرمون کەچند بو زراعت و ترقی اراضی و طرق مواصلاتمان چاکه و له تطبیقیا چند ادارەمان توسیع و وضعیتمان چاك اکات ، ایمه غیری شتیك نابینی که تطبیق زور باش و ممکنه طلبیکی تر ناکین که بو حالت و وضعیتی مالیه و سیاسیەی عراق خراپ بی .

دیسانەوه تعظیمات فائقه مان تقدیم ئەکین .

| اسماعیل | جمال بابان | محمد صالح |
|---|---|---|
| نائب هولیر | کذا | نائب سلیمانی |
| سیف الله | حازم | محمد جاف |
| نائب سلیمانی | نائب موصل | نائب کرکوك |

ای وکیلانی ملت ! ای خوشەویستانی همو

قومی کورد

صورتی ترجمه کراوی تقریره بەقیمتەکەتان که له نقطهٔ محافظهٔ حقوق ملتی کوردەوه داوتانه لەسرەوه درج کرا .

فعالیت و جدیەتیك که بو احقاق حقیکی مشروعی کوردەکان و بو ترقی و تعالیان ابرازتان فرمووه . سرور و خوشیکی خسته دلی همو ملتی کوردەوه .

ملت خوی زور به بختیار ازانی که وکیلیکی عالی و به قیمتی وکو ایوەی هیه . بو ام مطالبه مشروعەی که ویستوتانه همو پشتیوانتانن .

به خصوصی به ناوی ژیانەوه و به عمومی به ناوی ملتی کوردەوه تشکرتان اکین هر بژین .

ژیانه

---

صورتی تشکرنامەیەکه کەمحترم رئیس بلدیه له وکالتی ملتەوه به تلغراف بو وکیله خوشەویستەکانمانی نوسیوه

بغداد : مندوب محترم هولیر اسماعیل بك

صورتی « « « « جمال بك

« « « « سلیمانی محمد صالح بك

« « « « موصل حازم بك

« « « « سلیمانی سیف الله بك

« « « « کرکوك محمد بك جاف

امضای جنابتان دائر به مطالب مقدسەی کورد که طلبتان فرموبو منظورمان بو ماچیان کرد تشکری حمیتتان اکین له همو خصوصیکەوه بو معاونتتان حاضرین .

محمود

رئیس بلدیەی سلیمانی

صورتی تشکرنامەیەکە کە سکرتیر محترم کومەلی زانستی بە تلغراف بو وکیلە خوشەویستەکانمانی نوسیوە .

بغداد مندوب محترم هولیر　　اسماعیل بك

صورتی » » » »　　جمال بك

» » » » سلیمانی　　سیف الله بك

» » » » »　　محمد صالح بك

» » » » موصل　　حازم بك

» » » » کرکوك　　محمد بك

برامبر بەو تقریرەی کە بو مدافعەئ حقوقی ملت کورد داوتانە هەو کوردیك تشکر وتقدیرتان اکات وپشتیوانتانن .

سکرتیر کومەلی زانستی
کریم سعید

---

صورتی تشکر نامەیەکە بە تلغراف لەطرف قسمە لە اشراف بلدەوە بو مندوبە محترمەکانمان نوسراوە .

بغداد : مندوب محترم هولیر اسماعیل بك

صوری » » » » جمال بك

» » » » سلیمانی محمد صالح بك

» » » » موصل حازم بك

» » » » سلیمانی سیف الله بك

» » » » کرکوك محمد بك جاف

تقریرەکتان لە نقطەی محافظەی حقوقی ملتی کوردەوە شرفیکی گەورەی پی بخشین خاصة ایمە و عامە قومی کورد تحسین و تبریکتان اکات بژین .

رشید حاجی فرج　　فائق معروف　　رمزی

---

صورت تشکرنامەیکە کە لە طرف قسمیك گنج و منورەکانی سلیمانیەوە بە تلغراف بو وکیلە خوشەویستەکانمان نوسراوە :

بغداد ، مندوب محترم هولیر اسماعیل بك

صورتی » » » » جمال بك

» » » » سلیمانی سیف الله بك

» » » » محمد صالح بك

» » » » موصل حازم بك

» » » » کرکوك محمد بك

تقریرەکیان بە اشتیاقەوە ورگیرا ، تشکرتان اکین چاومان لیتانە ، روحمان لەدوتانە ا هەرابژین ا...

علی عرفان　　رشید　　احمد عزیز اغا

رشید صدقی　　ادیب　　علی ناجی

---

صورت تلغراف رؤسای همەوند

مبعوث محترم هولیر اسماعیل بك . و صورتی و رفیقە محترمەکانی !

تقریرە عالیەکتان ایمەی زیانەوە تشکرتان اکین . وبەدل وبەگیان لەدواتانین .

رئیس همەوند

فقە محمد　　عزیز کاك عبدالله

عزیز امین آغا　　احمد نصرالدین

---

لە ریاست بلدیەوە :

اعلان

لە رسومات بلدیە رسمی حیوانات نقل بە ۷۰۰۰ و رسمی کیالیە بە ٤٥٠٠ و رسمی دلالیە بە ٤٠٠ روپیە لە عهدەئ طالبیانایە هرکس طالبی ضمانتە مراجعت بە مجلس بلدیەی سلیمانی بکات .

---

مطبعەئ بلدیەئ سلیمانیە

له دائرهٔ طاپووه :

## اعلان

حدود الدكان ٩٨ — ٨٣ تسلسل ٥٢٩ دركزين شمال شرقى و شرق جنوبى و جنوبى غربى : طارق عام غرب شمالى به دوكانى بلديه تسلسل ٥٢٨ ٩٦ — ٨٣ ٠

حدود دكان ٩٦ — ٨٣ تسلسل ٥٨ شرق جنوبى بەدكانى دائرەى بلديه تسلسل ٥٢٩ ٩٨ — ٨٣ شمال شرقى و جنوب غربى بطرق عام غربى به دكانى دائرەى بلديه ٩٤ — ٨٣ تسلسل ٥٢٧

حدود دكان ٩٤ — ٨٣ تسلسل ٥٢٧ شمال شرقى و جنوبى غربى به طاريق عام شرقى به دوكانى دائرەى بلديه ٩٦ — ٨٣ تسلسل ٥٢٨ غربى به دوكانى بلديه ٩٢ — ٨٣ تسلسل ٥٢٦

حدود دوكان ٩٢ — ٨٣ تسلسل ٥٢٦ دركزين شمال شرقى وجنوب غربى به طاريق عام ، شرقى دكان بلديه ٩٤ — ٨٣ تسلسل ٥٢٧ ٠

حدود دكان ١ — ٧٣ تسلسل ٨٢٤ كويژه شمال شرقى به خانوى حاجى عزيز ١٢٧ — تسلسل ١٦٠ ، شرق جنوبى به خانو ودوكان حاجى سعيد اغا وشركاى ٧ — ٧٣ تسلسل ٨٢٧ ٣ — ٧٣ تسلسل ٨٢٥ جنوب غربى به طاريق عام غرب شمالى به دوكان اوقاف ١٤٩ — ٤ تسلسل ١٧١ ٠

---

## اعلان

حدود دوكان ١٢٩ ـ ٤ تسلسل ١٦١ كويژه

شمال شرقى ! طريق خاص شرق جنوبى خانوى حاجى عزيز تسلسل ١٦٠ ١٢٧ — ٤ جنوب غربى به دوكانى دائرهٔ بلديه تسلسل ١٦٢ ١٣١ — ٤ غرب شمالى به طريق عام

حدود دوكان تسلسل ١٦٢ ١٣١ — ٤

شمال شرقى به دوكان دائرهٔ بلديه ١٢٩ — ٤ تسلسل ١٦١ شرق جنوبى به خانوى حاجى عزيز ١٢٧ — ٤ تسلسل ١٦٠ جنوب غربى بەدوكانى دائرهٔ بلديه ١٣٣ — ٤ تسلسل ١٦٣ غرب شمالى به طريق عام

حدود دوكان تسلسل ١٦٣ ١٣٣ ـ ٤

شمال شرقى بەدوكان دائرهٔ بلديه تسلسل ١٦٢ ١٣١ ـ ٤ جنوب غربى بەدوكان دائرهٔ بلديه تسلسل ١٦٤ ١٣٥ ـ ٤ شرق جنوبى بەخانوى حاجى عزيز ١٢٧ ـ ٤ تسلسل ١٦٠ غرب شمالى به طريق عام

حدود دوكان ١٣٥ ـ ٤ تسلسل ١٦٤

شمال شرقى بەدوكان دائرهٔ بلدية تسلسل ١٦٣ ١٣٣ ـ ٤ شرق جنوبى بەخانوى حاجى عزيز ١٢٧ ـ ٤ تسلسل ١٦٠ جنوب غربى به دوكان دائرهٔ بلديه تسلسل ١٦٣ ١٣٣ ـ ٤ غرب شمالى به طريق عام

حدود دوكان ١٣٧ ـ ٤ تسلسل ١٦٥

شمال شرقى بەدوكان دائرهٔ بلديه ١٣٥ ـ ٤ تسلسل ١٦٤ شرق جنوبى به خانوى حاجى عزيز ١٢٧ ـ ٤ تسلسل ٦٠ . جنوب غربى به دوكانى ١٣٩ ـ ٤ تسلسل ١٦٦ كه عائد صاحب ملكه غرب شمالى به طريق عام

حدود دوكان ١٣٩ ـ ٤ تسلسل ١٦٦

شمال شرقى به دوكان دائرهٔ بلديه ١٣٧ ـ ٤ تسلسل ١٦٥ شرق جنوبى به خانوى حاجى عزيز ١٢٧ — ٤ تسلسل ١٦٠ جنوب غربى به دوكان دائرهٔ بلديه ١٤١ ـ ٤ تسلسل ١٦٧ غرب شمالى به طريق عام

حدود دوكان ١٤١ — ٤ تسلسل ١٦٧

شمال شرقى به دوكان دائرهٔ بلديه ١٣٩ ـ ٤ تسلسل ١٦٦ شرق جنوبى به خانوى حاجى عزيز ١٢٧ ـ ٤ تسلسل ١٦٠ جنوب غربى بەدوكانى دائرهٔ اوقاف تسلسل ١٦٨ ١٤٣ ـ ٤ غرب شمالى بەطريق عام

او هژده دوكانه كە وا حدود و تفاصيلى لە سەرەوە بيان كراوه مدة بيست ٢٠ سال زياترە لە تحت تصرف و تملكى دائرهٔ بلديەدايە بى منازع و معارض و لە بەر اوهٔ تا ايستا ربطى طاپو نەكراوه مجدداً بە ناوى دائرهٔ بلديەوه ربطى طاپو دەكريت لە تاريخ ئام اعلانەوه حتا سى ٣٠ روزيتر هر كس حق و ادعايكى لە سەر او دوكانانه هيه به اوراق و مستمسكات قانونيەوه مراجعت به دائرهٔ طاپو بكات لەگل تواو بونى او سى روز مدتى قانونيه تسجيل اكريت بو آگاهدارى هموكس سەيم جار اعلان كرا ٠

---

مطبعهٔ بلديهٔ سليمانى

سال ـ ٤ ژماره ۲۱۸ | ژیان | لاپەرە ۱

بو همو شتیك مخابرات بەناوی ادارەخانەوە اکری

§

ادارەخانە لە زاتی بلدیەدایە

عنوان : سلیمانی ژیان

کریار
بەشش مانك پنج
بەساليك دە روپیە دەدا
بو دەرەوە اجرت
پوستەی علاوە ئەکری
اعلانات
لەدیریکەوە هتا شش مقطوعا
سەروپیەو لەشش زیاتر جکداو
سەروپیەکە بو دیرەزیادەکانیش
دیری شش آنە اسینری

یکی بە دانەیکە ... ... هفتەی اوسی هفتەی دو جار دردەچی غزتەیکی کوردیە ... یکی بە آنەیکە

۱۷ رجب ۱۳٤۸ ۱۹ کانون اول : ۱۹۲۹ [ پنجشمە ] تاریخ انتشار ۲۱ کانون ثانی ۹۲۶

## عراقی ... ... امرو

غارسر غزتەیکی (نو ـ پشەنت ذونغ) المانی لە بغدادەوە بە عنوان سەرەوە ام مقالەیەی ناردوە بو غزتەکەی . و ایمەیش لە غزتەی العراقەوە ترجمە و عرض قارئین کرامان کرد .

بو اوە مواقق مدنیتی غرب پی بکەینەن لە ناو او ولاتانەدا کە حکومتەکانی غرب ادارەکەیان خستوتە زیر انتدابەوە عراق لە پیش همویانا قابلیتی پیدا کرد و مأذونیتی ورگرت کە لە سال ۹۳۲ دا بە تواوی حر و سربست و داخلی عصبة الامم بوی .

پیویستە لەم خصوصەوە اعتراف بکری کە یگانە حکومت انکلترە بو بە سببی ام حالەیان ، و ئو معلمیك ـ ماموستایکی مشفق بە بی تضییقات مساعدە کرد کە قوتابیەکانی علم و معرفتیکی زوری لی وەرگرن . اگر چە قوتابیەکانیش استعدادیکی باشیان هەبو بلام دیسانەوە لەمەدا تقدیری ماموستاکەیان اکری . هر کتی بیەوی بە دقت جاوی بە فرقیکی آشکرا بکەوی لە بین ریگای استعماریتی فرانسز و بریطانیادا پیویستە لە پیش همو شتیکا لە منطقەی سوریەوە بیتە عراق . بلام لەم مقایسەیەدا نابی فلسطین حساب بکری چونکە لە بر مهاجرتی صهیونیەکان امنطقەیە رنگیکی تری ورگرت .

بو اوەی سوریە جاوی بکریتەوە و عیتی فرانسزی بی مبشرە قوایکەکانی فرانسز لە صد سال لەمەو پیشەوە لە سوریەدا بو امخصوصە سعیان کردوە . لە حالیکا کە لە منطقەکانی ایمپراطوریتی عثمانیدا زیاتر قسمی عراق لە ناو تاریکی جهلا غرق بوبو و دائما علامتی وحشت و خرابە لە ناویانا نمایان بو .

بلام لە بین ام دە سالەدا کە لە کل تورکیا جیا کرایەوە حکومتە منتدبەکەیان توانی بم حالەیان بکەیینی و ئام قابلیتیان پی بەیدابکات نتیجە اوی مطلوبە هینایە حیزی فعلەوە و موفق کردن .

ئەو تجانەی کە امرو لە یانی ئەم دو منطقە منتدبەدا ئەبینین عجیبیکی زورمان ئەداتی :

لە سوریەدا حتی بو شاخەکانی جبل الدروز و شاخە روتەکانی ترزور ری اوتومو بیل هەیە . لە حالیکا لە اکثر

حال عراقدا لەوەختی باراندا ری بك نیە بەعمل بیت ٠

لە شام و بیروت دا وەکو جادەکانی پاریس چەند جادەیەکی گەورە هەیە ٠ بەلام لە بغداد کە شاریکی تاریخیە و لە کناری دجلەدایە وکە قابلە بە سبب ئەو دارخورمانە و ئەو قبە التونانەوە زور جوان اصلاح بکری یکی هیشتا لە غیراز منظرەیکی خراب ئەبی وضعیەتیکی تری لی نابینی ٠ هیشتا لە هەمو بغدادا جادەیەك هەیە کە شارەکە ئەکات بە دو قسمەوە و پێی ئەلین جادەی تازە ٠ لە سوریەدا زور پردی جوان جوان درست کراوە ٠ بلام لە بغداد بو ئەم بەر و ئەو بەری دجلە هیشتا اهالی لە جسریکی کونی پیش حرب ... تری نابینی ٠

بەلام اگر تەماشای مادیات بکری لە ... لە سوریەدا هیشتا معتادی بە صورتیکی ... ضابطان و افراد فرانسزبە ... و قومەکی ... یانەوە و عساکری ساغالین بە لباسە ... یانەوە مشاهدە ئەکری کە فرانسزبو ... دای ئاون ٠ بەلام لە عراقا زور ... انکلیزی نابینی ٠

قوماندان قوای هوائی بریطانیا لە بنایك دا ئەنیشی کە لە بەر چاو زور دورە و ئەم بنایە بە خشت و ... عادی درست کراوە کە لە سال ٩١٦ دا ... قوماندانی لمانی تیا مرد و لە ... تر فاتح بغداد مشهور جنرال مود تیا وفاتی کرد ٠

استاسیونی قوای هوائی بریطانیا کە صرف بو بردنی پوستەی هندستان دانیشتون لە خارج شارا هیچ دخلیکی بەسەر عراق ـ بغدادەوە نیە ٠ امانە کە حسابمان کرد هەمو قووەتی بریطانیایە و حق او چند ضابطە بریطانیانەی کە لەویدان بە جلی عسکریەوە نایەنە ناو شار و عظمتیك پیشان نادەن ٠

حکومت انکلیز لە ایستاوە خریکە ام انتقالیشان لە سر لا بالە کل ام مأمورانە کەمەی خویشیا ... تلی مأمورەکانی کە لە حکومت عراقا مستخدم بون لای برد ٠

لەمعیت رئیس جمهوری لبناندا حرسیکی عسکری هیە کە وکو معیەکانی رئیس جمهور فرانسز لباس وکلاوی آلتونیان لە سرایە بلام اگر تماشای حقیقت بکری لە بیروتدا هیچ قابینەیك نیە تشکل بکات لا بە انتخاب وفکری مندوب سامی نەبی ٠

بلام لە عراقا لە حالیکا کە بحرانی قابینە هبو بو ... دوزینەوەی ذاتیکی باش بو ریاستی قابینە پرسیاری لە مندوب سامی پیشو سیر کلایتون کرا ٠ لە جوابا گوتی ام حکومتە حکومتیکی مشروطەی صاحب ملك و پرلانە لە سر ملك و مجلس لازمە رأی بدات و شخصیك بو ریاست انتخاب بکات ٠ ابرەدا وظیفەی مندوب سامی عبارتە لەوی کە اگر لە ... مصالح حکومتەکەی و عراق خرابیکی دی مذاکرە لە کل عراق بکات ٠ ولە ... بە تواوی اتوانی بلی ام جوابە دلالت ئەکات کە حکومت انکلیز حریت و سربستیەکی تواوی داوە بە وطن و ملتە ٠ بلام فرانسز او ... کانەی کە لە ... یانا ٠ وکو ملکیکی خویان ووکو خویان صاحب خانوەکەین وا ادارەی ئەکەن ولە هەمو ... مداخلەی ... وڵاتەکە ئەکەن وبەم سبەبەوە بە عکس انکلیز ... کردوە بە دوشمنی خویان ٠

## هەوالی دەرەوە

### وزیر خارجەی روسیا هاتوته انقره

انقره — ١٢ ك ١ (رفیق قره‌غان) قومیسیری خارجەی روسیا له اوده‌ساوه هاتوته استانبول و لەویشەوه چوته انقره . و امڕاته چوار روز لەویدا امینیتەوه و له بابت عقد معاهده‌ی تجاریەی بین ام دو حکومتەدا مذاکره له کل توفیق رشدی بك وزیری خارجەی تورکیادا اکات

الین رنکه له بابت مسئله‌ی بین روس و چینەوه و له خصوص خط شمندوفری مانچو ههوه مذاکره بکەن .

---

### حکومت یاسو سلاویش تزییدی قوەت اکات

برن — مجلس اعاده‌ی اسوجره بیست ملیون فرانق تخصیص کردوه که بەمنیاك طیاره حربیه‌ی پی دروست و علاوه قوه‌ته‌کەی بکات .

---

### قوەی فرانسه له سوریەدا

پاریس — حزب رادیکالی فرانسه طلبی له حکومت کردوه قوەتەکەی سوریەی کم بکاتەوه و او مقداره صرفیاتەی که بو عسکری فرانسه اکری له سوریەدا و که ٨٨ ملیون فرانه کم و بکریت به ٤٤ ملیون . بلام وزیری حربیه له جوابا کوتویتی هرچنده زوو لازوم نیه ام هەمو قووته لەویدا استخدام بکرین بلام احتیاطا پێویسته بو مدەیکی تر لەویدا بمینیتەوه .

---

### بین آوستریا وایطالیا

ویانه — له بین آوستریا و ایطالیادا خلافاتیکی زور صمیمی و درستی کراوه‌تەوه و له نتیجه‌ی او ریك کونتیانا حکومت ایطالیا قراری داوه مقداریك پاره به قرض بدات به حکومت آوستریا که اصلاح مالیه‌کەی

---

### زیاری فخامتی معتمد سامی عراق

بغداد — فخامت معتمد سامی عراق و و چون به رسمی زیارتی جلالة ملکی فرمو اجازه‌ایش له کل مستر هولت سکرتیری شرقیه‌ی دارالاعتماددا بەرسمی زیارت رئیس وزرای عراق فرمووه . و موافق اصول له دیوانی وزارتدا استقبال کراوه و مدتیك تشریفی داوه‌تەوه .

---

### مزاحم بك الپاچه‌جی

بغداد — مزاحم امین الپاچه‌جی که چوبوه بیروت له دوای چند روژیك لەویشەوه روەو لندن حرکتی کردوه . و الین دو مانك لەویدا امینیتەوه و ام زیارتی لندنەی خصوصیه .

---

### تدقیق لائحه‌ی قانون مطبوعات

بغداد — حکومت عراق هیئتیکی تعیین و کوکردوه تەوه که تدقیق او لائحه قانونیه‌ی مطبوعاته بکەن که تازه خریکن تنظیمی بکەن . و کومەلەکه عبارتن له مستر دراور مستشار وزارة عدلیه و میجر آدمونس معاون مستشار داخلیه و حامد بك الصراف و حاجی حمدی الاعظمی .

---

### مقداری نخوشی له عراقا

له ایستاتستیق و تدقیقاتی صحه‌ی عمومی عراقەوه معلوم بوه که اوانه‌ی له سال ٩٢٨ دا توشی علت و نخوشی بون و بو تداوی مراجعتیان به خسته‌خانه‌کان کردوه مقداره‌که‌ی عبارت بوه له یك (ملیون) انسان

بو همو شتیك
خبرات بەناوی ادارەوه
اكری

§

ادارەخانه لەژای بلدیەدایه

عنوان : سلیمانی ژیان

یكی بەانەیكه

همو شتیك اوسی هفتەی دو چار دردەچی غزتەیكی كوردیه

ئابونه
بەشش مانك پنج
بەسالیك ده روپیه دەدا
بودرەوه اجرت
پوستەی علاوه ئەكری
اعلانات
لەدریكەوه هتا شش مقطوعا
سەروپیەو لەشش زیاترجكەله
سەروپیه كەبودریزیادەكانیش
دری شش آنه اسیری
یكی بەآنەیكه

٢٥ رجب ١٣٤٨ ٢٦ كانون اول : ١٩٢٩ [ پنجشمه ] تاریخ انتشار ٢١ كانون ثانی ٩٢٦


## هوالی درەوه :

له عراقا فحش منع اكری

بلاد ــ مدیر صحیەی عمومی عراق له دمیكەوه خریكه به حكومت قانونیك تنظیم و تصدیق بكات بو اوەی له عراقا به قطعی فحش منع بكری

محرریكی غزتەی بلاد لەم جهتەوه پرسیاری له مشار الیه (حنا بك خیاط) مدیر عام صحیه كردوه : له جوابا كوتویەتی منع كردنی ام مسئلەیەبوعراق مجبوریه چونكه به سبب ام حركته خرابەوه همو ساڵیك له عراقیكان مقداریكی زوریان توشی امراض زهرەویه ابن به نوعی كه همو یاتاق و خستەخانەكانی عراق تمكنی نابی ام نخوشه زورانه تداوی بكات و بیان‌نوینی و اگر هروا دوام بكات ام علته ساریه مهمه بەكرەنی له عراقا بلاو ابیتەوه و همو كس توشی ابی . و بەعلنی فحش كردن ایستا له اوروپایش‌دا به شدت منع كراوه و محكمەكانی انكلیز به شدة تجزیەی او كسانه اكەن كه به فحشەوه متهم اكرین . له فرانسه و سائر ممالكی غربدا دیسا نەوه به قانون فحش منع كراوه .

له سر اوه من دمیكه خریكی منعی ام ایشەم بلام لەم مسئلەیەدا وكو هیئت صحه متصرفیتی بغداد ، مدیر پولیس ، امین عاصمەیش مدخلدارن . و او لائحه قانونیەی كه من بو ام مسئلەیه تنظیم كردوه حوالەی وزارة داخلیه كراوه و لەویشەوه به سر او مرجعانەدا كه بخنم كرد توزیع كراوه . امید اكەم حكومت بەجدی تماشای ام مسئلەیه بكات و به شدت منعی بكات .

---

مسئلەی املاك انكلیزیكان له توركیادا

استانبول ــ لەم آخریەدا غزتەكانی انكلیز به شدة له علیهی او مقررانانه انوسی كه حكومت توركیا له خصوص املاك انكلیزەكانەوه داویتی

انكلیزیه صاحب ملكەكان بەو قیمته راضی نین كه توركیا قراری داوه مقابل به املاكەیان پیان‌دریتی . غیری امه له خصوص او تعدیاتەی كه له زمانی حربا له املاكەیان كراوه شكات اكەن . و ام بدلەی كه ایان دائی به نظر بدلی حقیقی ملكەكانیانەوه صدی پنجا و دووه .

قیمت نوط تورك زورهاتوته خوارەوە

اسـنانبول — له سر اوەی باقنوط توركیا زور تنزلی كردوه حكومت و وكالتی مالیه خریكن چارەی بكەن له نتیجەی همو تحقیقاتیكیا بوی معلوم بوه ام نقصه به سبب كەمیق محصولاتی امسالی توركیاوه پیدا بووه . چونكه امسال اخراجات نەبوه كه لەخارجەوه پاره جلب بكات و بەو سبەبەوه نوطەكانی خوی ترقی بكات .

---

توركیا كوملیكی ناردوه بو اوروپا كه فیری مسائلی بانق بەبن

استانبول — امسال توركیا (١٦) طلبەی كنجی ناردوه بو اوروپا بو اوەی فیری معاملاتی بانق بەبن بو اوەی لەو بانقەدا استخدامیان بكات كه توركیا تازه خریكه احداثی بكات به ناوی (بانق دولتی توركیا) .

---

رئیس تازەی جمهوریتی یونان

اثینه — له بر ناسازی و نخوشی مجبوراً (كوندریوتیس) رئیس جمهوری یونان استعفای كردوه . و له جیٔ او بو ریاستی جمهور له اعضا پیرە پیشووەكانی مجلس اعیان (مسیو زایمس) تعیین كراوه كه عمری «٧٢» ساله .

---

كوملی تضمینات حربیه

بروكسل — كوملی دولی تضمینات حربیه موافق معاهدهٔ یونغ مسودهٔ تقریرەكەیان تواو كردوه . بلام زور له مسائلی سیاسیەیان ترك كردوه بو اوەی كوملی دوەی لاهی قراری له سر بدات .

---

له هولاندەدا لافاو

استردلم — له هفتەی رابوردودا له اكثری ولاتەكانی هولاندەدا لافاویكی به شدة روی داوه به نوعیك كه دمیكه امثالی نەبیزاوه و شاری (ماركن) توشی مخاطرەیكی مهم بوه و آو دوری شارەكەی كرتوه و نتیجه غرق كردوه و زور له اهالیكەی توشی خطرهٔ غرق بون .

---

له ایرانا اختلاسات

طهران — له مسئلەی اختلاسات انبار زخائری حكومتیوه كه یتیك لەمویش وزارة مالیەی له سر متهم كرا اجاریش هشتا ماموری تران بم اختلاسەوه متهم كردوه و نودیی (دیوان جزای خاص) كراون .

---

داخل بونی توركیا به عصبة الامم

لندن — غزتەی دایلی مایل نوسیویتی مجاریش كەمیم دفعەیه حكومت توركیا خریكه وضعیت و معاملات و قوانینی عصبة الامم تدقیق بكات بو اوەی داخلی م جمعیته بەبی . و حكومت روسیه دائما خریكه توركیا اقناع بكات كه نچینه عصبة الامم وه

---

بانق نجد و كویت

كویت — حافظ وهبەی مستشار حكومت حجاز و نجد هیشتا هرله كویته وله كل حكومتدا مذاكره اكات بودركردنی عاصیەكان كەپنایان بردوته بر كویت .

---

تاریخ توركیا

استانبول — مصطفی كمال پاشا تالیفی جلدی اولی اوتاریخەی تواو كردوه كه بو مكتبەكانی توركیا كر و . یەتی و ام تاریخه هیشتا م جلدی تری ماوه كه برەبره تالیفی اكات .

### قوماندانی کراف زپلین

مونیخ ــ دوکتور ( اکنر ) ی قوماندانی کراف زپلین مشهوری المان ئەم جارە کردویانە بە اعضایەکی شرفی مجلس اعیان ٠

---

### وفات جنرالیکی انکلیز

لندن ــ ( جنرال شارل مونرو ) ی حاکم پیشوی جبل الطارق وفاتی کردووە ٠

---

### نەخوشی احمد زوغو بك

لندن ــ مفرضتی ارناوود بە رسمی خبری نەخوشی احمد زوغوی رئیس جمهوری بە درو خستوتەوە ٠

---

### برای نادرخان

بومبای ــ شاه ولی خانی برای نادرخان ملکی افغان کە ئەم جارە تعیین کراوە بە قونسلوس لندن مواصلتی هندستانی کردووە ٠ لە طرف هندیەکانەوە فوق العادە استقبال کراوە ، لە خصوص وضعیتی افغانەوە بریاری لی کراوە ، لەجوابی گوتویەتی : افغان لە درجەیەکی باشدایە ، امنیت و اسایشی پەیدا بوتەوە و هیچ غائلەیەك نەماوە ٠

---

### یونانیەکان زور شکات لە ترکیا ئەکەن

استانبول ــ غزتەکانی یونان بە شدت لە علیهی ترکیا ئەنوسن لە سەر ئەو تضییقاتەی کە لە ترسانەیدا مقابل بە واپورەکانی یونان ئەیکەن ٠ بەلام حکومتی ترکیا بە درویان ئەخاتەوە ٠ ئەلی مسئلەیەکی وا روی نەداوە کە یونانیەکان بەم نوعە شکات بکەن ٠

---

### بینی مصطفی کمال پاشا و موسولینی

استانبول ــ بینی مصطفی کمال پاشا و موسولینی زور خوشە و بە جاری دوستن ، ئەم جارە لەسەر ئەوە غازی پاشا صراقی زراعتی هەیە ٠ سنیور موسولینی بە واسطەی سفیری ایطالیاوە ( تراکتور ) یکی تازەداهاتوی اولەبین مودەی بە دیاری بو ناردووە ٠

ئەو واپورە حربیانەی کە ئەم جارە تورکیا داوییە بە فابریقەیەکی ایطالیایی دروست بکات ، ئەمەیش دلالت لە پێك کەوتنیان ئەکات ٠

---

### شیوعیەکانی پولونیا

وارشوا ــ لە سەر ئەوەی شیوعیەکانی پولونیا بە کەرەتی قیامیان کردووە ، هجومیان کردوتە سەر بنجرەکانی محکمە ، حکومت ( ٤٢ ) کەسی لی حبس کردن و بە جرمی خیانەتەوە سوقی محکمە کردون ٠

---

### گەورەی حزب شعب المانیا

برلین ــ لە سەر وفاتی دوقتور هر شتر زمان هەتا ایستە حزب شعب المانیا بی گەورە مابووەوە ، ئەم جارە بە انتخاب لە اعضای رایخشتاغ ( هر شولز ) کراوە بە سەرکردەی ئەم حزبە ٠

### مژدە

### جژن مبارکی (کریسمیس)

دوینی کە ٢٩/١٢/٢٥ ی مالك و روزی چوارشەمە بو تصادفی ( کریسمیس ) ـ روزی تولدی حضرت عیسی علیه السلامی کرد ٠ ام روزە روزیکی مبارك و باخصوص لای ملت عیسوی یومیکی مقدس و محترمە ٠

بە ناوی عمومەوە جژن پیروزە و مبارکبایی لە همو ملتی عیسوی اکین امید اکین هتا آخری همو سالیك بە مسروریت و دل خوشی تصادفی ام روزە مبارکە بکەن و تیا رابویرن ٠

ژیانه

## جەژنە

جزن {معراج} مبارك

صبحەی شەو کە تصادفی ٢٧ رجب ١٣٤٨ اکات جزنی معراجی مبارکە . ام روژە لای عالم اسلامیت زور مقدس و محترمە تمنا اکین ملتی نجیبەی اسلام بە موفقیت و کیف خوشی و بە عمومی ئمو سالیك ام روژە مبارکە بەبیننەوە و بە مسروریەوە لام جزنەدا رابوێرن * *

---

حسیات قضای تلعفر رامبر بە عبد المحسن بك مغفور

بغداد — مجلس بلدیی قضای تلعفر قراری داوە کە او مکتبەی امسال بە سبب معاونتی هابکەوە کراوەتەوە و او نادیەی کە بلدیە انشای کردوە هر دوکیان بەناوی جنەتمکان عبد المحسن کەوە ناو بنێن و پێیان بڵێن (نادی السعدونیە ومدرسة السعدونیە)

---

فقیر و عجزە خانەیك

بغداد — لە سر اوەی لە بغداد عجزە و فقیر و سقط و ایسی لە دست نەهاتو فوق العادە زورن مدتیکە حکومت خریکی کردنەوەی عجزە خانەیکە . بلام ایستا مدیری عام اوقاف خریکی ام ایشەیە و بەم زوانە ام مسئلەیە جیبجی اکات و عجزەخانەیك اکاتەوە .

---

لائحەی قانونیەی رسوم بلدیە

بغداد — مجلس وزرای عراق لائحة رسوم بلدیة تصدیق کردوە و بو موافقت و تصدیقیش تودیعی مجلس مبعوثان کراوە .

---

داخلی :

سعادت متصرف اکری لە هفتەی رابوردودا بو تفتیش و تماشا کردنی ادارەی ناحیە ، قضاکان تشریفی بردە مرکزی ناحیەی سورداش شمالی ، جنوبی و ناحیەی تانجرو ، خورمال و قضای هلبجە .

سعادت مفتش اداری کاپتان کاون بو تفتیش ایشی کاری ناحیەکان روژی جمعەی رابوردو تشریفی بردە ناحیەی قرەطاغ و وارماوا .

---

اعلان

بەپی ١٨٥٠٦ زمارە و ٩ کانون اول ٩٢٩ تاریخ امرنامەی وزارت داخلیە او غنامەی کە لە بازار ا افروشری یا بر سربرین لە طرف قصابەوە اآیا بە داشت لەطرف غری قصابەوە بکری تابع رسمی دلالە حیوانات نیە . بناءعلیە لەمەودوا ملتزم حقی نیە رسم دلالیە لەو اغنامە بسێنی کە لە بازارا فروشری ولە طرف هاتیشەوە اورسمە بە ملتزم ندری بواکە ان عموم اعلان کرا .

رئیس بلدیە

---

لە دائرة طاپووە .

اعلان

او خانوە کە لە کردکی کانی اسکان واقعە و حدودە [شمال شرقی بە خانوی ٢٧ — ١٥١ تسلسل ٥٦٦ کە عائدی ورثەی شیخ سعید افندی کوری شیخ محمد افندیە و تواو کەری بە شیو شرق جنوبی و جنوب غربی بە طریق عام . غرب‌الشمالی بە طریق عام و بە خانوی ٢٧ — ١٥٩ تسلسل ٥٦٦ مذکور ] و نومرە ٢٨ — ٤٢ و تسلسلی ٧٢ وە بە ناوی حفصە خانمی نقیب شیخ معروف افندیەوە مجدداً طاپو اریت لە تاریخ ام اعلانەوە هتا سی ٣٠ روژیتر هر کەسی حق و ادعایکی لە سر ام خانوە هیە باوراق و مستمسکات قانونیەوە مراجعت بە دائرەی طاپو بکات اگینا لە پاش تواو بونی او مدتی قانونیە قید اریت بو آکاهداری هموکیس اول جار اعلان کرا .

---

مطبعة بلدیة سلیمانی

بو هەر هەو شتێك

مخابرات بەناوی ادارەخانەوه

اکری

§

ادارەخانه له بناێ بلدیەدایه

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی بە آنەیکه

هەو شتێك اتوسی هەفتەی دو چار دردەچی غزتەیکی کوردیه

کرێ

بەشش مانك پێنج

بەسالێك دە روپیه دەدا

بو دروەوه اجرت

پوستەی علاوه ئەکری

اعلانات

لەدیریکەوه هتا شش مقطوعا

سەروپیەو لەشش زیاترجکه لە

سەروپیەکه بودیرەزیادەکانیش

دیری شش آنه اسینری

یکی به آنەیکه

٢٩ رجب ١٣٤٨ ٣٠ کانون اول ١٩٢٩ [ دوشەمە ] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦


## هەوالی دەرەوە :

سوء قصد له علیهی نائب ملکی هندستان

دلهی — له وقتیکا که نائب ملکی هندستان له کل عائلەکیا اچیت بو دلهی ده میل لەلای دلهی‌یەوه لەژیر خط آسنەکەی قطارەکەدا لەپریکا بومبایك انفق و بلاو ابیتەوه . بلام غیری خدمتکاریکی نەبی که لەواغونی نان خواردنا بریندار ابی ضرریکی تر بەکس ناگەیینی

مقصد لەگرانەوەی نائب ملك بو دلهی مذاکره کردن بوه له کل او پێنج کورە وطنیانەی هندستانا .

---

له مجلس عوام بریطانیا

لندن — له جلسەی اجارەی مجلس عوام بریطانیادا له لایی بصرەوه مذاکرەیکی تواو اکری . و وا دەر اکەوی لەم مذاکریەدا سیر اوستر جمبرلاین ، مستر ئیمرئشل ویلسون ، مستر ارژهندرسن بەشده مناقشه بکەن .

## تازه کردنەوەی معاهدەی بین روس و تورکیا

استانبول — رئیس جمهوری تورکیا له انقرەدا زیارتی رفیق قرەخان ممثلی وزارة خارجیەی روسی کردوه و ام زیارتەی دوسعات دوامی کردوه . و لەو اثنایەدا وزیر خارجیەی تورکیا و سفیری روسیایش حاضر بون . و قراریان داوه او معاهدەیە که له سالی ٩٢٥دا له پاریس کردویانه تازەی بکنەوه .

استانبول — او معاهده تازەیەی که اجاره له بین روس و تورکیادا کراوه له طرف وزیری خارجیەی تورکیاوه امضا کراوه . و رفیق قرەخان بەناوی حکومتی روسەوه دیاریکی تقدیمی غازی کمال پاشا کردوه که عبارت بوه له هیکلی (تیمرلان) له سمرقند

رفیق قرەخان له انقرەوه چوته استانبول له دوای چند روزیك اقامت ائەریتەوه روسیا .

---

## فیصل الدویش و کویت

بصره — وا دەراکەوی مساعی شیخ حافظ وهبة مستشار نجد عقیم نەماوەتەوه . چونکه وضعیتی کویت

...راوه و جوابی فیصل الدویشیان داوه و اویش به ...ند هزار عاصیه کەوه له کویت دەرچوه هاتوته بین ...دودی عراق و نجد .

---

### طیارهٔ حکومت نجد

بغداد — له پیشا خبر درابو که حکومت نجد خریکه له محطەی دراین دا جیکایەك بو ئەو طیارانه حاضر بکات کە ئەمجاره له حکومت انکلیزیان کری ..

ئەلین لەم روژانەدا طیارەکان وصلی ئەو جیکا بەیان کردووه و حتی بعضی اشیای طیارەکان کە لە بحر وە هینراوەتە بصره بە عجله بو یان براوه .

---

### بلنی کویت و ابن السعود

بغداد — ئەلین لەم روژانەدا لە پرچەند ارتەمو بیلیك لە ناوەراستی عربستانەوه هاتوتە کویت ، ئەم ارتومو بیلانە انذارنامەیەکی ملك ابن السعودیان پی بوه بو امیری کویت . ملك نجد لە انذارەکەیا کوتو یەتی: بە شدت امرم دا بەاوردوکەم ! کە بە طوپ و متراليوز و هەمو لوازمیکی حربیەوه مجهزن ، تعقیبی عاصیەکان بکەن ، اگر لە کویتیش دابن بچنە سەریان !

حکومت کویت بەرامبەر بەم انذاره خریکی تەدبیره .

---

### عاصیەکانی نجد

بغداد — ئەلین لە عاصیەکان قسمیك لە عشیرەتی « العجمان » لە ترسی تعرضی اوردوی حکومت نجد قراریان کردوته اراضی عراقەوه و چونەته لای عشیرتی « بنی حسین » .

لە سەر ئەوه حکومت عراق قوتیکی زرەلی ارتومو بیلی ناردوتە سەریان کە لە حدود دەریان کات و نەهیلی تجاوزی حدود بکەن .

---

### استعفای وزیری مالیەی المانیا

برلین — لەم روژانەدا وزیر مالیەی المانیا هر هیلفردنغ و سکرتیری خزینەی دنمی پروفسور پوبیتز له وظیفەکەیان استعفایان کردووه .

ئەم مسئلەیه طبیعی لە سەر مشکلات مالیەی المان روی داوه ، بە نوعیك کە لە دوای حرب هەتاکو ایستا المانیا مشکلاتیکی وای نەدیوه .

---

### دو طیارەچی فرانسه

پاریس — هیشتا حکومت فرانسه لەو دو طیارەچیەی کە غائبن خبریکیشی وەرنەکرتووه کە چیان لی هاتووه ، لە وسەتاوه نەهاتووه لە ئەم مانکەدا لە فرانسەوه حرکتیان کردوه بو جنوبی افریقا و لە نتیجەی ئەم سەفر تجربیاتەدا اثریکیان نەدوزراوەتەوه .

ایستا حکومت ایطالیا لە طرابلس غرب دا خریکی تحریاته لە بیاندوزیتەوه .

---

### نظام وزارت داخلیه

بغداد — جلالت ملك معظم نظامنامه تازەکەی وزارت داخلیەی تصدیق فرموه ولەم روژانەشدا ارادهٔ ملوکانەی لە سر صادر ابی .

---

### جادهٔ عبد المحسن بك السعدون

بغداد — امینی عاصمەی عراق لە خصوص کردنەوی جاده تازەکەی کە بەناوی مغفور سیر عبد المحسن بکەوه اکریتەوه تقریریکی تقدیم وزارة داخلیه کردوه . وبو ام خصوصه ٥٣ الك روپیەی تخصیص کردوه . ولەبر امەی امانی عاصمه ئەم هموە پارەی ممکن نابی قراری داوه یا لە حکومت ویا لە بانقەکان بە کفالتی حکومت قرض بکات .

ووزارت داخلیش تقریرەکەی حوالەی کونسیل کردوه کە چاك لەم ایشه وردبیتەوه .

## نادر خان

کابل ــ الین ملك نادر خان افغان به همو قوتیەوە سی اکات که اوردویکی زور گەورە تشکیل بکات که به تواوی اصلاحات داخلیەی افغانی پی بکات • و له دوا ی امه هەول ادات که افغانستان بکات به حکومتیکی عصری •

---

## حصۀ ایران له نوتدا

طهران ــ حکومت ایران له سال ۹۲۹دا «۱,۲۵۰,۰۰۰» لیرۀ انکلیزی له شرکۀ نوت (انکلیز و ایرانی) چنك کوتوە •

---

## بین عراق و بریطانیا

بغداد ــ وکو به تاریخ ۱۸ی مانك له کتب صحافەی شرقەوە نشر کراوە معلوم بوە که له هفتۀ آتیدا له بین حکومت بریطانیا و عراقا دست اکری به مذاکرە •
الین محافلی لندن خریکی سی کردنن له معاهدۀ مصر بکەن به دستور بو عراق • چونکه فرقیکی معلوم هیه له بین امدومحیطەدا لەوضعیتی سیاسیه و جغرافیا...یدا
او وقتەی عراق تودیبی عصبةالامم کرا حکومت بریطانیا ناتوانی محافظەی انتدابی بکات چونکه به حکومتی مستقلی صاحب حقوق ازانی •
بلام دوائری عراق ایەوی هەول بدات له کل بریطانیادا کەله پیش ۹۳۲دا داخلی عصبةالامم بکری •

---

## اوتوموبیلیك چند کسیکی پلیشانوتەوە

بغداد ــ یکی له طلبەکانی مکتبی قومیسری له جادۀ بغدادا اوتوموبیلیك لی اخوری و له بر نەزانینی سەسی کس اپلیشیتەوە که یکیکیان آفرەتیك ابی و دست به جی امری و اویتریان پیاویکی انکلیزی سیهمیان فریکی پولیسه که هردوکیان مهلك برینداربون له سر اوە پولیسەکه توقیف کراوە •

---

## تجارة بین شام و عراق

بیروت ــ شرکۀ هوائیەی شرق خریکی لثبت و سی کردنه بو اوەی مأذونیق بدریتی که تأسیسی شرکتیکی هوائی بکات بو مناقلات انسان و تجارتی بین سوریه و عراق •
ام شرکته الین رکه هتا بهار موفق بەبی به دانانی ام شرکته • اوسا طیارەکانی هفتەی دو کرەت له سوریەوە انسان سوار اکات و اموالتجاریه هەلاکری و ایکەینی به شرکۀ هوائی هندستان و ایران •

---

## شمندوفری بین جلفا و توریز

طهران ـ کومليكي تجاربەی که له طرف حکومتەوە نیردراون بو اوروپا خریکن له موسقووا و استقوهولمدا بای حوتصد هزار تومان واغون و اشیای تری شمندوفر بکرن بو اصلاحی خط شمندوفری بین جلفا و توریز • و حکومت ایران بو ام خطه متخصصین امریقا و المانیایی استخدام اکات • ام خطه له لاینی تجارتی بین روس و ایرانەوە اهمیتیکی گەورە کسب اکات •

---

## اغا خان و ژنه تازەکەی

لندن ـ بعضی له غزتەکانی هندستان له علیهی اغا خان انوسن و الین ام همو زوتەی لەو اسلامه فقیرانۀ هندستان کوکردوتەوە که عقیدەیان وابوە که اکر پارە بدەن به اغا خان مسعود ابن و له اسلامیتدا بەقدەر اسمان بلند ابنەوە • بلام اغا خان ام شایعەیه به درو اخاتەوە الی بو ام ژنه هر (۷۰۰۰) لیرەم صرف کردوە و قطعیاً مجوهراتم بو نکریوە و او خبرۀ که الین کویا حفتا هزار لیرەم داوە به جهازیا درویه و خلق کراوە •

بێنی مصر و روسیا

لندن ــ غزتەی دایلی تلغرافیکی نشر کردوە ئەلی : ئەو مذکرەیەی کە حکومت مصر ناردویەتی بە حکومت روسیە لە بابەت مسئلەی روس و چینەوە و بو ئەوەی رعایتی میثاق کیلوك بکری ۰

حکومت روسیە بە واسطەی سفیری پاریسیەوە ردی کردوتەوە ، چونکە ئەلی لەبەر ئەوەی علاقەکی سیاسیە لە بێنی ئەم دو حکومتەدا نیە ، مصر ناتوانی مداخلەی ئەم نوعە ایشە بکات و تکلیفێك لە روسیا بکات ۰

****

وزیر تورکیا لە بغدادا

بغداد ــ وزیری مفوض تورکیا لە عراقا کە تازە تشریفی هیناوە بە رسمی زیارتی رئیس الوزراء و وزیر خارجیەی کردوە ۰ و لەم چند روژانەیشا اوراق اعتمادەکەی تقدیمی جلالة ملك معظم اکات ۰

سەری سال

دو صبحی کە یکی کانون ثانی ۹۳۰ ە ابتدای سال تازەی میلادییە و ام روژە لای ملتی غرب و ملتە متمدنەکان روژێکی زور محترمە ۰ ولە دنیادا اکثری حکومت و ملتەکان ام روژەیان کردوە بە سەری سال تازە بو خویان ۰

امید اکین وکو چون سال ۹۲۹ بە خوشی و مسروری رابوررا هروا بە خوشی و بە امنیت و آسایشێکی تواو سالەکانی تریش بەبرێتە سەر و تیا رابوێرین ۰

تکایەکی تایبەتی

ادارەی غزتەکەمان بو کوکردنەوەی بدلات ابونە ئەوی لە خذمت ئەو ذواتە کرامانەیە کە لە بغدادن جناب شاکر مجرم افندی کردوە بە وکیل و دفتریکی مصدق بو ناردووە ۰ استرحام لە مشترییکانی بغدادمان ئەکەین ئەو مقدارە پارەیەی کە لە خذمتیانایە وکو لای شاکر افندی معلومە بەتەواوی تسلیمی بفرمون ۰

امیدی قویمان بە کریارە محترمەکانمان هەیە کە بو پاریەدانی غزتەکەمان هیچ نوعە مماطلێك دریغ نەفەرمون و تکرار استرحام ئەکەین بدلاتەکەی بەتەواوی تسلیم فرمون ۰

ژیان

— (§) —

اعلان

آلیکی ٦ مانگی ولاغی حکومتی پولیس لوی سلیمانی کە خرارەتە مناقصەوە طنی حوبە ٥ و طنی کا بە ٢٢ روپیە لە زیر بەی دایە ئەوانەی طالبن لە مدتی معیندا بوی کە بیشتنی شرائطەکەی و اجرای مناقصەی مراجعت بە مجلس ادارە و دائرەی پولیس لوای سلیمانی بکەن ۰

متصرف سلیمانی

اعلان

مدة التزام کانیی فوج سیم لە تاریخ ١-١-٩٣٠دا تواو ابی اوانەی طالبی التزام امکاتین بی وستە لە خاوەن صالح افندی عبدالرحمان قپمانجیدا مراجعت بە آمری فوج بکن بو اوی لە شرائطەکەی تی بگن ۰ وبی پێنج دوصد و پنجا روپیەش دیپوزیتو تسلیم بکن ۰ ۰ لە آخری کانون اول ٩٢٩ دا احالەی قطعیە تواو ابی ۰

آمری فوج ثالث

مطبعة بلدیة سلیمانی

بو همو شتیك
مخابرات بەناوی ادارەخانەوە
اکری
§
ادارەخانە لە تای بلدیەدایە
عنوان : سلیمانی ژیان
یکی بانەیکە

کریار
بەشش مانك پینج
بەسالیك دە روپیە دەدا
بو دەرەوە اجرت
پوستەی علاوە ئەکری
اعلانات
لەدیریکەوەهتا شش مقطوعا
سەروپیەو لەشش زیاترجکەلە
سەروپیەکەبودیرەزیادەکانیش
دیریشش آنە اسینری
یکی بە آنەیکە

هو شتیك ناوسی هفتەی دو جار دردەچی غزتەیکی کوردیە

٦ شعبان ١٣٤٨ ٦ کانون ثانی : ١٩٣٠ [ دوشنمە ] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦

## هوالی دەرەوە :

به مناسبق روزی چلەمینی وفاتی سیر
عبد المحسن بکەوە

بغداد — به مناسبتی روژی چلەمینی وفاتی سیر عبد المحسن بکەوە کومەلی عامیەکان له مرقدی شیخ عبد القادر گیلانی قدس سرە دا کوبونەوە . و همو اعضای حزبەکانی عراق ، رؤسای حکومت ، گورەکانی بغداد حصلی گەورە و بچوك عموم اهالی بغداد به نوعیك که لەو ساحە گورەیەدا جی بەرنەکەوتوە کوبونەتەوە لە دوای بانك دان و فاتحە خویندن له سر قبر مغفور جنتمکان سیر عبد المحسن بك له طرف شعرا و ادیبە. کان مرانەوە به صرە هر یکە قصیدەیکی غرا و یا نطقیکی مدهشیان خویندوتەوە کە سراپایەکیشیان لە اخلاق حسنە و خدمات برگزیدەی مشار الیه مغفور جنتمکان کردوە .

اعانەیك کەبو احیا کردنەوە ناوی مغفور
عبد المحسن بك کراوە

بغداد — او اعانەیەی کە هتاکو ایستا له طرف کومەلی عامیەکانەوە بو احیا کردنەوەی ناوی مغفور عبدالمحسن کو کراوەتەوە عبارت بوە له (١٥.٢٤٨) روپیە .

کومەلی بحری له لندن‌دا کو ابیتەوە

لندن — رئیس وزرای حکومت بریطانیا له مجلس عمومی‌دا کوتویتی کومەلی بحری کەعبارتە له اعضار پینج دولتە گورەکە له ٩٣٠/١/٢١ دا له لندن له مجلس لوردانا کو ابنەوە و جلالة ملك گەورەی بریطانیا اول جار خطبەی افتتاحی أدا افرموی .

کومەلی حزب سیاسی هندستان

بمبای — حکومت هند قراری داوە جواب او اقتراحە نەداتەوە کەبو عفوی مجرمینی سیاسی هندستان کراوە هەتا همو حزبە سیاسیەکان له لندن دا قبولی نەکەن .

نائب ملکی هند و حزبە سیاسیەکان

بمبای — نائب ملکی هندستان اسمی مندوبە سیاسیەکانی حزبەکانی هندستان تعین اکات لە دوای اوەی کە استشارەی لە گل رئیس کومەلەکانا کرد .

### ممثلی خارجیەی روسیە

استانبول — ممثل خارجیەی حکومت روسیە رفیق قرەخان کە راوەتەوە استانبول و لەویشەوە بە واپوریکی حکومەتەکەی گەرارەتەوە اودەسا .

### ولی عهدی قیصری روسیە هاتوتە عراق

برلین — غزتەکانی روسیە لە لندنەوە خبریان وەرگرتووە کە : ولی عهدی قیصری روسیە کویا نەکوژراوە ، لە ایرانەوە هاتوتە بغداد و لە وێش لە دوای تحقیقات سەربستیان کردووە .

غزتەکان ئەنوسن : باوەر ناکەین ئەمە اصلی بێ چونکە اگر فرض بکری کە ئەم کورە لە هەراکەدا تصادفاً نەکوژرابێ بەلام لەبەر ئەوەی لەشی زور لەر و لاواز بووە بە هیچ کولوجێ باوەر ناکەین تحملی ئەم هەمو عذاب و ناخوشیەی کردبێ .

### لبنان لە ادارەکەی دا اصلاحات ئەکا

بیروت — اوامری حکومتی دەرچووە بو ئەوەی دو لجنە تشکیل بکری کە اصلاح مالیە و محاکم حکومت لبنان بکات .

### شمندوفری بینی نصیبین و حلب

بیروت — شمندوفری بینی حلب و نصیبین دەستی کردونەوە بە هاتوچو و سفر ، ئەم قطارە لە دوای هەرای گەورە « حرب عمومی » وە پەکی کەوتبو و هاتوچوی نەئەکرد .

### بودجەی لبنان

بیروت — حکومت لبنان بودجەی سالی تازە « ٩٣٠ »ی ریك خستووە و هەندیکی زوری بو اصلاح اشغال و مواصلات و هاریجی « صحیە » کانی لبنانی داناوە .

### سفیری روسیە

لندن — دوائری سیاسیەی لندن زور عجایبیان لی دیت و اهتمامی پی ئەدەن کە لەوساوە نیرراو (سفیر)ی روسیە هاتوتە لندن ، هەتاکو ایستا اوراق اعتمادنامەی پیشکەش « تقدیم »ی حکومت نەکردووە .

### تبرع مجلس مبعوثان

بغداد — لە جلسەی ئەم جارەدا اعضاکانی مجلس هەلبژیرراوان « مبعوثان » هەر یەکە هەندیکی زور پیتاکیان داوە بو وینە « تمثال »ی مسیو عبدالمحسن بك سعدون ، بە رەنگیك کە لە هەزار روپیەوە بووە هەتا صەد روپیە ، دوایی ، بە کومەل نزیکی نوزدە هەزار روپیە هەر لە مجلس هەلبژیرراوانا کوکراوەتەوە .

### وزیر مفوض عراق لە انقرە

بغداد وزیر مفوض تازەی عراق لە تورکیا مولی رؤف بك الچادرچی لەم روزانەدا اوراق اعتمادنامەکەی تقدیم رئیس جمهوری تورکیای کردووە .

### کومەلی زراعی مالکی

بغداد — کومەلی زراعی مالکی لە بغداد دەستی کردووە بە درست کردنی بنایەکی محتشم بو خوی ، ئەم بنایە بەرامبەر حدیقەکەی بغدایە ، هەندیکی تەواو بووە و ئەوی تریشی بەم زووانە تەواو ئەبێ .

### معاهدەی حکومت مصر دولەتەکان

لندن — لە مجلس عوامدا سوال لە وزیری خارجیە کراوە کە آیا حکومتەکان اجنبی برامبەر بەم معاهدە تازەیەی کە بو مصر اکری درحق بە رعیەتەکانیان هیچ مطالبەیکیان داوا کردوە ویا اعتراضیکیان نواندووە ؟

ومستر هندرسن وزیر خارجیە جوابی داوەتەوە هەتاکو ایستا شتیکی وا روی نەداوە .

مسئله‌ی مصر له مجلس لوردان‌دا

لندن ـ غزته‌یکی انکلیز نوسیویتی که مناقشه‌ی اجارة مجلس لوردان بریطانیا که له سر معاهده تازه‌که‌ی مصر کردویا، زور به شدت بووه به‌نوعیك که مخاطره‌ی لی اکری . بالخصوص خطبه‌ی لوردلوید زور مهم بووه بلام الین تعرضات و مناقشات مجلس لوردان بریطانیا نابی به سبب تبدلاتیکی سیاسی و اداری

---

ئواکانی عراق برابر بوقاتی عبد المحسن بك

بغداد ــ اهالی لواکانی عراق برزه دستیان پی کردوه که هرلوایك کوملیك بنیری بو بغداد وه‌ناوی لواکه‌وه دسته کل بخاته سرقبری عبد المحسن بك جنتمکان .

---

نظامات وزارت داخلیه و مالیه

بغداد ــ هیشتا ئه‌و نظاماته‌ی مالیه و داخلیه‌ی که ته‌راو بووه و موافقتی جلالت ملك و عمومی له سر حاصل بووه و اراده‌ی ملوکانه‌ی له سر صادر بووه که تنفیذ بکری .

---

وفدی مصر له انتخابات‌دا موفق ابن

لندن ـ وکیل رویتر له مصره‌وه خبری داره که له اثنای معاملات انتخابیه‌ی مبعوثان حکومت مصردا وادر اکه‌وی حزب وفدیکان به قطعی موفق و اکثریه‌یکی تواو ورکرن .

و هروسا به قطعیش معاهده تازه‌که تصدیق اکری بلام پرویسته له‌دوای اکثریت پیدا کردنی اوان له تشکیل وزارتیان کرد دو وزیریان بنیرری بولندن که کفتکو له‌کل اولیای اموری اوی‌دا بکن .

---

مسئله‌ی دست له ایش کیشانه‌وه‌ی مدیری عامی اوقاف

له نتیجه‌ی تحقیقات له دائره‌ی پولیس دا هیچ دلائلیك روی نه‌داوه و معلوم نه‌بووه که له حقارت پی کردنی نائب حمه احمد افندی له‌راوی دا مدیری عامی اوقاف جمیل بك الوادی مدخلدار بووه ! و هیئه‌تیش که بو ئه‌م خصوصه تشکیل کراوه تحقیقاته‌که‌یان ته‌واو کردووه .

فخامت رئیس الوزرا امری داوه که مومی الیه جمیل بك الوادی بچیته‌وه سر وظیفه‌که‌ی خوی .

---

تکایه‌ك !

اداره‌خانه‌ی غزته‌که‌مان جناب شاکر مجرم افندی کردووه به وکیل ، امرحام و تکاله مشتریکانمان ئه‌که‌ین که بدلات ابونه‌ی «ژیان» که له‌خذمتیانا به به ته‌واوی تسلیمی مومی الیه شاکر مجرم افندی بفرمون .

ژیانه

---

سعادة متصرف اکری به مأذونیت هفته‌یك مفارقتی فرمو تمنای موفقیق اکه‌ین .

---

له دائرة طابووه .

اعلان

او خانوه که له کره‌کی کانی اسکان واقعه و محادده [شمال شرق به خانوی ۲۷ ــ ۱۵۹ تسلسل ٥٦٦ که عائدی ورثه‌ی شیخ سعید افندی کوری شیخ محمد افندی‌یه و تواو که‌ری به شیو شرق جنوبی و جنوب غربی به طریق عام . غرب‌الشمالی به طریق عام و به خانوی ۲۷ ــ ۱۵۹ تسلسل ٥٦٦ مذکور ] و نومرة ۲۸ ــ ٤۲ و تسلسلی ۷۲ وه به ناوی حفصه خانمی کچی نقیب شیخ معروف افندی‌یه‌وه مجدداً طابو اکریت له تاریخ ام اعلانه‌وه هتا سی‌ی ۳۰ روزیتر هر که‌سی حق و ادعایی له سر ام خانوه هیه به‌اوراق و مستمسکات قانونیه‌وه مراجعت به دائره‌ی طابو بکات اکینا له کل تواو بونی او مدتی قانونیه قید اکریت بو آکاهداری هموکس دووم جار اعلان کرا .

---

مطبعة بلدیة سلیمانی

### بین عراق و بریطانیا

بغداد ــ لەوساوە کەفخامت سیر فرانسیس همفریز تشریفی هیناوتە عراق متمادی خریکی مذاکرهٔ خصوصیە لە کل وزیرەکان و پیاوە ایش بە دستەکانی عراق. وا دەرئەکەوی بم زوانە بە رسمی دست بکری بە مذاکرە بو بستنی معاهدەیکی بین عراق و بریطانیا

### چند قانونیك ارادهٔ ملکی لەسر صادر بوە

بغداد ــ قانون التزام وارداتی حکومتی و قانونی اعضای دیونی عثمانی و قانونی دانی معاش و مقداریك پارە بە عائلەی عبد المحسن بك مغفور کە تنظیم و لە مجلس مبعوثاندا تصدیق کرابو اجازە ارادەی ملوکانە. یشی لە سر صادر بوە و خراوتە موقعی تطبیقەوە .

### تعزیەی روزی چلەمینی وفاتی عبد المحسن بك مغفور

قدس ــ بە مناسبتی روزی چلەمینی وفاتی سیر عبد المحسن بك السعدونەوە لە قدسدا تعزیەی بو کیراوە و بم سببەوە عربەکانی اطراف بە کومەل بە کولانەکانا رابوردون . حکومت فلسطین لەمە شبهەی کردوە و بو منعی وقوعات مجبور بوە فرقەیك عسکری سوق و داناوە بو محافظەی امنیت و آسایش .

### رومانیا و روسیا

بوکرش ــ لە بر اوەی حکومت روسیا مذکرەکەی حکومت رومانیای رەد کردونەوە کە لە بابت مسئلەی مانچوریەوە و بو محافظەی میثاق کیلوك دابوی . حکومت رومانیا مجبوراً بیاناتیکی تری نشر کردوە و زور بیان تأسفی کردوە لە حکومت روسیا .

### حدود بین المانیا و بلجیکا

بروکسل ــ حکومت بلجیکا لە ترسی المان مجبور بوە کە همو حدودی بین خوبو المانیا بکا بە قلا و بە تواوی مستحکمی کا چونکە حکومت فرانسەیزیش عین پیلان تطبیق اکات .

### طە بك الهاشمی

بغداد ــ مدیر عام معارف طە بك الهاشمی بوە بە رئیس عمومی ارکان حربیەی جیشی عراق و ارادەی ملوکانەیشی صادر بوە کە موقت همو وظائفیکی وکالتی قوماندانی عمومیش بەجی بینی .

### قوای روس لە مانچوریدا

برلین ــ لە سر پروتوکول (هابارسك) حکومت روسیا امری داوە بە قوماندانی عمومی اقصای شرق کە قوەتەکەی لە مانچوریدا بکیریتەوە .

### لە قومارا

نیس ــ ژنیکی انکلیزی کە ناوی (مسز واکید)ە لەمهفتە رابوردودا لە قومارا (١٦,٠٠٠) پاونی انکلیزی بردوتەوە .

### تجنید اجباری .

بغداد ــ لە مجلس مبعوثانا لە وقتی مذاکرهٔ قانون تقاعدی عسکریدا لە لاینی تجنید اجباریەوە سؤال لە وزیر دفاع کراوە لەجوابا کوتویەتی مجلس وزراء بو تدقیق و تنظیمی لائحەی قانونیەی امسئلەیە کومڵیکی تعیین کردوە کە عبارتن لە فخامة یاسین پاشا الهاشمی ، معالی امین زکی بك ، معالی نوری پاشا السعید و مفتش عام جیش عراق . ام کوملە بە عجلە و بە جدی خریکی تماشا کردنی ام ایشەن و بم زووانە لائحەکە تواو ابی و بو تصدیق ادری بە مجلس . بلام ناتوانم نتیجهٔ قطعی چون ابی لە ایستاوە عرض مجلسی بکەم .

ساڵ . ٤ ژماره ٢٢٢ ژیان لاپەڕە ١

بو هەمو شتیك
مخابرات بەزاوی ادارەخانەوە
اکری
§
ادارەخانە لە بنای بلدیەدایە
عنوان : سلیمانی ژیان
یکی بانەیکە

ژیان
هەر شنبە اوەی هەفتەی دو جار دردەچی غزتەیکی کوردیە

کریار
بەشش مانگ پێنج
بەساڵیك دە روپیە دەدا
بو دەرەوە اجرت
پوستەی علاوە ئەکری
اعلانات
لەدیریکەوە هتا شش مقطوعا
سەر روپیەو لەشش زیاتر جکەلە
سەر روپیە کەبودیرەزیادەکانیش
دیری شش آنە اسیئری
یکی بانەیکە

٩ شعبان ١٣٤٨ ٩ کانون ثانی ١٩٣٠ [ پنجشنبە ] تاریخ انتشار ٣١ کانون ثانی ٩٢٦

## ردیەیەبو او مقالەیەکە خطاب بە مدیرە عام معارف بە امضای (قال و قیل) لە غزتەی ژمارە ٢٩٥٦ و ٢٦/١٢/٢٩ العراق نوسرابو

{ ١ }

زور بە مراقەوە ام مقالەیم خوێندەوە . بەبی اوەی اعتبار بکەم بە تأثیریك کە مقالەی مذکورە سەر قارئەکانی ترا بکات و یا بزانم کەلە طرفیکی ترەوە جوابی ردی بو انوسریتەوە یا نا ؟ بە اعتباری شخصی خوم جواب دانەوەی ناشرەکەیم ــ کە بالطبع معلمیکە ــ بە وظیفە تلقی کرد . فقط لە پیش اوەی دەس بە تنقیدات بکەم امەویت تأمینات بە قارئە محترمەکان بدەم کە من لەوانەنیم مدافعۀ قدیم ، تجاوز و هجوم تجدد ، تزییف عصریتی بکەم . بالعکس لە ژیر پرنسیبیکی معقولدا یکیکم لەوانەی کە طرفداریکی تشنە و صمیمی او تجدد پروریەن کە کافل و ضامنی خیر و سلامتی وطن و ملت بیت .

فقط امەویت بە ایضاحی خطایك کە عظیم و ناقابل عفوە ، بە تشریح بساطت فکریك کە عیبیکی گەورەیە بو معلم و خصوصاً بە تنقیدی اقتراحیك کە دلیلیکی مهمە بو بی وقوفی و بی تجربەیی صاحبی مقالەکە امثالی مومی الیە منع بکەم لەوەی کە بکەونە وضعیتیکی وا مضحکەوە و بەم صورتەیش لە خصوص محافظە و صیانتی شرف معارفەوە خدمتیکی بچوك بەجی بینم .

ناشر مقالە الیت : او معلمانەی کە لە دارالمعلمین نشأت دەکەن ادرینە ژیر ادارەی مدیرە قدیمەکان لە بر اوە لە خصوص تطبیقاتی او نظریانەوە کە لە دارالمعلمین خوێندویانە مشکلاتیکی گەورە اکیشن و او مجادلانەی کە لە خصوص فساد عقیدە و خطای فکر و رأیانەوە لە گل ام نوعە (متقاعدین عسکریە) وە دیکەن غیراز اوەی کە منتج بی بە داخل بونی خویان بە ریزی (مشاغب)ین فائدەیکی تر نابخشیت . و لەم زمینەوە شکایتیکی دورودریژ اباتە بەر معارف و بەمەیش لەوە امینە کە ایشیکی باش و مهمی کردیت فقط مع الاسف

لازمە زور چاك بزانیت كە ام شكایتە نامعقولەی دلیلیكی یكجار بە قوتە بو اثباتی استفادە نەكردنی خوی لەو علومەی كە تنها قسمیكی محدودی خویندوە لە مقدما. تەكەی . چونكە اگر او حقیقتاً تیبكەیشتایە و خاصتاً لە علمەكانی (بسلجە و فسلجە)كە بە ذكری ناویان اكتفای كردوە لە درجەی مطلوبدا مستفید ببوایە دەبو بیزانیت بالذات مبشرینی (تربیەی حدیثە) لە اثنای تطبیق بسیط ترینی نظریەیكدا بە چە عزم و متانتیك اقتحامی او موانع و مشكلانەیان كردوە كە دوچاری بون و خولاصی اقتضاءً بەوان لە ریی تطبیق او نظریانەدا كەبە معقول و موافق بزانیت او مشكلانەی كە بحثی كردوە بالفرض دوچاریشی بوبیت اقتحامی بكردایە و بە صورتیكی تدریجی بەرەوروی غایەكەی خوی هنگاو و عزم و متانتی بهاویشتایە . نەك بە مقالەیكی وا بیمعنا و پرو پوچ تزییفی كتلەیكی گەورە و منوری بخیالدا بهاتایە .

لەوش ام یش او بزانیت كەلە دنیاداهیچ متجددیك مجرد بە قسە وشات ساحەیكی فعالیتی وای دس نكەوتوە كە مساعدبی بو تطبیق نظریاتی خوی .

مثلا : تاریخ بومان اگیرینەوە كە [ نبی ذیشان صلعم ] لە ری تطبیق نظریاتەكەیدا كەبنظر عصری خویەوە تازە و اشنیە بو چندە مشكلات وصعوباتی كیشاوە ودوچاری چە نوعە مصائب و فلاكتیك بوە عجبا بوچ اقتحامی كرد ؟ بیشبە چونكە غایەكەی اظهار حق وحقیقت بو دیزانی مطلقا سەر اكەویت ولە سەریكی تریشەوە مشكلات تطبیق نظریاتیك كە تجدد پرورانەبی لەبرچاوی بو . یعنی گەورەیی و گرانی وظیفەی متجددیكی حقیقی ادراك كردبو وبەحقیقت (متجدد اعظم ) بو . مشهور [ تولستوی ] كە یكیكە لە اعظم مبشرینی ( تربیەی حدیثە ) لەری غایە ونظریاتەكەیدا اول جار نفسی خوی كرد بە ساحەی تطبیقات ، ولی معلوم بو كە تطبیقی ام نظریاتەی لەسر عائلەی خویشی ممكن نیە . لەبر اوە بلا تردد لە زوتی ، لە قصری بەو شهرت وموقعیكی بلند اجتماعی كە هیبو جیابووەوە بەم رنگە بە هاویشتنی خطوەی اولی لە طرف خویەوە حجر اساسی بنایەكی دانا كە مساعدبی بو تطبیق نظریاتەكەی وزور اجتنابی كرد لەوەی كە وكو ناشری مقالە بو تطبیق نظریات معقولەی خوی لە حكومت ، لە معارف ، ویا لەواسطەیكیترا استمدا ولەو محیطەی تیایەتی بە تزییفی عمر وزید وقت ضایع بكات .

ماوەتی

## هەوالی دەرەوە :

****

بینی عشائری نجد و عراق

لندن — لەمجلس عوامدا مستر دای پرسیاری كردوە آیا حكومت هیچ خبریكی وەرگرتووە لەو هەوارەوو پایەی كە لە بینی عشائر و عسكری شرق اردن دا هەیە و بینی نجد و عراق هیچ هەرایەكی تیا روینەداوە ؟

مستر شبلی لەجوابا گوتویەتی : خبریكی وامان وەرگرتووە كە لەبینی عشائر و عسكری شرق اردندا هەرایەكی جزئی بووە . بەلام معلوم نەبووە كە عشائرەكان دەستیان كردبی بە حركتیك . خبریشمان وەرگرتووە كە هەمو تدابیریك اتخاذ كراوە كە لە بینی نجد و عراق دا هەرایەك رونەدا .

لیمانی شاهپور

طهران — متخصصیكی هولاندیی لە طرف حكومت ایرانەوە مأذوریتی دراوەتی كە انشای لیمانی

«شاهپور» بکات له ساحل خلیج فارس دا ، ئەم مخصصەیە کوتی بەتی : ئەم لیمانە هەرەگەورەترینی ایمانی دنیا ئەبی و بالخصوص لە روژ هەلاتی ناوەراست دا حەدایك خطە اهنەکەی ایران تەواو بو .

---

باران

طهران — لە ایرانا بارانێکی زور باری وە بەرەنگێك کە چوار ، ە کیلومەترە لە نزیك مازندرانەوە خطی شمندوفر. دکەی تێك داوە .

---

قابینەی مصر

لندن — ازانسی رویتر خبری داوە کە بەم زوانە انتظار ئەکری لە وفدیەکانی مصر و لە ریاستی مصطفی نحاس پشادا قابینەیەکی تازە تشکیل بکات .

ئەو مالانەی بچە سقا داکیری کردبو

بومبای — ملك نادر خانی افغان امری داوە : او مالانەی کە بچە سقا داکیری کردبو بو صاحبەکانی اعادە بکرێتەوە .

گەورەکانی هندستان

بمبای — گەورەکانی هندستان وەکو غاندی و ... لە دلهی دا کوبونەوە بو ئەوەی قرار بدەن کە ... لە گەل نائب ملکی هندستان بکەن .

---

امان الله خان خریکی چیە ؟

بمبای — أمان الله خان لە رومادا خریکی ئەوەیە بە انشیکەوە رابویری ، لە پیشا قراری دابو کە اشتغال بە زراعتەوە بکات .

ئەم جارە نوسیویتی بو وکیلە تجاریەکەی خوی لە پشاور کە بە عجلە بچیتە روما بو لای کە لەوی مذاکرە تا ... تجارتێك بکەن .

وزیری مفوض تورکیا لە عراقا

بغداد — وزیری مفوض تورکیا لە بغدادا بە رسمی زیارتی جلالت ملکی کردووە و اعتمادنامەکەی تقدیم کردووە .

جلالت ملك فوق‌العادە حرمتی گرتووە و لە بابەت دوستایەتی ئەم دو حکومەتە وە نطقیکی ادا فەرمووە ، لە جوابا وزیری مفوض تورکیش بە ناوی حکومەتەکەیەوە بیانی تشکری فەرمووە .

---

قونسلوس عراق لە تورکیادا

بغداد — قونسلوس عراق رؤف بك الجادرجی لە انقرەدا زیارتی جلالت رئیس جمهوری کردووە و اوراق اعتمادەکەی تقدیم کردووە .

---

جادهٔ تازهٔ بغداد

بغداد ـ حکومت عراق بە همو قوتیەوە خریکی کردنەوەی جادەیکی تازەیە لە بغدادا . و بو امخصوصە لە طرف امین عاصمەوە اعضایك و لە طرف وزارتی اشغال و مواصلاتەوە اعضایك و لە لایێ متصرفیتی بغداوە اعضایکی تر تعیین کراوە کە ام ذاتانە کومەل ببەستن و بە عجلە تماشای ام ایشە بکەن و قراریکی نهائی لە سر بدەن کە امانتی عاصمە زو بە زو دست ... بە کردنی ام جادەیە .

طلبەکانی جامعەی آل‌البیت

بغداد ـ لە بر اوەی بو قوتابیەکانی جامعهٔ آل‌البیت و بو اوانەی کە لەو کلیەدا اکمال تحصیل ... استقبالیکیان نیشان نەدراوە همو قوتابیەکان ... روناکی استقبالیان و بو اوەی حکومت قراریکیان و بداتە لە وظیفەیکی معینەدا استخدامیان بکات متمادی مراجعة بە حکومت اکەن . بلام هیشتا قراریکیان ... نەدراوە لە بر اوە کلیەکە لە نظر طالبەکانیا قیمتیکی نەماوە و بە جدی تحصیلی تیا ناکری .

## روژی نهضەی ملی عرب

****

صبحینی کە نوی مانگی شعبانە تصادفی جژنی نهضەی ملی نجیبەی عرب اکات . بم مناسبتەوە هەمو دوائری حکومتی تعطیلە .

ام روژە لای ملتی عرب روژیکی زور مقدس و محترمە چونکە لە زمانی شەری گورەدا ملت عرب لەم روژەدا بو احیای عنعنات ملیە و دست کوتنی حقوقیان دستیان کرد بە قیام و نتیجە موفق بون

امید اکەین بە موفقیتی هەمو ساڵیك ام روژە ببیننەوە .

تکایەك !

ادارەی غزتەکەمان جناب شاکر مجرم افندی کردوە بەوکیل ، استرحام و تکالەمشترێکانمان ئەکەین بدلاتی ابونەی « ژیان » کە لەخذ دیانایە بە تەواوی تسلیمی موی الیە شاکر مجرم افندی بفەرمون .

ژیان

—(§)—

اعلان

عرصە خانویك کە واقعە لە محلۀ سرشقام لەبەردم مالی حاجی قافتح الله دایە و ملاك میریە لە طرف حکومتەوە افروشری ولە تاریخ ام اعلانەوە خراوتە مزایدەوە لەپاش ٤٥ روژ لە تاریخ اعلانیەوە احالەی ابتدائی اکیشری ولە پاش ١٥ روژ ٥ / ١٠ ضمانم قبول اکری اوکسانەی طالبن بو وەی ضمانەیان لی قبول بکری بە نسبت قیمتی عرصەکەوە پێویستە

١٠ / ١٠٠ ی امانت تسلیم بە خزینە بکەن و مراجعت بە مجلس ادارە و محاسب لوای سلیمانی بکەن .

متصرف سلیمانی

—✽—

لە دائرۀ طاپووە .

اعلان

حدود اربعە : جبهەی طریق عام یمنی ٢٢ — ٢٤ عرصە خانوی فارس افندی یساری ٢٦ — ٢٤ خانەی کریم کوزی محروم خلفی ١٥ — ١ خانۀ فارس افندی .

عرصەیك کە لە گرەکی کویژە واقعە و با طایع عائدە بە دائرۀ بلدیەی سلیمانی و بە ٢٤ — ٢٤ ژمارە مرقمە و حدودی اربعەی لە بالاوە نشان دراوە بالمزایدە افروشری . بو مزایدە ام عرصەیە لە تأریخ ١ کانونثانی ٩٣٠ وە هتا ١٥ شباط ٩٣٠ (٤٥) روژ و بو احالۀ قطعیەی لە ١٥ شباط ٩٣٠ وە هتا ٢ مارت ٩٣٠ ١٥ روژ مدة تعین کراوە هرکس طالبی کرینی ام عرصەیە بە نسبت قیمتی عرصەکەوە صدی دە تأمینات لە گل خوی بهینی و مراجعت بە مجلس بلدیە بکات .

اعلان

مدة التزام کانتین فوج سەیم لە تأریخ ٢٩/١١/٣١ دا تواو بوە اوانەی کە طالبی التزامی ام کانتینەن پێویستە مراجعت بە مقری آمری فوج ثالث بکەن و لە شرائطەکەی بکەن و لازمۀ دوصدوپنجا روپیەپیش ئەدیو زیتو تسلیم بکەن . و لە چواردەی ام مانگەدا احالەی قطعی ادری .

آمری فوج ثالث

---

مطبعۀ بلدیۀ سلیمانی

بو هەمو شتیك

مخابرات بەناوی ادارەخانەوە ئەکری

§

ادارەخانە لە ... بلدیەدایە

عنوان : سلیمانی ژیان

یکی بە آنەیکە


کریار

بەشش مانك پێنج

بەسالیك دە روپیە ئەدا

بو دەرەوە اجرت

پوستەی علاوە ئەکری

اعلانات

لەدیریکەوەهتا شش مقطوعا

سەروپیەو لەشش زیاترجکەلە

سەروپیەکەبودیرەزیادەکانیش

دیریشش آنە اسیتری

یکی بە آنەیکە

هەو شتیك اوسی هفتەی دو جار دردەچی غزتەیێکی کوردیە

١٦ مبان ١٣٤٨ ١٦ کانون ثانی : ١٩٣٠ [ پنجشمبە ] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦


ردیە یە بو او مقالەیەکە خطاب بە مدیر

عام معارف بە امضای (قال و قیل)

لە غزتەی ژمارە ٢٩٥٦

و ٢٩/١٢/٢٦ العراقا نوسرابو

{ ٢ }

پاشماوەیە

⁂

مع‌مافیە ئەوانە بلاقیدوشرط نظریات‌تازە و صحیانەی «تولستوی»یان قبول کردبیت اوندە کەمن بانکوست ازمیردرین . کەوابو ام مبشرە گورەیەی تربیەیە مقابل بە فدا کردنی هەمو غروریکی بشری خوی تنها چند نظریەیکی یك‌دو صحیفەیی ـ اویش مخصوص بە ارباب تربیە ـ بعضی کتب و مجلەی پی اهدا کرا . مع‌مافیە او سربستیەتەی کە «تولستوی» لە مکتب منالە فلاحەکانا تطبیق دەکرد سربستیەتیکی اوندە مفرط و آشوری بو کە تا ایرو ممکن نەبوە لە هەمو مکتبەکانی مملکتە شرقیەکانیەدا تطبیق بکریت . چونکە جیگەی حریت و سەربستیەتیکی وا نك مکتب بلکو او ماجاتە لە بە ناوی «حدیقةالاطفال»وە بە تایبەتی بو منداله وردەکان تأسیس دەکریت ، ذاتا لە حقیقت دا مکتب «تولستوی»ش لە «حدیقة الاطفال» یکی‌تر بەولاوە هیچی‌تر نەبو . معلومی هەموکسیکە بو تحدید حریت و حرکات منالیك کە لامعنای انظمۀ اجتماعیە تی ناکات نظام وضع ناکریت . لە بر اوە منالیك کە لە دورەی طفولیت نجاتی دەبی لە مکاتب رسمیەیشدا تا صنفەکانی اولی تواواکات لازمە نوعی سربستیەتی تأمین بکریت . امە سببیکی مهمە بو انکشاف قابلیات متنوعەی او منداله ، فقط مع‌الاسف لە بر اوەی کە بالخاصە لە مملکت ایمەدا منال لە سنیکی معین و نظامی‌دا داخل بە مدرسە نابن و عمرو قابلیتی قوتابیانی صنفیك متفاوت و نامنتظمە ، لە تطبیق ام سربستیەداکلی جار لە فائدە زیاتر ضرر مشاهدە اکریت مع‌مافیە غیراز ام‌ملاحظەیە لازمە بزانین کە سربستیت هیچ‌وقتیك نابی‌لە ادارەیکی محدود بچیتە دەرەوە و لە درجۀ مطلق‌دا بیت .

چونکە مادام هەر مملکت وملتیك حرکات وافعالی بە قوانینی ( مدونە ) تحدید و تقیید کراوە و تابد اکثریت او منالانەی کە رجال مستقبل تشکیل اکەن هەر وکو لازمە حر و سەربەست پی بکەن ابی لە عین درجیشدا محبتی قوانین و نظامیان پێ انجام بدەین ام مقصدە مهمە یش وکو وظیفە تدریس و تربیە لازمە مکتب درعهدە بکات (ناشر مقالە) وا ئەزانێ کە لە موضوع لااقل ئەلف سالە بەر اوەی کە من لەگل اثالی اراکای تاس و لەم خصوصەوە اکثراوقات مناقشە و مجادلەم سبقتی کردوە لەفکریان خبردارم و زور چاك بوم صاغ بوەتەوە کە اوان ویا اکثریتیك لەوان تنها لەم نقطەیەدا لە قدما جیا دەبنەوە والا قدیم و یا حدیث مدیریکی منور تصور ناکرێت کە بەرامبەر بە نظریات علمیە و تربیەوییە ضدیکی تصلبکا وانە وەر بگریت ، چونکە منوریکی حقیقی دقیقە بە دقیقە لەگل زمان دا ئەروات و بە نظر تطورات عصریەوە تطور دەکات ، فقط مع الاسف غایەی ناشری مقالە ئەمە نییە و بە امثل علیەدویا قناعتم بو حاصل بوە کە اکثریتی ئەم متجددە بالاپروازانە بە هیچ نوعە اصول و نظریاتیکی تازەوە رویان نەکردوتە مکتبەکان ، بەلکو لە روی بی تجربەیی ، منالی و تهورەوە کە لیکیان لەم نقطەیەدا عفوی اوانەم طلبە کە حدا بە مفکورەیەکی عصری مجهز و لە دائرەی مطلوبدا وظیفەیان حسن ایفا ئەکەن — شیرازەی مکتبەکانیان تیك داوە و بون بە سببی رودانی انواع و اشکالی مسائلی مؤسفە ، چونکە اول و اخر پنج شش کلمەیان کردوە بە وردی زبان : طلبە لازمە حریت و سەربست بیت ، لێی نەدریت ، طریقەی استقرائیە باشە امتناجیە خرابە ، پستالوزی رای وتورە ... الخ ٠

فقط حریت چون ئەبی ، سەربستیت حدود و درجەیەکی هەیە یا نییە ، هەمو قوتابییەك بلا قید و شرط سەربست بکریت مضرە یا مفیدە ، تأثیری تربیەی عائلەویە و محیطی لە سەرقوتابی وظیفەی مربی اشکال ئەکایان نا ، لە نظریات معلمیك بی شخصیت تأثیری مطلوب حاصل ئەبیت یا نە ؟ لە چە نوعە جیگایەکدا طریقەی استقرائیە ، طریقەی استنتاجیە تعقیب کردن لازمە ، هەمو وقتیك و بلا قید و شرط بە ( پستالوزی ) ویا ( هربرت سپنسر ) اقتدا کردن ممکن ئەبیت یا نابیت ، مضرتی تهور و خودبینی ، فائدەی اعتدال و تدرج چییە ، محبوبیت معلم لە طرف رفقای خویەوە و یا مقبوضیتی تأثیر لە سەر روحیتی قوتابی ئەکا یانە ؟ وامثالی ئەم نقطە مهمانە هەموی مع الاسف لە نظر ئەو نوعانەدا صفرە ...

ماوەتی

---

## هەوالی دەرەوە :

****

هراو هوریای فلسطین

لندن — لەم بینەدا قسمیك لە دروزیکان کوبونەوە و علاوەی عربەکانی فلسطین بون و دستیان کردوە بە هرا و هوریا . حکومت فلسطین و قوەتی نظامی حکومت انکلیز بو اسکینی ام هرایە مقابلەی کردون و غیری ام قوەتانیش حکومت مجبور بوە قوەتی تر بینیتە فلسطینەوە .

---

عودت شیشرین

موسقووا — رفیق شیشرین وزیری خارجیەی روسیا کە لە بر نخوشی دوسالە روسیای ترك کردوە و

جوەوە و اوروپا اعجارە عودتی کردوتەوە . بلام وا
خان اکری ناتوانی بجیتەوە سر وظائفی سیاسیە .

---

دو واپور لەمرمرەدا مصادمەیان کردوە

استانبول – لە روزی ۲۷ کانون اول ۹۲۹ دا
لە اطرافی مرمرە وقعەیکی الیم روی داوە واپوریکی
بچوک بلماریا اموالی تجارت دینی بو استانبول و بشەویك
بە مرمرەدا بە سرعت اروات و واپوریکی حکومت
یونانیش لە دوای اوەوە بە بی اوە بزانی واپوزی تری
لە پیشەوەیە روەو مرمرە اروات . بلام چونکە
واپورەکەی یونان حرکتی زیاد ابی لەری لە واپورەکە
بلمار ادات و غرق اکات و واپورەکەی تریش زور
متضرر ابی . دست بەجی بەو شەوە واپورچیەکانی
یونان خویان اخەنە بحرەکەوە دە کسیان نجات ادەن
اوانی تریان اخنکین و دست بەجی حکومت استانبول
خبر ازان اچیت بە امدادیانەوە و واپورەکەی یونان
اگریتەوە بوغازی استانبول و استجوابی قوماندانە
کەیان اکات . هر چند قوماندانی واپورەکەی بلغار
دەرچکاوە و نجاتی بوە بلام دست بەجی دمانچەیك ائی
بە خویەوە و انتحار اکات .

---

قابینەی تازە مصر وفدیکان

قاهرە – لە بر اوەی لە انتخابات تازەدا حزب وفد
اکثریتیکی فوق‌العادەی پیدا کرد مجبوراً امر درا بە
رئیس حزبەکە مصطفی نحاس پاشا کە لە ریاستی خویدا
قابینە تشکیل بکات و مشار الیهیش لە وفدیکان قابینەی
تشکیل کرد و ناوی وزیرەکانی تقدیم بلاط کرد و
ارادۀ ملوکانە لە سر صادربو . لەم قابینەیەدا مصطفی
نحاس پاشا غیری رئیس‌الوزرایەتی وزارتی داخلیەیشی
درعهدە کردوە .

---

لە ایرانا معادن

طهران – مسیو هوفمان متخصصی مشهوری المان
کە لە وزارۀ اشغال ایرانا ایش اکات بیانی کردوە کە لە
نتیجۀ تحریاتا حکومت ایران موفق‌بو بە دوزینەوەی
معادن خلوز و آسن بە نوعیك کە هر دو وعەکیان
مهمە و خلوزەکە بشی هەمو شمندوفری ایران اکات .
مسیو هوفمان بو ام خصوصە چوتەوە المان .

---

بغداد – حکومت عراق لە گل فخامت معتمد
سامی اسبق کردوە بە مذاکرەلەلای خطوط‌شمندوفری
عراق وە بو اوەی تسلیم بە حکومت بکریتەوە .

---

نظامات وزارۀ داخلیە

بغداد – او نظامە تازەیەی کە حکومت عراق
مجارە ووزارۀ داخلیەی تنظیم کردبو ارادەملوکانەی
لەسر صادر بو وە رسمیش لەغزەتەکانا اعلان کرا .

---

سؤال مبعوث‌هولیر حضرت‌معروف‌بك

جیاووك

بغداد – وقتی‌خوی مبعوث محترم هولیرمعروف
بك جیاووك برامبر بە وزارۀ داخلیە اقتراحیکی کردبو
کە حکومت پی‌ویستە دو لوای تازە احداث بکات
یکیکیان بە ناوی دهوکەرە و اوی تریان بە ناوی باجلا.
ئیستە لەبر اوەی معلوم نەبوە حکومت چ‌قراریکی‌داوە
دیسا وە پرسیاری لە وزارت داخلیە کردوە .

---

المانیا و امریقا

برلین – حکومت المان و ملتەکەی لە مسئلەی
تصمینات حربوە زور لە حکومت امریقا راضین
و لەم خصوصەوە اتفاقنامەکەی کە کردویانە نشریان
کردوە

کیوه قسه اکات ، جاف عائلەی سـلیمانیه ، هموی دو ماله و بطی کرکوك کراوه ، با بچیته سلیمانی داوای حق خوی بکات ، له سەر اوه محمد جافیش هلسـاو جوابی دایەوه : من به ناوی صد و پنجا هزار جافەوه قسـه اکەم :

من کوردم کورد ازیم و به کوردی امرم ئەم مملکته کورده لەبر اوه هەو کوردیك حقی هیه له مملکتی کوردان‌دا طلبی حقوق ملت‌وطنەکەی بکات و حقیقتاً خوی کوردایەتی به اشکرا له دمارەکانیا به شدت‌وه حولانی اکرد . لەو اثنایەدا جعفر پاشا هلسا وروی کرده محمد جاف کوتی به شرف حکومت وخوم تامینت اکەم که به تواوی مقررات عصبةالامم‌تان بوتطبیق اکری و ام لوایەش استفادەی لی اکات و محمد جافیش له جواباً کوتی سا باشه تشکرتان اکەم . لەو اثنایەدا جناب سید احمد افندی خانقا و سید محمدافندی جباری وسائر رؤسـا محترمەکانی کورد علما هلسان تاییدی محمدبك جاف و حقوقی کوردیان داوا کردوه . وبم‌وعه مناقشەکەدوایی هات و کوملەکە بلاو بونەوه .

****

هولیر

روزی شمـەی ٩ ـــ ٨ ـــ ٩٢٠ له کرکوکەوه تشریفیان بردە هولیر وله و پش‌له ساعت‌دەی ئنکلیز بدا لەسرا له مقام متصرفی‌دا اشراف و رؤسای عشـائرەکان کو بونەوه ، له دوای کو بونەوه رئیس‌الوزرا او بیاناتەی که له کرکوکیش خویندبویەوه بیان و خویندیەوه و فخامتی مندوب ساميش هلسا و نطقیکی خویندەوه و بیاناتەکەی رئیس الوزرای تایید کردەوه ، له دوای امانه جناب احمد افندی اعیان و وطنپروری غیوری کورد هلسا فرموی : له پیش امەدا قسه بکەین ایجاب اکات رؤسای عشـائر فکری خویان بیان بکەن چونکه اوانیش مضبطەیان تقدیم کردوه ، مندوب سامی فرموی باشه ، لەسەر اوه رؤسـاکان کوتیان به عمومی جناب خضر بکی احمد پاشای له رؤسای دره‌بیمان کردوه به وکیل و موی‌الیه هلسا کوتی ! ایمه هەو عشـائر متفقاً تاییدی مطالبی اهالی سلیمانی اکەین ، ایمه لەکل سلیمانی‌دا ازین و امرین ! یکیکین ، استرحام اکین ام سـه ـــ ٣ لوایه ، کرکوك سلیمانی ، هولیر با له یك جیا نکرینەوه هرچی به سلیمانی بدری ابی ایمەیش استفادەی لی بکەین .

له دوای امه جنابی اعیان احمد بك هلسا فرموی ایمه کوردین وحقوقی خومان اوی بنده چند ساله له خدمتی حکومتام وتی کیشتوم که کورد به عمومی لەسەر حقوقی خوی اصرار اکات وام حقه بقراری عصبةالامم دامزراوه پی‌وبسته بماندری (ولەسر اعتراض‌وتاثیری جعفر پاشا) خطاباً به جعفر پاشای وت پاشا تو و عربەکان دو پنجه‌ت دانا ایمەیش حقمانه له ری ام حقه ملیەمانا روحی خومان فدا کین کس حق عتابی نیه وقراری عصبةالامم اوەیه : لغتی کوردی رسمی ابی ایمه بو ام حقه مصرین وله پاش ام کفتکویانه اسماعیل بك رواندزی هلسا کوتی پاشا ایمه لەم قسه پروپوچانه تیر بوین بحثی مستقبل اکن مستقبل : هم صبحینی هم ده سالی‌تر وهتا آخری هر مستقبله ایمه حالا تطبیقی قراری عصبةالامم‌مان اوی . وفوراً ابی لوای دهوك تشکیل بکری ملت به ارزویکی قطعی ام طلبه اکات .

له پاشا معروف بك جیاووك هلسا کوتی وا ازانم جنابی فخامتمآب وکیلی معتمد سامی مساعده افرموی دوقسه بکم بنده عرضیك و سوآلیکم هیه : او بیانەی که جعفر پاشا خویندیەوه دو شتی تی‌کیشتم (١) طلبی وحدتی عراق ـــ کورد و عرب . (٢) عدم امکانی تأییدی حقوقی کوردان به مادەیکی خاص له معاهده .

له پیش جواب‌دانا جنابی مندوب سامی فرموی که بعضی غافل وا ظن اکن که ایمه تشویقی بعضی کەس اکەین و اگر کسیکی وا بی و بیته دار الاعتماد و له دوایی‌دا له خویەوه قسەیکی وای کردبی ردی اکینەوه ایمه له کل حکومتی عراق یکین . بنده لەسر ام فرمودەی الیم ابی فخامت پناه و جعفر پاشا چاك بزانن که بنده کوردم و هەو کوردیکیش وکو من تابی هیچ تأثیری نبه ملتی کورد به ساتی وجدانی قسه و ادعای حقوقی اکات .

بەلی زور دفعه بعضی کس و بعضی له کوردەکان و که ایستا له موافقی کوردەدان تأدب اکم لم مجلسه‌دا ناویان بنم رو به رو به منیان اکوت ایوه به پنجەی اجنبی ام طلبه اکەن [ مندوبی سامی بزـی اجنبی کی ؟ ] اجنبی یعنی ایوه ـــ انکلیز . و دلیل اوەیه که پار سـال ام جمال بابانه که دانیشتوه و کـه وزیره به مضبطه ادعای حقوقی ملی کردبو دیسان بم تحره اتهامیان اکرد .

له اهالیکه وستابون کشافەی مکتب قوتابی مکتبەکان بالعموم اهالی شار هەمو طبقەیەکی حاضر بوبو دوکان وبازار چول کرا وقسمی ژنانیش لەدباخانەوه هتا قاپی حکومت کومل کومل وستابون فخامتی مندوب سامی و هیئتەکه له سعات دوی عربیدا مواصلتی چمچمال اکەن ولەویش هەمو اهالی وروسای عشرتی هەمەوند له سەر جاده وستابون وکه تشریفیان گەیشتە اوی هەموی به دنگی برز هاواریان کرد وداوای حقوقی کوردایەتیان کردبو له دوای دو ٣ دقیقه استراحت له چمچمالەوه حرکتیان کرد وذاتا سعادت متصرف و مفتش اداری ومفتش پولیس ، مدیر پولیس باوتومبیل لەپیایەوه پرویریان روشتبون ولەسعات چوار و نیوی کوردیدا گەیشتنە سەر جادهٔ دباخانه له دوای ارەی له لای عسکرەکانەوه به سلام بخیرهاتنیان کرا هاتە بردمی او عشامانە زورەوه که بی حد و حساب راوستابون که له اوتوموبیلەکه دابزین بەکرمی دست کرا بەچپله لیدان وهم بژی کورد وکوردستان وبه کرمی هاوار کرا که بەقطعی تشکیل حکومتیکی کوردیمان اوی ئەلەو وقتەدا قوتابیکی مکتب به جلی کشافەوه هاتە بردمیان وخطاب به فخامتی مندوب سامی نطقیکی نکارشی خویندەوه که له خوارەوه درج کرا و نطقەکه بەچپله بدن وبه شعری بژی حکومت بریطانیا و کوردستان و هەم بژی فخامتی مندوب سامی مقابله کرا ، لەدوای ئەمه به اوتوموبیل هاتنەناو شارەوه ،

لەریکا لەهەمو نقطەیەکا ژنەکان له کولان و سەربانا نەرەهاواریان اکرد : هەم بژی کوردستان و حکومتی کوردیمان اوی !

فخامتی مندوب سامی تشریفی بردە مالی مفتش اداری ، رئیس الوزرا و وزیرداخلیه له مالی متصرف و وزیری عدلیه له مالی بابان عزمی بگ میوان بون و او قله بالغه هتاکو ایواری له بردرکی سەرا و جادەکانا مایەوه و متمادی هاواریان اکرد : حقوقی مقدسەی خومان اوی ! او روژه وا درای کرد ، هەرچەند ترتیبات کرا ، بو مذاکره تذکره نوسرایه شوین اشراف و روسای عشائرەکانا ، صبحینی ساعت دوی کوردی هەموولایك له مقامی متصرفیدا کو بونەوه ، دیسانەوه بازار داخرا و اهالی روی کرده بردمی سرای حکومتی ، طلبەی مکتب و هەمو اهالی له حالیکی منتظمدا وستابون که فخامتی مندوب سامی و هیئتەکه تشریفیان هینایه سەرا له بردمی تلغرافخانەدا بەکرمی چونە براوتوموبیلەکەی مندوبی سامی و هەرکسیان دسته گولیکی به دستەوه بو خستیه اوتوموبیلەکەیەوه و بەکرمیك هاواریان کرد حقوقی ملیەمان داوا اکین و ابی حکومتی فخیمەی بریطانیا بومان تأمین کات .

حاصلی بەم نوعه هیئتەکه داخلی سرا بون و چونە مقام متصرفی ولەویدا هەمولایك کوبونەوه اول جار لەطرف رئیس الوزراوه او بیانەی که له پیشا له جریدەکانا نشر کرابو خوینرایەوه له دوای اوه فخامتی مندوب سامیش هلسا او بیانەی کەله کرکوك وهولیردا خویندبوی خویندیەوه .

له خزای امانەدا جناب حمه اغای عبدالرحمان اغا هلسا وفرموی : جماعتی حاضره که تمثیلی هەمو اشراف ، سادات ، علما و عشائری لوای سلیمانی و قسمیك له لوای کرکوك اکات به عمومی جناب رمزی افندی یان توکیل کردوه که جوابی بیاناتی فخامتی مندوب سامی و رئیس الوزراء بداتەوه و طلبی حقوقی ملیەمان بکات .

له دوای امه رمزی افندی هلسا و فرموی

فخامتمآب ؛

به ناوی عموم روسای عشائر و اشرافی کوردەوه عرض به خیرهاتنتان اکەم . ملتی کورد تشریف هیناتان بو حیاتی حریت و مستقبلەی خویان به فالیکی خیر عد اکات ، بیاناتی فخامتی رئیس الوزرا و مندوبی سامی کلیاً خالی مقرراتی عصبة الامم و اعترافاتی حکومتی فخیمەی بریطانیا و عراقه له پیش هەمو شتیکا ئەبی اعطای حقوقی مقدسه و استقلالی کوردان بی به سببی اتحادی عنصری کورد و عرب .

لای فخامتتان معلومه که کوردەکانی کوردستانی جنوبی له اثنای حربی عمومیەوه تا امرو بو تأمینی حریت و استقلالی خویان له سعی دوا نەکەوتون و بو ام غایه مقدسه دائما التجایان به معاونتی مشفقەی حکومتی فخیمەی انکلیز کردوه . مع الاسف تا امرو تائی آمالیان نەبوبون کەرچی لەم خصوصەوه رسماً کەلی مواعد پیشان درا و به عصبة الامیش ام مواعدانه تأیید کرا لکن تا امرو هیچیانمان بو تطبیق نەکرا .

معلومی فخامتتانه اول معاهدەی حکومتی عراق و انکلیز له تأریخی ١٠ تشرین اول ٩٢٢ دا تصدیق

کراوه . و له پاش ٧٤ روز یعنی له تأریخی ٢٤ کانون اول ٩٢٢ بو تشکیلی حکومتیکی کوردیه له لای حکومتی فخیمەی بریطانیا و عراقدا ام بیانه نشر و اعلان کرابو .

مادامکه اصل عصبة الامم انتدابی عراق داوه به انکلیز و له قراری ام انتدابەدا کوتویتی هیچ وختیک عراق صاحبی استقلالیتی ادربیق و لەعینی وقتدا لازمه حکومتیکیش و کوردەکان تشکیل بکری .

حقوقا وا لازم بو که له پیش تنظیمی معاهدەی تازەی انکلیز و عراقدا — که تأییدی قراری عصبة الامم و استقلالی حکومتی عراق اکات — حکومتیکیش بو کوردەکان تشکیل بکرایه و مسئلەی حکومتی کوردیەیش به صراحت بخرایه متنی ام معاهده تازەیەوه .

لەمەشدا ضربه له حکومتی کوردەکان درا .

لای فخامتتان معلومه که حکومتی عراق کوردەکانی به قوتی طوب و تفنك استیلا نەکردوه له عقبی متارکه دا کوردەکان بەو شرطه خویان خستە حلقەی رابطەی انکلیز که حکومتیکی کوردیەی مستقلەمان بو تشکیل بکری و له سر امه اتفاق واقع بوبو .

کەوابو لازمه چون عربەکان له قراری انتدابی عصبة الامم مستفید کراون کوردەکانیش مستفید بکرین که طلبی هموکوردەکان «تشکیلی حکومتیکی کوردیەیه له زیر انتدابی حکومتی فخیمەدا» ما ؟

رئیس الوزرا — من لەو بیانانه زیاتر که له پیشا بوم خویندەوه صلاحیتم نیه بەصورتی رسمی گفتوگو بکەم ، وا اخامتی مندوب قسەتان لەگلا اکات ، لەسر امه تخرمت مندوب سامی هلسا و ئەم بیانەی دا :

له خطبەی رمزی افندیدا دو نقطەی مهم هیه .

(١) بیانی ١٩٢٢ (٢) مقررات عصبة الامم .

بیانی ٩٢٢ مشترك رئیس الوزرا وتی رتبی خوی له طرف حکومتی بریطانیاوه جواب دراوەتەوه . لەم انەدا حظ اکەم لەسەر ام موضوعه مناقشه بکەم .

دوهەم ؛ مقررات عصبة الامم ، به لای منەوه توصیات عصبة الامم تطبیق کراوه و من متأسفم اگر ام وعداته شکینرابیت . فقط تقدیر تنفیذ وعدم تنفیذ ام مقرراته به دست عصبةالامم خویەتی . حکومت بریتانیا وعراق هر دولا سعی اکەین بو تنفیذ مقررات عصبةالامم . عصبةالامم اگر بیبنی مقرراتەکەی تطبیق نکراوه مداخله اکات .

وکو تیگیوم بعضی کس مراجعتیان کردوه به عصبةالامم . وجوابیان ورگرتوەتەوه که به توسط حکومت منتدبەوه ابی مراجعات بکریت ، و ایستاکه عین مراجعات به من کراوه . من لەم خصوصەوه مفصلا لەگل حکومت عراقا مذاکره اکەم لەم قسانەی وا تەکات که مقصد من مانعه هینانه پیشەوه بو مراجعات خلق . هموکسی سربسته لەمراجعت کردن فقط لازمه مطالب لصریح وبه تفصیل بیان بکریت . تشکیل حکومتیك لیرەدا مشکله . و نازانم آیا قابله کوردستان ام حکومته بتوانی رابگریت .

اوه ی نازانم رمزی افندی تمثیلی سائر کوردستان اکات یا عین سلیمانی .

رمزی افندی — مضبطەی هولیر معلومتانه ، ذاتا لەوی به حوشنانیەوه که رأی مان لەگل آی سلیمانی به قسمیك له عشائری کرکوك را لەم مجلسەدا حاضرن ، ارایشمان لەگل ایمەن و مضبطەی عموم عشائری کرکوك تقدیم اکەم ، و ممثلی هولیریش لیرەدا حاضره .

مندوب سامی — بەینه عراق و کرکوك ، لەوپش ممثلی کوردان که ... بوەوه ، عین مناقشه کرا ، فقط کس اظهاری جیابونەوەی نکرد . تنها سلیمانی طلب اترق اکا

رمزی افندی جوابەکەی سردوەی تکرار کردەوه و وتی ام دو لوایه له ژیر تأثیر و تضییقا بون له بر اوه حسیاتی حقیقەی خویان اظهار نکردوه امر بفرمون بینه ایره اوسا معلومتان ابی که ایمه تأیید اکەینەوه و کوردستان همون له عینی فکرایه و یك هدف تعقیب اکات که استقلالی کوردستانه .

مندوب سامی — کەوابو لازمه همو لایك مطالبی خویان به صراحت و به تفصیل بو عصبةالامم بیان بکەن . کوردەکان چه نوعه حکومتیکیان اوی . ملکی یا جمهوری ؟ پارلمانت ، رئیس الوزرا و مجلس وزرایان ابی یا نا ؟ آیا فکریان برامبر بەملك فیصل گوریوه یا نا ؟ و آیا ایانەوی همو نوعه مصالحیکی حکومتی وکو گمرك و مکوس ، اشغال عامه ، پولیس ، صحیه و عسکریەیان بیت ؟ و آیا مناسبات و علائق ام

اکان که الی له کل تورکا اتان بلیشینەوه و عرب هیچی له تورك کمتر نیه .

علاوەی امیش له روزی تشکلی حکومتی عراقەوه هتا کو ایستا بو خوتان متعدد معلمتان له اوروپا و انکلترە و سوریه و جرکایای ترەوه جلب کردوه و هەو سالیك کوملێکی زور طلبەی عرب که به استعداد و زکا له کوردەکان دوترن داخلی بعثەی علمیان اکن کچی طلبه کوردەکان که له سر مصرفی خویان اچن بو بغداد و غربت اکیشن بو اوری داخلی بعثه بکرین به خورایی نمرەیان اشکینن و دوایان اخن امسال پنجا طلبەی کورد له دانا له پێش عربەکانەوه بون مر له بر ام سببه دوایان خستن .

رئیس الوزرا — بوچ ابوه هەو باران که غزتەکانی بغداد بیانی و ایواری چند جنیو به حکومتی عراق ادەن و جوێنان تنقید اکەن کی الی به تشویقی حکومت غزتەکان له علیهی کوردن ، بوچی معلوم نیه غزته جون و به چه واسطەیکەوه شت اوسی ؟ طلبه اوراق امتحانیان موجوده و کس ناتوانی خلافی اوه حرکت بکات و لام وایه طلبەیك بی استحقاق ترفیعی پی بکری نه بو خوی و نه بو مجتمعی موجب استفاده نابی .

عبد افندی — بلی غزتەکانی بغداد که له علیهی حکومت مقالەیکیان نوسی کورج دای اخن بلام که تهدیدی کوردەکان بکات و له ضدی ایه بنوسن تشویقیان اکن و پارەیان ادەنی .

حمه آغا — همو ازانین فخامتی رئیس الوزرا شخصیکی وطنپروره و بو غایەی وطنیه زور سعی کردوه بناءً علیه ابی تقدیری ایمەش بکات و حقمان بدانی که بو حقێکی مشروعی وطنی و ملی خومان تی اکوشین .

رئیس الوزرا — بلی هەو نوعه حسیاتێکی وطنیه به احترامەوه قبول اکەم فقط لەم مسالانەدا ایمه لازمه منطق و عملی تی فکرین عجبا کوردستان وکو الین له خانقینەوه هتا زاخو جیا ببیتەوه به بی عراق ازی ، وارداتی کفایت اکات ، برامبر به دراوسیکانی حدودی بی محافظه اکری و خاصةً له نقطەی تجارتەوه لەعراق زیاتر بندرێکی تری هیه ؟ . بو اموری نافعەی کوردستان هتا کو ایستا عراق به لکها روپیەی صرف کردوه له کوردستانا .

رمزی افندی — یك دفعه عرضمان کردن کورد و عرب قابل نین پیکەوه بژین ، ایمه ارین و اوان سامین ، ایمه شاخین ، اوان دشتکین ، حتی خاکی کوردستان بربی بو عربستان و هی عربستان بهێنن بو کوردستان هردوکیان قوەی انباتیه یان ون اکەن .

رئیس الوزرا — ای توتونەکەتان بو کوی ابن ؟

رمزی افندی — ای بەین بو اوروپا ، غیری ایش مجبورن توتونی ایمه بکرن چونکه لەمه هرزانتر ناکەوی و لەایمەش زیاتر لەمجارتا لەم توتونه استفاده اکەن .

رئیس الوزرا — نا نای بەن بو اوروپا همو له عراقا صرف اکریت ، کوردەکان الحمد لله تجاری رو زوریان نیایه وزور چاك تقدیری اکەن که کوردستان بی عراق نازی .

رمزی افندی — له بدایت حرب عمومی دا که ریکا و بندرەکانی عراق کیرابو وکه بغدادیش استیلا کرا ایمه لەکل شمال و شرق و غرب دا منتظما تجارتمان اکرد و ثروتی عمومیه و وضعیتی اقتصادیەمان له امرو کلی باشتر بو ، جعفر پاشا افرموی که به لك پارەمان بو اموری نافعەی کوردستان صرف کردوه ، او اموره نافعەی اوان الین قلا و استحکاماته بو محافظەی جیشه کەی خوتان له باقی امه مکتبتان بو بنا بکردبایه ، اگر حکومتی کوردیه تشکل بکات هیچ لزوممان پی نابی و استغنای لی اکین .

رئیس الوزرا — بەتاثر و هیجانەوه ، براکانم بزانن که لەم دمارەدا خونی کوردیشم تیایه ولاکن من عربم بو منفعتی ایوه قسه اکەم به حسیات حرکت مکەن مەبن به آلت بەدست خلقەوه بزەینان بەملتەکەدا بیت توشی فلاکت مکەن او اله سرەوه کوردەکان پارچه پارچه اکەن سربان ابرن . لەدنیاوه معلومه که کورد قومێکی دینداره له بیرتان نچی که دینتان عربیه ، قوران عربیه ، محمد عربه و فیصل کوری محمده براکانم رجاتان لی اکەم فاجعەی کربلا تکرار مکەنەوه .

شیخ قادر — جعفر پاشا به بیان کردنی فاجعەی کربلا تهدیدمان اکات ابی بزانی اگر انکلیز له پنایەی عرب نانوانی بینه خاکمانەوه .

جعفر پاشا ـــ رجا اکم سوءتفاهم حاصل نەبی مقصدم تهدید نیه .

(رمزی افندی زور دفعه داوای قسەی کرد و میدانی نەدرا نهایت بە حدتەوه هاته پیشەوه گوتی ) پاشا دین ، ایمان مفکورهٔ ملی حکومتیکی ملی کوردی اوی [ جماعت وانیه ؟ ] همو بە کرەتیك بلی وایه .

رمزی افندی دوامی کرد پاشا ! ام قصانەت ناجیته جوالی کوردەوه امه هموی اغفالاته و بیخەره جوالەکەی خوتەوه و درکای ببسترەوه .

جعفرپاشا ـــ قصەکەت ورگرەوه توپیاویکی تحصیل دیدەی له اجتماعیکی وادا نابی قسەی وا ناشیرین بکری .

رمزی افندی ـــ تو قسەم نادەیتی له سوآلەکانم کریز اکەی : بلی تسلیم بوم .

میرزا توفیق ـــ ایستاکه دیانت موضوعی بحث نیه مسئلە ملیەته و تشکیلی حکومتیکی کوردیه اگر بە دین بی ابی ایرانیەش واز له ملیتی خوی بینی و داخلی حکومتی عراق بیت اسف اکم موضوع مەکوره .

جعفر پاشا ـــ قیاس مع الفارق کردن زور بی منطقیه ایرانیەکان دو هزار سال زیاتره نە تأسیسی کردوه .

میرزاتوفیق ـــ اگر له بر دین لازمه ایمه تابعی ایوه بین له همو عالم معلومه کە کورد زور دین داره بناء علیه لازمه عرب له ژیر ادارهٔ ایمەدابی .

رمزی افندی ـ یك قسەم هیه ؛ خلافتی عباسیه له اواخیری سلطنتی دا دستی کرد بە استخدام کردنی مأمورینی تورك ، فورس و کورد و امه بوه یکانه سببی اضمحلالیان جز اکم حکومتی عراق ام تجربەیه تکرار نکاتەوه و مأمورینی کورد لەناو خویانا استخدام نکات چونکه ابی بە سببی اختلاطی و کذا استخدامی مأموری عربیش له کوردستانا ابی بە سببی محو بونەوەی کوردەکان .

رئیس الوزرا ـ تشکری توصیه و نصیحتەکەت اکم کە لەپیس وقوعیدا اخبارتان کردین .

لەپاش اوه رئیس الوزرا کە بنی مذاکره کردن لم موضوعەوه سوئیك نابخشی وملت یك آواز بو مطالبات خوی اصرار ویکتری تاییه اکاتەوه لزوم نەبینرا بە تمدیدی مذاکره واجتماعەکە بطال بوه .

له ناوەراستی اجتماعدا سالار مصطفی بك جعفر سلطان هلسا وبە ناوی سادات ، علما ، مشائخ وبە ناوی او عشائری حدود کە داخلی عراقن تاییدی مطالبی کوردانی کرد بو تشکیلی حکومتیکی کوردیه ولەعینی موضوعەوه مضبطەیکی امضا کراوی تقدیمی مندوب کرد .

لە آخری اجتماعەکەیشەوه له طرف فتاح آغای حمه رضای رئیسی همەوندەوه کە له لوای کرکوك ساکنن له عینی مآل مضبطەیکی تر تقدیمی مندوب سامی کرا . و عشیرەتی جاف کە ایستا تابعی کرکوکن لەم اجتماعەدا له طرف جناب کریم بك فتاح بگەوه تمثیل کرابون .

---

دەرك

٩ ـــ ٨ ـــ ٩٣٠

صورتی بە پوسته بو عصبة الامم

» بو دار الاعیا. له بغداد

» رئیس الوزرای عرب

» پارلەمنی انگلیز

» لوای سلیمانی

له رکیلانی کرونی اقضیەی شمالیەوه

بو همو کوردان

خبردار بن ، چاوی خوتان بکەنەوه سیری اطرافی خوتان بکەن وا انگلیز لەگل عراق معاهدەیکی کردوه لەم معاهدەیەدا بحث له حقوقی کوردان نکراوه ، لەپاش دو سالی تر انتدابی انگلیز له عراقا نامینی ، حکومتی عراق سربست و داخلی عصبة الامم ابی اوسا کورد لەژیر دستی عربا ذلیل ابی ، له براوه عربه اگر ایمەش وکو اهل سلیمان داوای حقوقی خومان نەکین واو برا انەمان بە پیاو ، ژن و منالەوه جهدا کەن و بەجاریك هاواریان برونە بر عصبة الامم و دار الاعیا . و داوای حقوقی کوردانن . اگر ایمەش احدین ، کلا نکایین وکو اوان داوای حقوق نکەین ، حالمان خراب ابی و حقوقمان اروی .

ایمە کە ناومان لەژیرەوە نوسراوه و عشائری منطقەی کل ، ربازی ، نومەیکی و همو اقضیەی شمالی تو کیلان کەدوین کە بەناوی کوردی ژیردەوام یاننامەیه عرض انظاری عالم بکەین و داوای حقوقی کورد بکەین ، اگری ایمه فکری ملیانیەی مخالفیك له بیانیه و موافق قراری عصبة الامم وکو لوای سلیمانی طلبی تشکیل حکومتیکی مستقلەی کوردیه اکین ،

شیخ رقیب سورچی  شیخ غیاث الدین  شیخ نوری ریفکانی

ادیب افندی رئیس بلدیه عمادیه  حمه اغای برانی

شیخ شهاب زیباری  ترخان حاجی رشید بك برواری

---

ـــ ﴿ انتظاری لاحقەی ام نسخەیه بکەن ﴾ ـــ

له دوای تواو بونی مناقشه و ختامی مجلسه‌که وکیلانی ملت به یکەوه هاتنه دره‌وه و به کره‌تیك له لایەن همو طبقه‌یکی اهالیه‌وه که له بر دمی سرادا وستا بون به چپله ریزیان تقدیر کران و به عمومی هاواریان کرد هر بژی کوردستان و وکیلانی کورد . و اهالیکه کومه‌ل کومه‌ل پەلاماری وکیله‌کان و ممثلی هەولیر معروف بك جاوو کیانیان دا و به سر دسته‌وه هر یکه هتا مالی خویان هلیان گرتن و له همو کولان و سربانیکا له لایەنی آفره‌ت و ام ملته قله بالغه زوره‌وه چپله‌یان بو لی ادرا .

له دوای امه فخامتی مندوب سامی و رئیس الوزرا نزیکی دو سعاتی تر له سرادا مانه‌وه و مندوب سامی به خصوصی دعوتی جناب حمه آغای عبدالرحمن آغا و حفیدزاده شیخ قادر افندی و مصطفی بك جعفر سلطان و حاجی عباس اغای سلیم اغا و وکیلی عباس اغای محمود اغا احمدی حمه اغای فرمو و له اوطه‌ی مفتش اداری‌دا نزیکی سعاتیك به تنها لەم خصوصه‌وه مذاکره‌ی له گلا کردن . بلام قله‌بالغه‌که هر وستابون هر چند حکومت و پولیس به همو قوتیه‌وه بو بلاو کردنه‌وه‌یان سعی کرد فائده‌یکی نه‌بو هتا وقتیك که مندوب سامی هاته دره‌وه دیسانه‌وه چونه بر دمی و به کره‌تیك طلبی حکومتیکی مستقله‌ی کوردیان لی کرده‌وه و او وقته ایتر بره بره قله‌بالغه‌که بلاو بوه‌وه فقط دیسانه‌وه هاکو شه‌و له بر دمی سرادا قسمیکی هر راوستابو . له عینی روز دا دوای نان خواردنی نیوه‌رو رئیس الوزرا رویشت بو دینی عسکر که له کوردستان له ناحیه‌ی آغجلردا واقعه بو اوه‌ی زیارتی وطنه‌که‌ی خوی بکات و وزیری داخلیه و عدلیه‌یش رویشتن بو کرکوك و فخامتی مندوب سامی او شه‌وه له سلیمانی‌دا مایه‌وه .

بو صبحینی له سعات نوی انکلیزیدا که رایه‌وه بو کرکوك ، هر چند اهالی ویستی به عمومی روانه‌ی بفرمون فقط قبولی نکرد ، له پیش حرکتیا بعضی طلبه‌ی مکتب و اهالی به دزیه‌وه چو بونه سر ریه‌که‌ی و له دباغخانه له بردمی او توموبیله‌که‌ی دا خویان دابو به ارضا ، ریان لی گرتبو و رایان وستانبو و به شرفی حکومتی بریطانیا تأمیناتیان لی وەرگرتبو که بو تشکیلی حکومتیکی کوردیه سعی بکات و اوسا ریگاکه‌یان بو چول و خوا حافظیان لی کردبو .

****

ترجمه‌ی او نطقه انکلیزیه که له لایەنی علی ناجی افندی طلبه‌ی مکتبه‌وه خطاب به فخامتی مندوب سامی خوینراوه‌ته‌وه ؛

فخامتماب !

قوم کورد به دلیکی پر سروره و به قلبیکی بی کدر و به عزمیکی جسور مغرور به ذات فخامتتانه‌وه عرض بخیر هاتنتان اکات بو خاکی کوردستان ،

ایمه ام روزه مقدسه به افتخاره‌وه ناو ابین و بو خومان به سعادتی ازانین ! معلومه که ذات فخامتتان بو ترقی و سعادتی قومیکی مقدوری دوا کوتو هیچ وقتیك اهمال و قصوریتان نفرموه و دیسان معلوم عالمه خدمتی عالیتان بو نشر و اوزنر کردن بو مدنیت خدمانه بوه . ایمه‌یش که کوردین منتظری او بهره به قیمتین ره‌ئاماده‌وی به قدومی فخامتتانه‌وه بهره وەرگرین و که حق مشروعمان تصدیق کرا امیدمان هیه به پشتیوانی ایوه‌وه ترقی بکه‌ین ، ایمه‌یش ازانین هتا کو ایستا چنده‌ن اقوامتان پی گه‌یاندوه ، روا بکه‌ن ایمه‌یش له‌و ملتانه بین که‌بتوانین خیرتان بو بده‌ینه‌وه .

امرو او روزه‌یه که کورد چاوی انتظاری به دیده‌نی ایوه کشایه‌وه دلیکی ام ملته مقدوره که وطنه له ژیر سایه‌ی حماسای دولتی فخیمهٔ بریطانیادا انتظاری پی که پشتمان اکات ؟

بژی دولتی فخیمه‌ی بریطانیا

« فخامتی مندوب سامی

« کورد و یارمتدری کوردستان

—(§)—

شعری فائق بی کس افندی که روژی هاتی فخامتی مندوب سامی ورئیس الوزرا پیش قدومیان بو اهالی خویندیه‌وه .

آموزکاری

کورده تاکه‌ی بی‌خبر به نوستنت بی عاریه
واسطه‌ی دواکوتنت امروکه هر بی‌کاریه
سیری ام قومانه که چون بون ایستا بونه چی
حیفه بو تو وا اسیری بوته عبد وجاریه

اتفاق گر نەکەی لەم حالە خوت رزگار نەدەی
پاشە روزت قلبە نخوا عیش نوشت زاریە
مرهم ودرمان دردت اتفاقە اتفاق
دو دلی بیفروبە خزمە ملیکی ساریە
بیوەرویە هەستە ابتر بکی مسی داکە
ظلمتی شەو وا بەسر چو وعدة وشیاریه
وی نەزانی برمدە ریکەی نجات بکره بەر
نشانت زور کسانە ژنی مر غمباریه
قومی کورد فعلی ابیدی مرنحوبی قدنەکەی
وردەواری زەدوە عوناجی الطف باریه

ترجمەی صورتی تلغرافیکە کە بە عربی لەسلیمانیەوە نوسراوە .

١٣ — ٨ — ٩٣٠

بغداد غزتەی العراق
« « العالم العربی
« « الجهاد
« « تایمس بغداد

استنادا اعترافی حکومتی بریطانیا و عراق لەسال ٩٢٢ و سنەیڤی قە ٪ اخیرەی مقرراتی عصبة الامم بە مناقی وری ارامی عراق بری معاهدەی تازە ؛ عشائر واشراف بە متحدی و بە یک زبان بو تاسیس حکومتیکی مستقلەی کوردی اصراریان کردوە .

حە اغای عبدالرحمان اغا

ترجمەی صورتی تلغرافیکە کە بە عربی لە سلیمانیەوە نوسراوە

١٣ ـ ٨ ٩٣٠

بغداد مدیری مطبوعات
« غزتەی العراق
« « العالم العربی
« « الجهاد
« « بغداد تایمس
« و بو بعضی ذوات لە وردان

بە عکس او نشریاتەی کە کراوە کوردەکان لوای کرکوك و هولیر لە رغمی تضییقات مطالبی سلیمانیان تأیید کردوە بە اعلانی اوەی کە حیات و مماتیان لەگەل سلیمانیە و مصراً و بە تواوی و بە بی‌تغییر تطبیق مقرراتی عصبةالامیان ویستوە و هر قراری کە غالفی امەبی ردیان کردوتەوە .

لە سلیمانیەوە : فرید جمال عارف

صورتی تلغرافیکە کە لە اشراف سلیمانیەوە بو کورەکانی هولیر و کویە و رواندز و شقلاوەو کرکوك نوسراوە :

١٣—٨—٩٣٠

حمیتتان مقدرە ، استنادا بە اتفاق تام ملت حریتی خوی بە دنگیکی بلند ویست و مصرا ادعای تشکیل حکومتیکی کوردی کرد بو فداکاری مهیایە نیات و تکذیبی جریدەکان لازمە

عموم اشراف سلیمانی

اربیل : رواندز ٣٠/٨/١٤

سلیمانی : توفیق قزاز و هاو ولاتی

بەرز بون و بە دلخواز گەیشتنتان آرزوە بو همو فداکاریك هاوریین .

| رئیس بلدیه | زار کرمانجی | رئیس بالك |
|---|---|---|
| محمد علی | سید حسین | شیخ محمد |

لە شقلاوەوە ٣٠/٤/١٤

سلیمانی : عزمی بابان و حفید زادە و رفقای محترمەکان

عزمو ثباتمان هیە بو غایەی مشروعەمان دائما تقدیری حقی فداکارانەتان اکەم .

رئیس خوشناو
عبدالقادر

اربیل : رواندز ١٤ ـ ٨ ـ ٣٠

لە جوشش و غیرت کشی تازەمان بە همو هیزیکەوە بو فداکاری راوستاوین .

طاهر احمد آغا نعمت عبدالله فتاح رئیس مرکی
قادر بك صادق

بغداد فخامة رئیس الوزراء
« « مندوب السامی

النشریات مخالفة لمشاهداتکم و مسموعاتکم اذ طلب اهالی اربیل الانضمام الی السلیمانیة بدون تفریق مع الاصرار علی تطبیق مقررات عصبة الامم حرفیا کما ان اکراد کرکوك بینوا لزوم تنفیذ القررات المذکورة وفخامتکم تعهدتم بشرفکم و شرف الحکومة بتطبیقها عاجلاً لهذا یرغب تکذیب النشریات و منع الجرائد عن التجاوز و یطلب تبدیل الموظفین غیر الاکراد حالاً اذا کان یرغب فخامتکم اطمئنان الاهلین والسکینة لان التضییقات الجاریة لحمل الناس الی تنظیم برقیات و مضابط خلاف ارادتهم و شعورهم زادت فی الطین بلة و استوجبت منها الاستیاء و الاسف .

| حفیدزادە عبدالقادر | حەاغا عبدالرحمان اغا | عزمی بابان |
|---|---|---|
| عبدالرحمان احمد پاشا | عزت عثمان پاشا | |
| شیخ محمد افندی کلالی | مجید افندی حاجی رسول اغا | |

فائق بابان

تصحیح

لە صحیفەی دوەمی غزتەکە لە بیاناتی جناب احمد افندی هولیردا سهوا نوسراوە کە فرمویەتی : لسان رسمی کوردی بی صحیحەکەی ( مومی الیە فرمویەتی : لسان رسمی کوردی بی . مأمورەکان لە عنصری کورد بی . حاصلی ابی همو مقرراتی عصبة الامم بە تواوی بو تطبیق بکری ) .

مەتبەعەی بەلەدیەی سلیمانی

بو هەموو شتێك
مخابەرات بەناوی
ئیدارەخانەوە ئەکری

§

ئیدارەخانە لە بیناری هەلدیەدایە

مدیر : سلیمانی زیوان

# ژیان

کبریار
بەشەش مانگ پێنج
بەسالیك دە روپیە دەدا
بو دەرەوە ئوجرەتی
پوستەی علاوە ئەکری
ئیعلانات
لەدیریکەوە هەتا شەش مەقتوعەن
سەروپیەو لەشەش زیاترجیکەلە
سەروپیەکەبودیرەزیادەکانیش
دیری شەش ئانەئەسێنری

یەکی بە ئانەیەکە — هەمو شتێك ئەنوسی هەفتەی دو جار دەردەچی غەزەتەیەکی کوردیە — یەکی بە ئانەیەکە

٤ ربیع آخر ١٣٤٩ — ٢٨ اغستوس : ١٩٣٠ [ پنجشمه ] — تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٢٦


## بیاناتی فخامتی وکیلی رئیس الوزراء

که لە سلیمانی لە وقتی اجتماعەکەدا

خویندویەتەوە

مشرف ابم بە بیانی ایضاح کردنی او سیاسەتی خوشەویستیەی کە حکومتی عراق خریکە اتباعی بکات بە نظر او وعدانە کە بە کوردەکانی هاو ولاتمان و براکانمان دراوە . او کوردانە کە عضویکی مهمن لە جسمی مملکتی عراقدا .

اکداری او تلغراف و استدعایانە بوم کە لە لاینی هندی اشخاص بە پروتستو لە بر ناو نەبردنی مسئلەی کوردی لە ناو معاهدەکەی اخیرا کراوە تقدیم کرابو .

بە صرف نظر لە بحث کردن لە او اسباب و عواملە کە سببتی دا بە تقدیم کردنی او پروتستویانە من بوتان تصریح اکم کە حکومتی عراقیە بە صورتیکی اکیدە قراری داوە کە بە نظری اعتبار تماشای او وعدانە بکات کە بو تامینی آرزوی براکوردەکانمان دابوی . و اوەش نك تنها هتا سالی ١٩٣٢ مرعی الاجراء ابی بلام هتا مابعدی او تاریخەیش دوام اکات .

هر وکو حکومتی صاحب الجلالة ملك فیصل بە تواوی و بە همو معنایەوە حریصە بو لزومی محافظە و تطبیق کردنی ام پروغرامە کەوا لە سرەوە بیان کراوە لە عینی زمانا بە همو شدتیك بو محوکردنی همو نعرەیك کە ببیتە سببی تفرقە و اخلالی وحدتی وطنی عراق و یاخود ببیتە سببی اخلال کردنی حقوقی دراو . سیتی لە گل هر دو حکومتی دوستمان ایران و تورك بە پیویستی ازانی .

دیسان حکومتی عراق بە تقدیم کردنی همو ابنای وطنی عراق لە ناو دائرەی یکیتی عراقدا بەبی تفریق لە ما بینی کورد و عرب ممنون و مسرور ابی . و هم بم روحەوە لە همو هنگاویکیا چوتە پیشەوە و لەم خصوصەوە استعدادی نیشان داوە .

هروەکو لاتان معلومە ایمە کە اوصا مسئولیتی ادارەمان هاویشتە سرشانی خومان بیاننامەیکمان نشر کردبو لەو بیاننامەیە کوتمان کە ایمە حاضرین بوداناتی لائحەیکی قانونی بو زبانی کوردی لەو جیگایانە کە

اکثریتی اهالیەکەی کوردن و او لائحەیەشیان بالفعل
تەواو کرد و لە اجتماعی اولی پرلمانا بە هەرە حال تقدیمی
مجلسی اکین و هتا امەیش اکری امرمان داوە بو دو ئری
مختصەکە بە موافقی روحی او اصولە کە لە لائحەکە داراوە
حرکت بکا لە خصوص معاملاتی عدلیە و ادارە و معا.
رفەوە ، از غیر امەیش وا حکومت معاونیکی — کە
خبرداربی لە اموری الویەی کوردیە — بو مدیری
ادارەی داخلیەی عامەی تعیین کرد و دائرەی ترجمەیکی
کوردی دامەزران کە ایشی ام دائرەیە هەر تنها معاملاتی
کوردەوارییە .

دیسان حکومت مفتشیکی معارفی تعیین کرد ، بە
صورت عمومیە مدارس لوای سلیمانی و مدارس کوردیە
لوای هولیر و کرکوکدا تفتیش بکات و حکومت تدابیری
لازمەی اتخاذ کردوە بو احضاری قوەیەکی ضابطان
مسجل پولیس کە اشنای زمانی کوردین بو استخدام
کردنی لە مناطق کوردیدا .

من نامەوی ام بیاناتەم تەواو بکەم بە بی تقدیم
کردنی تشکراتم بو جناب وکیلی فخامتمآب مندوب
سامی کە لەم سفرەدا موافقتی کردین . و امید وایە کە
مشارالیە ایستا بوتان سیاستی حکومتی صاحب جلالة
بریطانیا لەم خصوصەوە بیان اکات . و بە تەواوی
اکاداری حقیقتی حال ابن . و بە قسەی بعضی اشخاص
صاحب غرض کە بصیرتیان لە تقدیر کردنی رفاه
حقیقتی کوردان و رعیتی صاحب جلالة ملك فیصل
معظم و تبعەی دوانی عراق کویر بووە و بە قسەیان
اغفال نەبن .

بم مناسبتەوە جنابی وکیلی فخامتمآب معتمد سامی
بو قسە کردن دعوت اکەم بزانن ایە هەردولا بە
تەواوی لە سەر تعقیب کردنی ام پروغرامە متفقین و
ایستا بوتان بیان اکات .

## بیاناتی فخامتی وکیلی مندوب سامی

کە لە ختامی بیاناتی رئیس الوزرادا

خویندویەتەوە

-((*))-

بنا لە سر طلبی حکومتی عراق لە گەل فخامتمآب
وکیلی رئیس الوزرە هاتوم بو اوەی کە هرچی کسیك
لە موضوعدا شك و شبهەیکی هیە بە تەواوی بوی
آشکار بکەم کە قەت شتیکی وا نیە لە هیچ قطعەیکی
عراقا کە لەبین حکومتی بریطانیا و حکومتی عراق هر
یکە بو خوی تعقیبی سیاستیك بکات . تازە او معاهدە
یك امضا کراوە کە امە ام دو مملکتە بو (٢٥) سالیتر
لە گل یکتری بە تحالفیکی صمیمی ربط دکات . امە بە
تنها ابی کافی بیت بو اوە دلالت بکات کە لە بینی امانە
هیچ مسئلەیکی مهم و ریك نەکراو نەماوە ، ابینم
قسەیکتان پروتستوی حکومتی بریطانیا و عصبة الامم
اکەن بو اوەی کە لە معاهدەی تازە ذکری کوردستان
نەبوە . وکو اوەی کە فخامتی وکیلی رئیس الوزراء
ایضاحیان فرمو ؛ اسبابی اوە عبارت لەوە بو کە هر
دو حکومت هیچ لزومی اوەیان حس نەکرد چونکە
حکومتی عراق قراری داوە کە بو حال حاضر و و
مستقبل تطبیق او سیاستە بکات کە تازە فخامتمآب
بوتان ایضاح کرد .

لوانەی کە تازە فخامتی وکیلی رئیس الوزراء بیان
فرمو بە زەریفی تی دەگەن کە حکومتی عراق بە صفتی
حکومتیکی منورە بە تەواوی اوە تقدیر اکات کە هتا
چە حدیك خوی مجبور ابینی اعتراف بکات کە لە
قسمیکی مهمی عراقدا زمانی کوردی تك هی نەمان
زمانی باوك و دایکە . هیچ شتیکی وها نیە کە بلین

اعلان

شیخ لطیف افندی دانساز کە لە هیئتی صحیەی بغدادەوە ماذون کراوە شهادتنامەی بە دستەوە لەمالی خویدا دانسازی وتداوی دان اکات .

ام ذاتە صنعتکاریکی مقتدری کوردە بو خو ولات لە وستاکانی تر چاکترو هرزانترایش اکات . لەمراجعتا ابدیلی ممنوراین .

لە دائرة طابووە .

اعلان

او نقطە پولیسە کە لە قزلجە واقعە و محاددە (روز اوا و روژ هلات و قبلە و پشتی بە شاخی تسلسل — ٣ و مساحەی ٥٣٧ مترە و ١٢ دسیمترەیە و تسلسل(١)، بە ناوی خزینەی عراقەوە طاپو اکریت لە تاریخ ام اعلانەوە هتا سی — ٣٠ روژیترهر کس حق و ادعایکی هیە بە اوراق و مستمسکات قانونیەوە مراجعت بە دائرەی طاپو بکات ، ئە کینا لە پاش تواو بونی اومدتە قانونیە قیدی طاپو اکریت بو اکاداری سیم جار اعلان کرا .

اعلان

او مخفر پولیسە کە لە کلەزەردە واقعە و محاددە خ ر اوا و خور هلات و قبلە و پشتی بە کرد کە مشهورە بە کون سمائلان و تسلسل — ١ و مساحەی (٨١٩) مترە مربع و (٢٠) دەسیمترە مربعە ، ابر ئەوەی لە زمانی قدیمەوە بدست حکومتەوەیە مجدداً بە ناوی خزینەی عراقەوە طاپو اکریت ، لە تاریخ ام اعلانەوە هتا سی روژیتر بە اوراق و مستمسکات قانونیەوە مراجعت بە دائرەی طاپو بکات ئە کینا لە پاش تەواو بونی ئەم مدتە قانونیە قیدی طاپو ئەکریت بو اکاداری سەهەم جار اعلان کرا .

اعلان

او نقطەی پولیسە کە لە قزلجە واقعە و محاددە [روز هلاتی بە ارضی تسلسل ٥ کە قابلی زرع نیە و لە ژیر ادعای صالح آغا کوری احمد آغادایە روژ آوای بە اراضی تسلسل ٤ کە قابلی زرع نیە و عائدی صالح آغا کوری احمد آغایە قبلەی بەریکای قزلجە کە بو آش اچیت و پشتی بە شاخ] و مساحەی (٤٠٦٤) مترە و (٩٢) دسیمترە و (٧٣) سانتیمترەیە و تسلسلی ٢ وە بە ناوی حکومتی عراقەوە قید اکریت لە تاریخ ام اعلانەوە هتا (٣٠) روژیتر هر کس حق و ادعایکی بە اوراق و مستمسکات قانونیەوە مراجعت بە دائرة طاپو بکات اکینا لە کەل تواو بونی او مدتە قانونیە بە ناوی حکومتەوە قیدی طاپو اکریت .      (٢)

اعلان

عرصەیە کە لە کردکی کویژە واقعە ومحاددە (روژ هلاتی بە خاوی تسلسل ٥٣٨ — ٢٨ — ٥٦ کە عائدی سعید کوری امنە و روژ آوای بە ریکای خاص وقبلة بە ریکای عام و پشتی بە خاوی تسلسل ٥٣٨ — ٢٨ — ٥٦ بیانکراو و تواو کری بە خاوی ٣٦ — ١ تسلسل ٢١ کە عائدی رشید مستی افندیە) و تسلسلی ٩٩٥ و مساحەی [٩٥] مترە و [٥٣] دسیمترە و [٥٠] سانتمترەیە بە ناوی دائرەی بلدیەوە طاپو اکریت هر کس حق و ادعایکی لە سر ام عرصەیە هیە لە تاریخی ام اعلانەوە هتا [٣٠] روژیتر بە اوراق ومستمسکات قانونیەوە مراجعت بە دائرەی طاپو بکات اکینا لە کەل تواو بونی ام مدتە قید اکریت . بو آکاهداری همو کس سیم جار اعلان کرا .

مەتبەعەی بەلەدیەی سلیمانی

# ژیان

بو هەموشتێك
مخابرات بە ناوی
ادارەخانەوە ئەکری

ئیدارەخانە لە پێناو هەدیەدایە

مدیر: سلیمانی زیبان

ئابونە
بەشەش مانگ پێنج
بەسالێك دە روپیە دەدا
بو دەرەوە ئوجرەتی
پوستەی ەپلاوە ئەکری
ئیعلانات
لەدیریکوە هەتاشەش مەقتوعەن
سەروپیەو لەشەش زیاتر جیکە
سەروپیەکە بو دیرە زیادەکانیش
دیری شەش ئانە ئەسینری

یەکی ئانەیەکە هەمو شێتێك ئەوسی هەفتەی دو جار دەردەچی غەزەتەیەکی کوردییە یەکی بە ئانەیەکە

١١ ربیع الآخر ١٣٤٩ ٤ ایلول: ١٩٣٠ [ پینجشەمە ] تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٣٦


## مفارقتی سعادتی توفیق وهبی بگ به تواوی تأثیری کردوتە ملتەکەمانەوە

روپشتنی متصرفی غیورمان سعادتی توفیق وهبی بك بو بغداد و خبری انفصالی له متصرفیتی ایره جداً زور تأثیری کردە اهالیکەمان . بە عمومی کوردەکانی عراق و بە تایبەتی اهالی ام لوایە بە گەورە و بچوك و ژن و پیاوەوە متأثر و بو اعادە کردنەوە حسرت کشن و بو هاتنەوەی لە همو لایکەوە استرحام نامەیان تقدیمی حکومت کردوه .

امیش حقیقتاً حقە چونکە ام لوایە کە لە عراقا لوایەکی مهم و عادتا بە مرکزی کوردستانی جنوبی اناسری مدتیکی زور لە همو ترقیانیك محروم و بی‌بش مایەوە و ام محیطە کە طبیعةً و فطرةً اهالیکەی مایلی علم و عرفان و محبی معارفیان هیە پردەیکی جهل بە سریا راکشاو فقط بە هاتنی سعادتی توفیق وهبی بك کە لە پیکەینتوانی ام وطنەیە و ذاتیکی داهی و متبحرە اهالیکە ان لە تاریکی جهل رزکاری بو و ولاتەکەمان بە چرای معارف روناك کرایەوە و حقیقتا مشار الیە لە پیش همو شتیکا بو انتشاری معارف و بو تأسیس و دامەزرانی مؤسسەی علمیە و بو زیاد کردن و کردنەوەی مکاتب ابتدائی لە تشبث کردن غافل نەبو و بە عزمیکی [illegible]دوە بو ترقی و تعالی وطنەکە هولی دا و غیری اما[illegible] بە واسطەی تطبیق قوانین و نظاماتی حکو[illegible] دە عدالت بە همو معنایەوە لە ناو ام مجتمعەدا تجسمی پی کراو و بم سببەوە لە بینی حکومت و ملتا محبتیکی متقابلە هاتبوە وجود .

بەلی هر چند لەو زمانەدا وکو ایستا بە مناسبتی بستنی معاهدەی تازەوە ملتەکەمان بو طلبی حقوقی مقررە و معترفەیان کەوتبونە مراجعاتەوە فقط ام حرکتە وەنیە هر لە سلیمانیا بونی بلکو لە همو لوا کوردەکانی ترا و لە همو منطقەیکی کوردستان دستی پی کراو . و ام حرکتیش هیچ وقتیك نەبوبو بە سببی تفرقە و نفرتیکی اهالی برامبر بە حکومت اهالی لە کل ام همو مراجعتیشیا زیاتر مربوط و چاکتر مطیعی اوامر و قوانینی حکومت بو .

اگر بەنظریکی رأفت تماشای مراجعات و استرحام نامەی ام اهالیە بکری معلوم ابی کە ام تشبثاتە لەفکریکی خرابەوە نەهاتوتە دری و بە واسطەیەکی غیر معقولەوە پیدا نەبووە ، وەلیە امە اول جاری کە اهالی طلبی حقی خوی اکات ، هتا کو ایستا متعدد دفعە اهالی بو ام حقە صریحەیانی کوشاون و اجاریش اهالی ریەکی مدنیانە و معقولانەی گرتووە و لە عرف و عادات دەرنەچوە و شکر حرکتیکی وا نکراوە کە ببی بە سببی اخلال امنیت و اسایش و لە هموانیکدا سطوتی حکومتی زیاتر موجود و اهالی زیاتر اطاعتی کردوە ایستاش هر بە سبب تدابیری حکیمانەی مأمورینی ادارە و سعادتی متصرف غیور توفیق وهبی بکەوە هاتوتە جی چونکە حقیقتا حکومت لە کل اهالی دا بە لطف و شفقتەوە جولایەوە و اهالیش برامبر بەم لطفە قرا ی دا کە همو مراجعاتەکانی حصر بکاتە سر تشبثات ، سرنووسین و استرحام کردن و غیری امە نەرویشت و قطعیا نایەوی ریەکی تر بگری و غایەیکی خراپ تعقیب بکات .

انجا اگر حکومت بە نظریکی مشفقانە تماشای وضعیت و تدقیق مسائل بکات بە تواوی بوی معلوم ابی کە بقای سطوتی حکومت و موجودبونی امنیت و اسایشی کە لەم لوایە و سرابوطیت و اطاعتی اهالی برامبر بە حکومت صرف بە سبب دهای خارقە و تدابیری حکیمانەی مأمورینی ادارە و خصوصا سعادت توفیق وهبی بکەوە هاتوتە وجود و محافظە کراوە .

انجا اهالی برامبر بم شفقتە امیدی قوی هیە بە حکومت ارا استرحام نامانەی کە بو اعادة سعادت توفیق وهبی بك لە همولایکەوە تقدیم کراوە قبولی افرموی و ب اعادە کردنەوی مشارالیە ملتەکە مسرور اکاتەوە .

او روژە کە سعادتی متصرف اکری توفیق وهبی بك تشریفی بردە بغداد اهالی لە تأثردا چونە تلغرافخانە و ویستیان لە کل فخامتی مندوب سامی و رئیس الوزرادا بە تلەفون گفتگو بکەن . فقط لە بر اوەی فخامتی مندوب سامی لە کوردی نەاکەیشت و فخامتی رئیس الوزرایش لە دائرە موجود نەبو مجبوراً قراریان دا ام تلغرافەی کەلەژیرەوە بە عربی عرض اکری کشیدە و تقدیمی بکەن و نتیجە بم امضایانەوە تقدیم کرا .

لە سلیمانیەوە        ٩٣٠/٨/٢٠

بغداد : فخامة مندوب السامی

» » رئیس الوزراء

بعد سفرکم تأملنا بالمباشرة فی تطبیق القررات الامیة بتبدیل موظفین غیر اکراد لکن خاب املنا بتحویل موظفین الاکراد الی الاماکن البعیدة فی الجنوب و جلب المتصرف الی بغداد هذه الامور استوجب التوحش والهیاج ان طلب الحقوق التی اقرتها العصبة لا یستوجب التحامل قانوناً بالنظر الی وجود الانتداب الفعلی فی العراق . سعینا بکل ما لدینا فی الطلاقة والطاقة فی تسکین الاهالی و الشمال منعا لحدوث امور لا یرضی بها فخامتکم حذرا قوانا لهذا نتجرد عن کل مسئولیة تتولی فی المستقبل راجینا الاهتمام بکف المعاملات التی من شئنها الاستیاء .

| | |
|---|---|
| حمەآغا عبدالرحمن آغا | بابان عزمي بك |
| عزت بك عثمان پاشا | حفیدزادە : شیخ قادر |
| میرزا توفیق قزاز | عبدالرحمن آغا احمد پاشا |
| حمەصالح بك حاجی حمەعلی بك | فایق بك بابان |
| مجیدافندی حاجی رسول آغا | رمزی افندی حاجی فتاح |

وەتەنێکە سعادت متصرف توفیق وەهبی بك مواصلاتی بغدادی کرد و کە غزتەکان نوسیبان انفصالی پێ کراوە لە طرف لایکەوە اهالی، رؤسای عشائر بو استرحام اعادە کردنەوەی مشارالیە ام تلغرافنەیان نوسی و تقدیم کرد و انقسمیکی ام نەکان بەم بزە نشر کرا .

۲٤ — ۸ — ۹۳۰

بغداد فخامت مندوب سامی

صورتی بو فخامتی رئیس الوزرا

تبدیل متصرف مغایری افکارمان و مببی تأثری عموم کوردانە، استرحام اکین زو اعادەی بفرمونەوە .

هورامان هورامان

افراسیاب بك رومتم سلطان ، مصطفی بك جعفر سلطان

هورامان هورامان

محمدامین بك محمود خان دزلی ، شیخ محمد شیخ حسام‌الدین

---

۹۳۰/۸/۲٦

بغداد : فخامة مندوب السامی

« « رئیس‌الوزراء

گورینی متصرف توفیق وهبی بك ابی بە سببی تأثری عمومی کوردان رجا اکین اعادە بفرمونەوە .

رئیس هورامان

جعفر سلطان

---

لە سلیمانیشەوە لە عینی مآل بە اشراف و تجار و اهالی سائرە سە[۳] تلغراف نوسراوە .

لە پشدریشەوە بە امضای جناب عباس اغای محمود اغا و قسمیکی زور لە رؤساکانی تریان سە[۳] تلغراف نوسراوە .

لە بر اوە صورتەکانمان لانەبو نمان توانی عیناً درجیان بکەین .

صورتی تلغرافیکە کە اشرافی سلیمانی نوسیویانە

۹۳۰/۹/۱

بغداد فخامتی مندوب سامی

« « رئیس‌الوزرا

هتاکو ایستا متعدد دفعە مراجعاتمان کرد. کە لسر رغائبی ملی کورد توسط بفرمون لە عصبة الامم‌دا موافق مقرراتی خویان تشکیلی حکومتیکی کوردیان بو بکری و لەم خصوصەوە بە مفصلی معروضاتی خومان تقدیم کردبو هتاکو ایستا جوابیکمان ورنگرتەوە وا اجارەیش ام استرحام نامەیەمان تقدیم کرد رجا اکەین توسطیان بو بفرمون کە آمالیان بیتە جی .

حمە آغا عبدالرحمن آغا بابان عزمی بك

عزت بك عثمان پاشا حفیدزادە : شیخ قادر

میرزا توفیق قزاز عبدالرحمن آغا احمد پاشا

حمە صالح بك حاجی حمە علی بك فایق بك بابان

مجید افندی حاجی رسول آغا رمزی افندی حاجی فتاح

شیخ محمد افندی گلانی

جواب

سلیمانی : عزمی بك بابان و رفقائه

أجاب فخامة وکیل معتمد السامی الی برقیتکم فی حینه . کنت أؤمل ان جوابه کان کافیاً . مع‌هذا ارجوا تماشوا علی الهدوء و السکینة عند ما یأتی الجواب من عصبة الامم .

جعفر العسکری

وکیل رئیس‌الوزراء

---

تکذیب

لە غزتەی ژمارە «۲۵۷» و ۱٤ — ۸ — ۹۳۰ دا لە سر مضبطەیك کە لە ظرفیکا لە موصلەوە بە ناوی ادارە حاتە کە مانە رە هاتبو دائر بە مطالب کورد نشریانیکان کردبو کە امضای چند رؤسایەکی کوردی تیابو و بێ

لەماندە شیخ رقیب رئیس سورچی بو ، دیسانەوە اجارە لە شخصی خویەوە کاغذیکان بو سات کەوری الیە وا بیانی کردبو کە لەو مضبطەیە بی‌خبرە و قطعیا امضای نکردوە لە براوە وا ایمیش بو تکذیبی مضبطە کەی پیشو ام بیانەمان نشر کرد ،

ژیان

اعلان

همو روز غیری روژی جمعە لە ساعات ۸ قبل الظهرەوە هتا ساعات ۱ بعد الظهری اوزنجی لە خستەخانەدا معاینەی نخوشی خارجی اکریت ، ساعات باقیە لە دور داخلیەی ریاستی صحیەدا اشتغال اکریت .

شیخ نوری
رئیس صحیەی لوای سلیمانی

---

اعلان

او خانوە کە لە محلەی سرشقام واقعە و ژمارە ٤٠ـ ۱۲۸ و تسلسل ٥٤٠ شمال‌شرق بە خانوی ۲٤ــ ۸۱ تسلسل ۹۱ معروف عمران و بە خانوی ۸۲ تسلسل ۹۲ سابقا محمد کوری حاجی ... محمد کوری معروف جنوب‌شرق بە خانوی مذکور ۲٦ ـ ۸۲ تسلسل۹۲جنوب‌غربی خانوی تسلسل ٥٥٧ غرب شمالی خانوی ٤٤ــ ۱۲۸ تسلسل ٥٤٢ حسن کوری عزیز للە و بە خانوی مرقم ٤۲ــ ۱۲۸ تسلسل ٥٤٠ سعید کوری سلیم و طریق خاص محدودە بە اعتباری (۳۹۹۳٦۰۰) سهم (۹۰٤٥٤) سهمی عائد بە صغیر احمد (۹۰٤٥٤) سهمی عائد بە صغیر محمود (٤٥۲۲۷) سهم عائد بە صغیرە شمسە کوران و کچی حسن افندی احمد حاجی عزیزە بە یک‌صدوپنجا روپیە لە سر طالبی هر کس طالبە بو زیاد کردنی مراجعت بە محکمەی شرعیە و دلال توفیق اغا بکات .

قاضی سلیمانی

لە دائرە طابووە .

اعلان

عرصەیە کە لە کرەکی ماکەندی واقعە ، محدودە شمال شرق بە خانوی ۳۰ ــ ۳۹ تسلسل ٥۲۹ کە عائدی سعید کوری احمدە شمال غربی و جنوب‌غربی بە طریق خاص و جنوب شرق بە طریق عام و تسلسلی ٦۲۸ و مساحەی ٥۸ مترە مربع و ۸۳ دسیمترە مربع و ۲٥ سانتیمترەیە بەناوی خزینەی حکومت عراقەوە تسجیل اکریت لە تاریخ ام اعلانەوە هتا سی روژیتر هر کس حق و ادعایکی هیە بە اوراق و مستمسکات قانونیەوە مراجعت بە دائرەی طاپو بکات ئەگینا کە تواو بونی امهلتە قانونیە قیدی طاپو اکریت بو اگاداری یەکەم جار اعلان کرا .

— (§) —

اعلان

او نقطەی پولیسە کە لە قزلجە واقعە و محدودە [روژ هلاتی بە ارضی تسلسل ٥ کە قابلی زرع نیە و لە ژیر ادعای صالح آغا کوری احمد آغادایە روژ آوای بە اراضی تسلسل ٤ کە قابلی زرع نیە و عائدی صالح آغا کوری احمدآغایە قبلەی بەریکای قزلجە کە بو آش اچیت و پشتی بە شاخ] و مساحەی (٤٠٦٤) مترە و (۹۲) دسیمترە و (۷۳) سانتیمترەیە و تسلسلی ۳ وە بە ناوی حکومتی عراقەوە قید اکریت لە تاریخی ام اعلانەوە هتا (۳۰) روژیتر هر کس حق و ادعایکی بە اوراق و مستمسکات قانونیەوە مراجعت بە دائرەی طاپو بکات اگینا لە کەل تواو بونی او مدتە قانونیە بە ناوی حکومتەوە قیدی طاپو اکریت . (۳)

---

مەتبەعەی بەلەدیەی سلیمانی

# Zhian

## A Kurdish Newspaper

Number 82-259

Vol. 2

ئەیلول ٥ ژماره ٢٥٩ — ژیان — لاپەرە ١

# ژیان

کرێیار
بەشەش مانگ پێنج
بەسالێك دە روپیە دەدا
بو دەرەوە نوجرەتی
پوستەی مەلاوە ئەکرێ
ئیعلانات

بەڕێوەبەریك

یەکێ بە ئانەیە

١١ ربیع الآخر ١٣٤٩ — ٤ ایلول ١٩٣٠ [ پێنجشەممە ] — تاریخ انتشار ٢١ کانون ثانی ٩٣٦

### مفارقتی سعادتلو توفیق وهبی بك به قولی تأثیری کردووه

روپشتنی متصرف غیورمان سعادتلو توفیق وهبی بك بو بغداد و خبری انفصالی له متصرفیتی ایره جداً زور تأثیری کرده لعالیکمان . به عمومی کوردەکانی عراق و به تایبەتی اهالی ئم لوایه به گەوره و بچوك و ژن و پیاوەوه متأثر و بو اعاده کردنەوەی حسرت کیشن و بو هاتنەوەی له هموو لایکەوه استرحام ئەمیان تقدیمی حکومت کردووه .

لەبەر حقیقتاً حقه چونکه ئم لوایه که له عراقا لوایکی مهم و عیناً به مرکزی کوردستانی جنوبی انگلسری مدتیکی زور له هموو ترقیاتیك محروم و پەیتی مابووه و ئم عیبه که طبیعةً و فطرةً لعالیکی مایلی علم و عرفان و عینی معارفیان هیه بردەیکی جهل به سریا راکشاو فقط به هاتنی سعادتلو توفیق وهبی بك که ... ئم وظیفه و دانیکی دلی و ...

لعالیکمان له دوریکی جهل و رزگاری بو و ولاتەکمان به جوری معارف رووناك کرابووه و حقیقتاً مشار الیه له پیش هموو شتیکا بو انتشاری معارف و بو تأسیس و دامەزراندنی مؤسسەی علمیه و بو زیاد کردن و کردنەوەی مکاتب ابتدائی له تثبیت کردن غافل نەبوو و به [illegible] ووه بو ترقی و تعالی وطنەکە هولی دا و غیری اهالی به واسطەی تطبیق قوانین و نظاماتی حکو[illegible] عدالت به هموو معنایەوه له ناو ئم عشیرەتە تجسس پی کراو و بم سببەوه له بین حکومت و ملتا عشقی متقابله هاتووه وجود .

بلی هر چند لەو زمانەدا وکو ایستا به مناسبتی بستنی معاهدەی تازەوه ملتەکمان بو طلبی حقوقی مقرره و مشروعەیان کەوتبوونه مراجعاتەوه فقط ئم حرکته وەنیه هر له سلیمانیا بی بلکو له هموو لوا کوردەکانی تراو له هموو منطقەیکی کوردستان دستی پی کراو . و ئم حرکتیش هیچ وقتیك نەبووه به سببی تفرقه و شریکی اهالی برامبر به حکومت اهالی له کل ئم هموو مراجعتیانەشیا زیاتر مربوط و چاکتر مطیعی اوامر و قوانینی حکومت بو .

Prepared by: Rafiq Salieh
Researched by: Sadiq Salieh

له بڵاوکراوەکانی هەفتەنامەی سلێمانیی نوێ (١٥)